# ڕۆڵف دۆبیلی




the art of the good life

# هونەری ژیانێکی باش

٥٢ ڕێگای کورتی سەرسامکەر لە بارەی
بەختەوەری، سامان، سەرکەوتنەوە.

لە ئینگلیزییەوە: ئاڤار خالید

# هونەری ژیانێکی باش

٥٢ ڕێگای کورتی سەرسامکەر لە بارەی
بەختەوەری، سامان، سەرکەوتنەوە

ڕۆڵف دۆبیلی
وەرگێڕانی: ئاڤار خالید

هەر لە سەردەمی کۆنەوە- بە دەربڕینێکی تر، لانیکەم ٢٥٠٠ ساڵ، بەڵام لەوانەیە زیاتریش بێت- خەڵکی لە خۆیان پرسیوە کە ژیانێکی باش، ژیان واتای چی، دەبێت چۆن بژیم؟ چ شتێک ژیانێکی باش دروست دەکات؟ ڕۆڵی چارەنووس چییە؟ ڕۆڵی پارە چییە؟ ئایا بەڕێوەبردنی ژیانێکی باش پرسیاری بیروباوەڕە، یان دەستکردنە بە هەڵوێستێکی نوێ، یان سەبارەت بە گەیشتنە بە چەند ئامانجێکی چەسپاو لە ژیاندا؟ ئایا وا باشترە چوست و چالاکانە بە دوای بەختەوەریدا بگەڕێین یان خۆمان لە بەدبەختی بپارێزین؟

هەر نەوەیەک ئەم پرسیارانە بە فۆرمێکی نوێ دەکات، بە جۆرێک لە جۆرەکانیش هەمیشە وەڵامەکان بەشێوەیەکی بنچینەیی نائومێدکەرن. بۆچی؟ چونکە ئێمە بەردەوام بۆ یەک پرەنسیپ، یەک باوەڕ، یەک یاسا دەگەڕێین. کەچی هێشتا ئەم قاپە پیرۆزەی[1] ژیانێکی باش بوونی نییە.

لەم چەند دەیەی دوایدا، شۆڕشێکی بێدەنگ لەناو چەندین

---

١- قاپی پیرۆز: قاپێکە کە کریستیانەکان باوەڕیان وایە پێش مردنی بەکاری هێناوە, ئەمە بوو بە شتێکی پیرۆز کە خەڵکی ویستییان بیدۆزنەوە.

بـواری جیـاوازی فیکری دا ڕوویـداوە. لە زانست و سیاسەت، ئابووری، پزیشکی، چەندین بواری تریش لێکۆڵەرەکان گەیشتوونەتە ئەوەی درک بەوە بکەن ئەم دونیایە لەوە ئاڵۆزترە لە یەک بیرۆکەی گەورەدا یان چنگێک پرەنسیپدا پوخت بکرێتەوە. ئێمە پێویستمان بە سندوقێک کەلوپەلی مێشکییە لەگەڵ چەندین ئامێر بۆ تێگەیشتن لە دونیا، بەڵام هەروەها پێویستیشمان بە سندوقێکە بۆ ژیانێکی کرداری.

لە ماوەی زیاتر لەم دوو سەد ساڵەی ڕابردوودا، دونیایەکمان دروسـت کـردووە کـە چیتر ژیـرانـە لێی تێناگەین. ئـەمـە واتـە قۆنتەرانتچییەکان، وەبەرهێنەکان، بەڕێوبەرەکان، پزیشکەکان، هونەرمەندەکان، زاناکان، خەڵکانی وەک من و تۆش ئەگەر پاکەتێکی پشت پێ بەستراوی کەلوپەلی مێشکی و نمونەی باڵامان نەبێت پاڵی پێوە بدەینەوە، ئەوا بێ ئەوەی بتوانین خۆمانی لێببوێرین لە ژیاندا پێمان هەڵدەکەوێتە سەر ڕێگای خۆمان.

تۆش ڕەنگە بەم کۆمەڵە میتۆد و هەڵوێستە بڵێیت" سیستەمی بەکارخەری ژیـان."بـەڵام من هـەر مێتافۆری سندوقی کەلوپەلە کۆنەکەم لا پەسەندە. هەر کامێکیان بێت، خاڵی سەرەکی ئەوەیە ئەم کەلوپەلانە لە زانیاری ژمارەی گرنگترن. زۆر گرنگترن لە پارە، گرنگترن لە پەیوەندییەکان و گرنگترن لە زیرەکی.

چەند ساڵێکی کـەم لـەمـەو پێش، دەسـتـم بـە کۆکردنـەوەی کەلوپەلە مێشکییەکانی خۆم کرد کە وا نەخشەسازییان بۆ کرابوو تا ژیانێکی باش بونیاد بنێت. لە کاتی سەرقاڵبوون پێیەوە، ئەو

سامانەم بەکار دەهێنا کە کەلوپەلە نیوە لەبیرچووەکانی سەردەمی کۆن و هەروەها نوێترین لێکۆڵینەوە دەروونییەکان. دەتوانیت ئەم کتێبە وەک فەلسەفەیەکی کلاسیکی ژیان بۆ سەدەی بیست و یەکەم دابنێیت.

بۆ چەندین ساڵ ئەم کەلوپەلانەم لە ژیانی ڕۆژانەمدا بەکارهێناوە و یارمەتیان داوم لە چەندین سەختی بچووک و گەورە ڕزگارم ببێت. چونکە ژیانم لانیکەم لە هەموو لایەنێکەوە بەرەو پێش چووە( تەنکبوونی قژم و دێڕە پێکەنینهێنەکانم چیتر دڵتەنگیان نەدەکردم)، دەتوانم پێشنیاری ئەوانەتان بۆ بکەم بە خودئاگاییەکی ڕوونەوە: ئەم پەنجا و دوو کەلوپەلە ڕۆشنبیریانە لەوانەیە گرەنتی -ژیانێکی باش-ت، نەکات بەڵام دەرفەتی ئەوەتان پێدەبەخشێت بجەنگن.

## ١
## هەژمارکردنی مێشکی

### چۆن دۆڕاندن بکەین بە بردنەوە؟

دەبوو بمزانیایە، ماوەیەکی کورت پێش ئەوەی بگەمە ڕێگای دەروازەی دەرەوەی شاری بێرن، کامێرایەکی ڕەساسی خێرا هەیە دانراوە و چاوەڕێی شۆفێرە بێ ئاگاکان دەکات، چەندین ساڵە لەوێیە. گرنگ نییە بیرم لە چی دەکردەوە، فلاشەکە لە بیرکردنەوە قوڵەکەم ڕاپەڕاندم، سەیرکردنێکی خێرای خێرایی پێوەرەکە ترسەکەمی پشت ڕاست کردەوە: لانیکەم دە میل خێراتر دەڕۆیشتم، هیچ ئۆتۆمۆبێلێکی تریشی لێنەبوو لەو مەودایەدا بەو خێراییە بڕوات، هیچ کەسێکی تری لێنەبوو بتوانم لە فلاشەکە بیپارێزم.

بۆ ڕۆژی داهاتوو لە زیوریخ، لە دوورەوە سەیرم کرد ئەفسەرێکی پۆلیس پسوڵەیەکی خستە ژێر فڵچەی ئۆتۆمۆبێلەکەمەوە و نای بە جامەکەوە. بەڵێ، بە نایاسایی ئۆتۆمۆبێلەکەم ڕاگرتبوو.

گورەپانی ڕاگرتنی ئۆتۆمۆبیلەکان پڕ بوو، منیش بەپەلە بووم، دۆزینەوەی شوێنێکی بۆشی یاسایی لە ناوەڕاستی زیوریخ دا وەک ئەوە وایە لە دەشتێکی کاکی بە کاکی دا بۆ دەنکە گەنمیک بگەڕێیت. بۆ تاوێک بیرم لەوە کردەوە ڕابکەم بۆ لای، وێنای خۆم کرد لەبەردەم ئەفسەرەکەدا وەستاوم و هەناسەبڕکێم پێکەوتووە، قژم نارێکوپێکە، هەوڵ دەدەم تێیبگەیەنم لە ناچاریدا وامکردووە، بەلام لێیگەڕام بڕوات: چەندین ساڵە ئەزموون فێری کردووم ئەو شتانە تەنها واتلێدەکات زیاتر هەست بە گەمژەیی بوون بکەیت. بچووک دەردەکەویت، لە کۆتاییش دا بە خەوزڕان دەگەیت.

پسولەی ڕاگرتنەکان بەردەوام توڕەیان دەکردم، ئێستا بە بزەیەکەوە پارەکەیان دەدەم. ئەو بڕە تەنها لەو هەژمارەم دەدەم کە بۆ بەخشین تەرخانم کردووە، هەموو ساڵێک دە هەزار فرەنگ بۆ پرسی باش دەخەمە لاوە، هەموو سزاکانیشم لەوە دەردەکەم. لە دونیای دەروونناسیدا ئەم فێڵە سادەیە بە هەژمارکردنی مێشکی ناسراوە. من ئەمەم لە ڕیچارد تایلەر، یەکێک لە دامەزرێنەرانی مامەڵەی ئابووری وەرگرت. هەژمارکردنی مێشکی وەک بەهەڵەدا چوونی کلاسیکی لۆجیکی سەیر دەکرێت. خەڵکی بە گوێرەی ئەو شوێنەی پارەکەیان لێوە دەستکەوتووە جیاواز مامەڵەی لەگەڵ دا دەکەن، بۆیە ئەگەر پارە لەسەر شەقام بدۆزیتەوە، ئەوا بە ئیسراحەت مامەڵەی لەگەڵ دا دەکەیت و خێراتر و بێبایەخانەتر خەرجی دەکەیت وەک لەو پارەیەی خۆت بەدەستی خۆت پەیدات کردووە. پسولەی ڕاگرتنی ئۆتۆمۆبێلەکە ئەوە دەردەخات کە چۆن

دەتوانیت ئەم هەڵە لۆجیکییە بە سوودی خۆت بگۆڕیت. تۆ بە مەبەست فێڵ لە خۆت دەکەیت- تەنها لەبەر خاتری ئارامی مێشکت.

وایدابنێ کە بە وڵاتێکی زۆر هەژار دا گەشت دەکەیت، جزدانەکەشت دیارنامێنێت، چەند خولەکێکی تر دووبارە دەیدۆزیتەوە، هەموو پارە ونبووەکەش پارە کاشەکەیە. ئایا تۆ ئەمە وەک دزی سەیر دەکەیت یان یان بەخشین بە کەسێک ڕەنگە بارودۆخی زۆر خراپتر بێت وەک لەوەی تۆی تێدایت؟ هیچ ڕاهێنانێکی مێشکی ئەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە پارەکەت دزرا، جگە لە گرنگی ئەوەی ڕوویدا، لێکدانەوەی ڕووداوەکە- دەتوانێت کاریگەریت لێبکات.

ژیانێکی باش، ژیان زیاتر پەیوەندی بە لێکدانەوەی ڕاستییەکانەوەیە بە ڕێگایەکی بونیادنەر، من هەمیشە لە ڕووی مێشکییەوە لە سەدا پەنجا بۆ نرخی دووکان و ڕیستۆرانتەکان زیاد دەکەم. ئەوە ئەو بڕەیە کە ئەم جووتە پێڵاوە یان تاکە میونیەرێک دەبێت لە ڕاستیدا پێی بدەم- داهاتی باجەکەش حساب دەکەم. ئەگەر پەرداخێک شەراب دە دۆلاری بوێت، ئەوا دەبێت من پانزە دۆلار پەیدا بکەم بۆ ئەوەی بیکڕم. بە لای منەوە، ئەوە هەژمارکردنێکی مێشکی باشە، چونکە ئەوە یارمەتیم دەدات بەردەوام خەرجییەکانم بپشکنم.

وا باشترە بەلامەوە پارەی هۆتێلەکان پێشەکی بدەم، بەم ڕێگایە ئەو کۆتایی هەفتە ڕۆمانسییەم لە کۆتاییدا بە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ حسابەکاندا ناشێوێنم. براوەی خەڵاتی نۆبڵ "دانیاڵ کاهنیمان" بەمە دەڵێت یاسای لوتکە-کۆتایی-: بەرزترین خاڵ کۆتا خاڵی ڕۆژانی پشووەکەتت لەبیرە، بەڵام ئەوەی تریت بیرچووەتەوە. لە بەشی بیستەم

دا وردتر لەم بابەتە دەکۆڵینەوە. ئەگەر کۆتایی گەشتەکەت حسابێکی چەور و قورس بێت، لە لایەن کارمەندێکی پێشوازی فەرەنسییەوە بخرێتە بەر دەستت و بە پارەیەکی زیادەی گوماناوی کۆتایی پێبهێنێت کە ڕەنگە بۆ خۆی بەمەبەست زیادی کردبێت- وەک سزایەک بۆ ئەوەی بە شێوەزارێکی کەمتر بە فەرەنسی قسەت نەکردووە- یادگاری ئەو چەند ڕۆژە پشووە ڕۆمانتیکییەت بۆ هەتا هەتایە لا دەشێوێت. لە دەروونناسیدا بەمە دەڵێن -لە ئەستۆگرتنی پێشوەختە-: سەرەتا پارە بدە، دواتر بخۆ و بخۆرەوە. ئەوە جۆرێکە لە هەژمارکردنی مێشکی کە ئازاری پارەدانەکەت لە کۆڵ دەکاتەوە.

من پارەی باجەکانم بە ئارامییەکی یەکسانەوە دەدەم. جگە لەوەش، من بە تەنیا یەک کەس ناتوانم سیستەمی باجدان ئاوەژۆ بکەمەوە. بۆیە ئەو پارەیەی کە دەیدەم بە باج لە شارێکی خۆشی وەک بێرن دا بەراوردی دەکەم بە شارەکانی وەک کوەیت، ڕیاز، ئەو ناوچە بێکەڵک و قەرەباڵغە ڕەق و تەقانەی مۆناکۆ یان سەر ڕووی مانگ- هەموو ئەو شوێنانەی کە باج نادەن. سەرەنجام چی؟ هەڵدەبژێرم کە لە بێرن بمێنمەوە. ئەو کەسانەی بەهۆی باجەوە دەگوازنەوە بۆ شارە ناخۆشەکان وا لە خۆیان دەکەن کەم بایەخ و کەللەڕەق دەربکەون- نەوەک دروست بنچینەیەکی پتەویان هەبێت بۆ ژیانێکی باش. ئەوەی جێی سەرنجڕاکێشانە ئەوەیە کە مامەڵەی من لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا ئەوەیە بەم شێوەیە هەمووی خراپە.

ئەو پارەیەی نەتوانێت خۆشبەختیت بۆ چنگ بخات، ئەوە حەقیقەتێکی بەڵگە نەویستە، کە من بێ دوودڵی ئامۆژگاریت دەکەم،

کاتێک نرخەکان زیاد دەکەن و جیاوازییان تێدا ڕوودەدات تووڕە و نیگەران نەبێت. ئەگەر بیرەیەک دوو دۆلار گرانتر بێت لە کاتی ئاسایی، یان دوو دۆلار هەرزانتر بێت، یان هەرشتێکی تر ببێت ئەوا هیچ کاردانەوەیەکی سۆزدارانە لە مندا دەرناکەوێت. من وزەی خۆم هەڵدەگرم نەک پارەکەم. سەرەڕای هەموو شتێکیش، بەهای سندوقی وزەی من هەموو خولەکێک بە گرنگییەکەوە زیاد دەکات کە لە دوو دۆلار زیاترە، ئینجا ئەگەر دۆن جۆنس بەهۆی لە گۆڕان لە هەزاردا یەک شکست بهێنێت، ئەوە منیش شۆک ناکات. بۆ خۆت تاقی بکەرەوە. وەرە ڕووبەڕووی هەمان ژمارە ببەرەوە، بڕێکی کەم کە تەواو بێباکیت بەرامبەری- ئەو پارەیە زۆر لات گرنگ نییە و وەک خشەخشێکی کەمی تەلەفزیۆن وایە بێزارکردنەکەی. بە بەکارهێنانی ئەم هەڵوێستە هیچ شتێک لە دەست نادەیت، بەتایبەتیش ئارامی دەروونت.

ماوەیەک هەبوو لە دەوروبەری ئەو کاتەی خەریکبوو دەبووم بە چل ساڵ، دوای بەسەربردنی ماوەیەکی زۆر وەک ئاتیستێک[٢]، کاتێک تامەزرۆییانە دەستم کردبوو بە گەڕان بۆ ئەوەی دووبارە خودا بدۆزمەوە، بۆ ماوەی چەندین هەفتە قەشە ڕەبەنەکانی -بێندیکتنەکان-ی، ئینسیدێلنم ناچار کرد وەک میوان لای خۆیان گلم بدەنەوە. تامەزرۆی یادگارییەکی ئەو ماوەیەم، دوور لە دونیای جەنجاڵ و ژاوەژاوی- بێ بوونی هیچ تەلەفزیۆنێک، هیچ ئینتەرنێتێک، بە ئاستەمیش هیچ هێڵێکی تەلەفۆن نەبوو، سوپاس بۆ دیوارە ئەستوورەکانی چاخەکانی ناوەڕاست. لە هەمووی زیاتر چێژم لە بێدەنگی کاتی ژەمەکان وەردەگرت- قەشە

٢- ئاتیست: کەسێکە بڕوای بە بوونی خودا نییە.

ڕەبەنەکان قسەکردنیان لێ قەدەغە بوو. ڕەنگە خودام نەدۆزیبێتەوە، بەڵام بەڕاستی فێری یاسایەکی تری هەژمارکردنی مێشکی بووم، ئەم جارە پەیوەندی بە کاتەوە هەبوو نەک پارە. لە ژووری نانخواردنەکەدا، کە ئەوان پێیان دەگووت ڕاڕەوی نانخواردن، قاپ و قاچاغەکان خرابوونە سندوقێکی ڕەشی بچووکەوە کە هەشت ئینج درێژ بوو. لە سەرەتای ژەمەکەدا، سەری سندوقەکەت هەڵدەدایەوە و گورزە کەوچک و چەقۆ و چەتاڵە جوان پێچراوەکەت دەردەهێنا. پەیامەکە چی بوو؟ لە بنەڕەتدا پێشتر مردوویت، هەموو ئەو شتانەشی بەدوایدا دێت دیارییەکە. هەژمارکردنی مێشکی لە لوتکەی خۆیدا. ئەوە فێری کردم بەهای کاتەکەم بزانم و لە تووڕەبووندا بە هەدەری نەدەم.

ڕقت لە وەستانە لە سەرەی پارەی سۆپەرمارکێتەکاندا، چاوەڕێکردن لای ددانسازێک، دانیشتن لە قەرەباڵغی ترافیکی شارە گەورەکاندا؟ پەستانی خوێنەکەت دەگاتە ١٥٠ لە چرکەیەکدا، بەخێرایش دەست بە دەردانی هۆرمۆنی فشاری دەروونی دەکەیت. بەڵام لە جیاتی بێزاربوون، ئەمانە ڕەچاو بکە: لە جیاتی ئەم شڵەژانە ناپێویستە کە جەستە و ڕۆحت دەخوات، ئەوا ساڵێکی تەواو درێژتر دەژیت. ئەو ساڵە زیادەیە قەرەبووی هەموو ئەو کاتە دەکاتەوە کە لە سەرە وەستاندا بە هەدەری دەدەیت. دەرەنجام؟ تۆ ناتوانیت کاریگەری لەدەستدانی کات و پارە کەم بکەیتەوە، بەڵام دەتوانیت دووبارە لێکدانەوەی بۆ بکەیت. سندوقی یاساکانی هەژمارکردنی مێشکت بکەرەوە و خۆت ببینە: تا زیاتر کار لەسەر هەڵە هەڵەشەییەکانت بکەیت، ئەوا ئەگەری زۆرە کاتی خۆشی زیاترت هەبێت کاتێک بە مەبەست هەڵەیەک دەکەیت. بیرت بێت، ئەمە لەبەر چاکەی خۆتە.

## ٢
## هونەری ڕاستکردنەوە

بۆچی ئێمە زیاد لە پێویست مەزەندەی شتە ڕێکخراوەکان دەکەین؟

لە ناو فڕۆکەیەکدا دانیشتوویت کە لە لەندەنەوە دەچێت بۆ نیویۆرک. پێتوایە چەند لەو کاتە پەیوەستە بەو ڕێگای فڕینەوە کە تێیدایت؟ سەدا نەوەدی کاتەکە؟ سەدا هەشتای کاتەکە؟ سەدا حەفتای کاتەکە؟ وەڵامی ڕاست –هەرگیز–ە. دانیشتن لە تەنیشت جامەوە، تێڕامان لە دەرەوە و لە لێواری باڵەکان، دەتوانیت سەیری ئەو بەشە بچووکە بزواوانەی باڵەکانی بکەیت- ئەوانە بۆ ئەوە هەن کە بەردەوام باری فڕۆکەکە بە درێژایی ڕێگاکە ڕێکبخەن. هەزاران جار لە چرکەیەکدا ئەوتۆ پایلۆت[٣] ئەو بۆشاییە هەژمار دەکەنەوە کە لەنێوان ئەو شوێنەی فڕۆکەکەی لێیە و ئەو شوێنەی دەبێت لێیبێت هەیە و ڕێنمایی ڕاستکەرەوەش دەردەکات.

٣- ئەوتۆ پایلۆت: ئەو ئامێرەیە لە فڕۆکەدا یان لە کەشتی دا بێ ئەوەی پێویستی بە کەسێکی دیاریکراو هەبێت کۆنترۆڵی بکات بەشێکی گرنگ لە کارەکانی فڕۆکەکە بەڕێدەکات.

زۆرجار ئەو چێژ و خۆشییەم بەرکەوتووە فڕۆکەوانی فڕۆکەیەکی بچووک بکەم بێ ئەوەی -ئەوتۆ پایلۆت-یشی، هەبێت لە کاتێکدا ئەمە ئیشی من بووە ئەم ڕێکخستنە زۆر وردانە ئەنجام بدەم. ئەگەر بۆ یەک چرکە گێرەکە بەر بدەم، ئەوا لە ئاراستەکەی خۆم لا دەدەم. هەر لە کاتی لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل دا هەمان هەست دەناسیتەوە: تەنانەت لەسەر ڕێگایەکی ئۆتۆمۆبێلی ڕاست و ڕەوان، ناتوانیت دەست لە سوکانەکە بەر بدەیت بە بێ ئەوەی لە ڕاستە شەقامەکە لابدەیت یان توشی ڕووداوێک ببیت.

ژیانی ئێمە وەک ئۆتۆمۆبێلێک یان فڕۆکەیەک کار دەکات. خۆزگە دەخوازین وا کاریان نەکردایە- ئەوان بە گوێرەی پلانێکی پێشبینیکراو و دەست بۆ نەبراو بەڕێوە دەچن. دواتر ئێمە دەبێت جەخت بخەینە سەر باشترین ئەگەری خاڵی دەستپێک. ئێمە شتەکان زۆر بەباشی لە سەرەتاوە ڕێک دەخەین- خوێندن، پیشە، ژیانی خۆشەویستی، خێزان- وەک چۆنیش پلانی بۆ دانراوە بەو شێوەیە دەگەین بە ئامانجەکانمان. بە دڵنیاییەوە، دڵنیام تۆش دەزانیت، شتەکان بەم شێوەیە ناڕۆن. ژیانمان بە شڵەژانی بەردەوام تەنراوە، زۆربەی کاتەکانمان بە جەنگان بەرامبەر بە ئاڕاستەی با و گۆڕانی پێشبینی نەکراو و لەناکاو گۆڕاوی کەشوهەوا بەسەر دەبەین. کەچی ئێمە هێشتا وەک ئەو شۆفێری فڕۆکانەی ساویلکانە لە کەشوهەوای سامالْدا فڕۆکەوانی دەکەن مامەڵە دەکەین: ئێمە زیاد لە پێویست پێشبینی ڕۆڵی شتە ڕێکخراوەکان دەکەین، بەشێوەیەکی بەرنامەڕێژیش زۆر کەم پێشبینی ڕۆڵی ڕاستکردنەوە دەکەین.

وەک فرۆکەوانێکی خاوەن ئەزموون فێری ئەوەبووم ئەوە سەرەتاکە نییە کە زۆر گرنگە، بەڵکو هونەری ڕاستکردنەوەیە کە لە دوای بەجێهێشتنی زەوییەوە دەستپێدەکات. دوای ملیاران ساڵ زەویش ئەوە دەزانێت. کاتێک خانەکان دابەش دەبن، کۆپیکردنی هەڵەکان بەشێوەیەکی هەمیشەیی دەبن بە ماددەی بۆ ماوەیی، بۆیە لە هەموو خانەیەکدا هەندێک گەردیلە هەن هەڵەکانی پێشتریش ڕاست دەکەنەوە. بێ ئەم پرۆسەی چاککردنەوەی (DNA)یە، وەک ناسراوە، هەر چەند کاتژمێرێک دوای پیتاندنی هێلکە لە زێی دایکماندا بەهۆی شێرپەنجەوە دەمردین. سیستەمی بەرگری جەستەی ئێمەش دوای هەمان یاسا دەکەوێت. هیچ پلانێکی باڵا بوونی نییە، چونکە مەترسییەکان مەحاڵە پێشبینییان بکرێت. ڤایرۆس و بەکتریا مەترسیدارەکان بەردەوام پەرەدەستێنن، سیستەمی بەرگری ئێمەش تەنها لە ڕێگەی ڕاستکردنەوەی هەمیشەییەوە دەتوانێت ڕاستیان بکاتەوە.

بۆیە بۆ جاری داهاتوو ئەگەر گوێت لە هاوسەرگیرییەک بوو کە وا دەردەکەوت تەواو بێ کێشە بێت لەنێوان دوو هاوسەری تەواو گونجاو و لێکوەشاوەدا گلۆڵەیان لە لێژییە، زۆر سەرسام مەبە. ئەمە بارودۆخێکی ڕوونی زیاد لە پێویست ڕێکخستنە. بێ چەند و چون، هەر کەسێک پێنج خولەک زیاتر پەیوەندی بینیبێت دەبێت پێشتر بزانێت بێ دەستکاری بەردەوامی ورد و درشتی بەردەوام و چاککردنەوە، ئەوا بەڕێوە ناچێت. هەموو پەیوەندییەکان دەبێت بە بەردەوامی خۆراکیان پێبدرێت. باوترین هەڵەتێگەیشتن کە

من سەرنجی دەدەم ئەوەیە خەڵکی پێیانوایە ژیانێکی باش بارودۆخ و حاڵەتێکی جێگیرە. ژیانێکی باش تەنها لە ڕێگەی ڕێکخستنەوەی بەردەوامەوە بەدەست دێت.

هەر لەبەر ئەوەشە کە ئێمە زۆر بە گومانین لە بارەی ڕاستکردنەوە و پێداچوونەوە؟ چونکە بچوکترین پارچەی کارکردن لە بارەی چاککردنەوەوە وەک درزێک لە پلانەکەدا دەبینین. وا دەردەکەوێت کە ئێمە بە خۆمان دەڵێین پلانەکەمان کار ناکات. هەست بە شەرمەندەیی دەکەین. وەک ئەوەی شکستخواردووبین. ڕاستییەکەی ئەوەیە پلانەکان هەرگیز تا دواین خاڵ لە ئەلفەوە تا یا □ کار ناکەن، ئەگەر کەسێکیش پلانەکەی بێ هیچ کێشەیەک چووە سەر، ئەوا بەڕێکەوت بووە. هەر وەک ژەنەڕاڵی ئەمریکییەکان- سەرۆک کۆماری دواتر- دوایت ئیسینهاوەر گووتی" پلانەکان هیچ شتێک نین. هەموو شتێکن." گرنگ بوونی پلانێکی دامەزراو نییە، بەڵکو پلانێکە – بەشێوەیەکی بەردەوام- لایەقی چاککردنەوە بێت. ئەو چرکە ساتەی سوپاکەت ڕووبەڕووی دوژمن دەبێتەوە، ئیسنیهاوەر درکی بەوە کرد کە هەر پلانێک هەبێت دەکرێت شکست بهێنێت.

دەستووره سیاسییەکان یاسا بنەڕەتییەکان لەسەر بنەمای هەموو بڕگە یاساییە گۆڕاوەکانی دیکە دادەڕێژن، بەشێوەیەکی تیۆری نابێت کاتی بۆ دیاری بکرێت. تەنانەت هێشتاش هیچ دەستوورێک بێ پێداچوونەوە ناڕوات. دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا – لە بنەڕەتدا لە ساڵی ١٧٨٧ دا، مۆر کرا- لەو کاتەوە

بیست و حەوت جار هەموار کراوەتەوە. دەستوری فیدڕالی وڵاتی سویسرا لە ساڵی ١٨٤٨ ەوە، بە دوو هەمووار کردنەوەی تەواوەتی و چەندین هەموارکردنەوەی لاوەکیدا تێپەڕیوە. دەستوری ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٤٩ ەوە، شەست جار گۆڕدراوە. توانای چاککردنەوە بناغەی هەر دیموکراسییەتێکی کارایە. کارەکە پەیوەندی بە هەڵبژاردنی پیاوێکی دروست یاخود ژنێکی دروستەوە نییە - یان ڕێکخستنێکی دروست- پەیوەندی بە گۆڕینی ژنە خراپەکە یان پیاوە خراپەکەوە هەیە بێ خوێنڕشتن. دیموکراسی بناغەیەکی بۆ میکانیزمی چاککردنەوە هەیە، ئەوەش تاکە شێوازی حکومەتە بەڕێوە دەچێت.

لە هەندێک بواری تردا، بەداخەوە، تەنانەت کەمتریش ویستی ئەوەمان هەیە خۆمان ڕاست بکەینەوە. سیستەمی خوێندنگاکانمان تا ئاستێکی بەرز ئامادە کراون بۆ ڕێکخراوی: جەختکردنەوە لەسەر زانیاری ڕاستییەکان و بڕوانامە وا دەکات ژیان بەشێوەیەک دەربکەوێت لە بنەڕەتدا بەندە لەسەر بەدەستهێنانی باشترین بڕوانامە تا بۆت بکرێت و تا بۆشمان دەکرێت بە باشترین شێوە خۆمان فڕێبدەینە کارەکەمانەوە و دەستپێبکەین. کەچی پەیوەندی نێوان بڕوانامەکان و شوێنکاری سەرکەوتوو بەرە بەرە کزتر دەبێت، ئەمە لە کاتێکدا توانای خۆڕێککردنەوە گرنگی زیاتر پەیدا دەکات- هەرچەندە ئەمە بە دەگمەن لە خوێندنگاکاندا دەگووترێتەوە.

هەمان دیاردە لە گەشەکردنی کەسایەتیماندا بەڕوونی دیارە. دڵنیام لانیکەم کەسێک دەناسیت کە بە تاکێکی دانا و تێگەیشتووی دەزانیت، چۆن بیری لێدەکەیتەوە: ئایا بەهۆی ڕێکخستنەوە بوو- جینەکانی زۆر

باش بوون، یان بەشێوەیەکی نموونەیی گەورە کراوە، یان پەروەردەی پۆلی یەکەمی بوو- کە وای لەم کەسە کرد زۆر دانا بێت؟ یان بەهۆی ڕاستکردنەوە و کارکردنی بەردەوام بوو لەسەر بابەت و کەموکورتی و نەهێشتنی وردە وردەی ئەم ناتەواوییەی ژیانییانەوە بوو؟

سەرەنجام؟ دەبێت ئەم هەست بە کەمی کردنە لە خۆمان بکەینەوە کە بەهۆی خۆ ڕێکخستنەوەوە پێمانەوە نوساوە. ئەو کەسانەی زوو خۆیان ڕێکدەخەنەوە لایەنی ئەرێنیان لەو کەسانە زیاترە کە تەمەنێک بەسەر دەبەن لە ڕێکخستنی بەردەوامی پلانە نایابەکەیاندا و پەنجەیان ڕادەوەشێنن کە پلانەکەیان دەچێتە سەر. هیچ شتێک بە ناوی ڕاهێنانی نمونەییەوە بوونی نییە. لە یەک ئامانج زیاتر لە ژیان دا هەیە. هیچ ستراتیژییەتێکی بێ وێنەی کار، باشترین سندوقی گەوهەری ئامادەکراو، بوونی نییە و هیچ کەسێکیش کارێکی ڕێکی نییە. ئەوانە هەمووی ئەفسانەن. ڕاستییەکەی ئەوەیە تۆ بە یەک پلانی ڕێکخراوەوە دەستپێدەکەیت و دواتر بەردەوام چاکسازی تێدا دەکەیت. تا دونیا ئاڵۆزتر ببێت خاڵی دەستپێکت کەمتر گرنگی دەمێنێت. کەواتە هەموو سەرچاوەکانت لە یەک پلانی ڕێکخراوی- یاخود یەک کار- یان ژیانی کەسێتیت دا بەهەدەر مەدە. لە جیاتی ئەوە کار لەسەر هونەری ڕاستکرنەوە بکە لە ڕێگەی پێداچوونەوە بەو شتانەدا کە بەتەواوی نایەن بە دەستەوە- بەخێرایی و بێهەست کردن بە تاوان. ئەمە لە خۆوە نییە کە من ئەم دێڕانە بە بەرنامەی "Word 14.7.1 Version 1.0" تایپ دەکەم و چەندین ساڵە نەکەوتوونەتە بازاڕەوە.

٣

# نەزر

# توندبوون وەک ستراتیژ

لە ساڵی ١٥١٩ دا، داگیرکاری ئیسپانی هێرنان کۆرتێس لە -کوبا-وە، گەیشتە کەناری مەکسیک. بە کورتی ڕایگەیاند کە مەکسیک داگیرکراوی -ئیسپانیا-یە، خودی خۆشی سەرۆکی ئەو وڵاتەیە. دواتریش کەشتییەکەی وێران کرد، هەموو دەرفەتەکانی گەڕانەوەی بۆ خۆی و پیاوەکانی لەناو برد.

لە تێڕوانینێکی ئابورییانەوە بڕیارەکەی کۆرتێس ئاقڵانی نییە. بۆچی لە هەنگاوی یەکەمەوە ئەگەری گەڕانەوە لە خۆی زەوت دەکات؟ بۆ جێگرەوەکان لە خۆی زەوت دەکات؟ سەرەڕای هەموو شتێک یەکێ لە گرنگترین بنەماکانی ئابووری ئەوەیە کە چەند دەرفەتی زیاترت هەبێت باشترە. کەواتە بۆچی کۆرتێس وازی لە ئازادی هەڵبژاردن هێنا؟

دوو بۆ سێ جار لە ساڵێکدا بەڕێوبەری دامەزراوەیەکی نێودەوڵەتی گەورە لە ئێوارەخوانێکی عادەتی دا کە هەردووکمان

داوەت دەکرێین دەبینم. بۆ چەندین ساڵ سەرنجم دابوو کە پێشژەمەکەی ڕەت دەکاتەوە، تا ئەم دواییانە ئەو مامەڵەیەی ئەوم بە کارێکی نا لۆژیکی و سۆفیئاسا دەزانی. بۆچی ئەو بنەما شیرینەی بووە بە نەریت لە خۆی زەوت دەکات؟ بۆچی لەسەر بنەمای حاڵەت بۆ حاڵەت دا بڕیار نادات؟ بۆچی بڕیارەکانی لەسەر بنەمای ئەوە نین کە کامەی لا گرنگە، یان خواردنە سەرەکییەکەی چەند بۆ دەخورێت، یان پێشژەمەکە چەند بەلەزەت دەردەکەوێت؟ ڕەتکردنەوەی یەک دونیا شیرینی جگە لە گەڕانەوەت ماڵەوە ڕەنگە کەمتر شۆکهێن بێت، بەڵام لە یەکەم نیگادا وا دەردەکەوێت هەردووکیان ناپێویست بن.

یەکێک لە گرنگترین کەسایەتییە خاوەن ئەزمونەکان لە بواری بەڕێوەبردندا –کلەیتۆن کریستنسن-ە، مامۆستا لە زانکۆی هاقارد، بە پرفرۆشترین کتێبی نێونەتەوەییەکەی کە با ناوی –بونبەستی داهێنەر-ە، ناسراوە. قەشەیەکی ماندوونەناس، کریستینسن ژیانی بەگوێرەی نەزرەکان بەڕێوە دەبات – نەزر زاراوەیەکی کۆنە بۆ ئەو بەڵێنانەی ناکرێت بشکێندرێن. ئەگەر وشەی نەزر، زۆر کۆن دەردەکەوێت، ئەوا تۆ پێبڵێ " بەڵێندانی ڕەها." من زاراوە کۆنەکەم پێباشترە، چونکە ئێستا " بەڵێندان" بابەتی خۆهەڵفشاندنە و زۆرجاریش بە نادڵسۆزانە بەکاردەهێندرێت بۆ نموونە- ئێمە بەڵێن دەدەین ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشبخەین." تەنها تاک، نەوەک ڕێکخراوێک، دەتوانێت نەزر بکات.

لە ساڵانی پێشتری تەمەنیدا، کریتنسن چەندین بەڕێوەبەری دەبینی قۆناغی یەکەمی ژیانیان دەکەنە قوربانی پیشەکەیان بۆ

ئەوەی نیوەی دووەمی ژیانیان- ئێستا ئەوان لە ڕووی داراییەوە سەربەخۆن- تەرخان بکەن بۆ خێزانەکانیان، تەنها بۆ ئەوەی بزانن خێزانەکانیان لەبەر یەک هەڵوەشاوەتەوە یان زۆر دەمێکە ڕزگاریان بووە. بۆیە کریستنسن نەزرێکی کرد، بەڵێنی بە خودا دا کە لە کۆتایی هەفتەکاندا کار نەکات، لە ماڵەوە لەگەڵ خێزانەکەیدا لە شەوانی کۆتایی هەفتەدا نان نەخوات. هەندێک جار، بەهۆی ئەمەوە دەبوو کاتژمێر سێی بەیانی بچێت بۆ ئیش.

کاتێک یەکەمجار ئەمەم بیست، هەڵسوکەوتەکەی -کریستنسن-م، بە نالۆژیکی، کەللەڕەقانە، نائابووی زانی. بۆ دەبێت ئەوەندە ڕەق بیت؟ بۆ نابێت لەسەر بنەمای لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر بڕیار بدەیت؟ هەندێکجار ئاسایی دەبێت لە کۆتایی هەفتەکاندا کار بکەیت، بەڵام لە ڕێگەی کارکردنی کەمتر لە دووشەممان و سێشەممان دا قەرەبووی دەکەیتەوە. بەدڵنیاوە ڕەقبوون سەرمایەیە بەتایبەتی لە کاتێکدا کە هەموو شتێک لە گۆڕانێکی خێرادایە.

ئەمرۆ تێڕوانینێکی جیاوازم هەیە. کاتێک دێتە سەر بابەتە گرنگەکان، ڕەقی سوود نییە، بەڵکو داوە. بڕیارەکەی، کۆرتنیس، -کلەیتۆن کریستنسن-یش: ئەوەی لە هەر سێکیاندا هاوبەشە ئەوەیە کە ئەوان ئەم ڕەقییە توندەیان بەکارهێنا بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دوورمـەودا کە ئەگەر ڕەقتربوونایە بەخەیاڵدا نەدەهات. کەواتە چۆن؟ لەبەر دوو هۆکار. یەکەم: بە بەردەوامی بڕیاردانی نوێ بە پێی بارودۆخ لە دوای بارودۆخ هێزی ئیرادەت کەم دەکاتەوە.

بڕیارە شەکەتکەرەکان زاراوەیەکی تەکنیکییە بۆ ئەمە. مێشکێک کە بەهۆی بڕیاردانی بەردەوامەوە ماندوو بووە، هەڵپەی ئاسانترین بژاردە دەکات، کە بەردەوام نمونەییش بوون خراپترینە. هەر لەبەر ئەمەیە کە نەزر زۆر دەچێتە ئەقڵەوە. پێویست ناکات هەموو چرکە و خولەکێکی ژیانت خۆت نیگەران بکەیت کە ڕووبەڕووی بڕیاردانێک دەبیتەوە. چونکە خۆی پێشتر لەوێدا بوونی هەیە، توانا زیهنییەکەت بۆ دەگێڕێتەوە.

دووەم هۆکار کە ڕەقبوون زۆر بەنرخە، سەروکاری لەگەڵ ناوبانگ دا هەیە. بە ڕەقبوون لەسەر هەندێک بابەت، ئەوا واتلێدەکات ئاماژە بەو شوێنە بکەیت کە لێیوەستاویت و پێگەیەکیش بونیاد بنێیت کە هیچ دەرفەتێک بۆ دانوستان نییە. تۆ لە بارەی خودباڵاییەوە دەدوێیت، خۆت والێدەکەیت کەمتر لاوازبیت تا پەلامار بدرێیت. ئەو بەربەستە هاوبەشانەی لە ماوەی جەنگی سارددا دانران بەشێوەیەکی بەربڵاو لەسەر کاریگەری ئەم بنەمایە دانرابوون. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت هەردووکیان دەیانزانی کە پەلاماری چەکی ناوەکی واتا تۆڵەیەکی توند. واتا هیچ دانوستان کردنێک، هیچ شتێک بۆ نیگەران بوون بە ورد و درشتی بارودۆخەکەوە بوونی نییە. بڕیاردان بۆ هەڵکردن یان دژ بە هەڵکردنی گڵۆپی سوور پێشتر دراوە. یەکەم جار دەستپێدانانی هەر وا ئاسان بژاردەیەک نەبوو.

ئەوەی بەسەر نەتەوەکاندا جێبەجێ دەبێت بە هەمان شێوەش بەسەر تۆدا جێبەجێ دەبێت. ئەگەر ژیانێک بە ڕێ بکەیت بە

نەزرەکانت قاندرابێت- جا هەر چۆنێک بن- ئەوا خەڵکی بەرە بەرە لە ئارامیدا بەجێتدەهێڵن. وەبەرهێنی ئەفسانەیی، وارن بەفێت، بەنموونە هەر لە بنەڕەتدا ڕەتیدەکاتەوە دانوستان بکات. ئەگەر دەتەوێت کۆمپانیاکەتی پێبفرۆشیت، ئەوا تەنها یەک دەرفەتت لەبەر دەست دایە. بەدروستی تەنها دەتوانیت یەک پێشنیاری بخەیتە بەردەست. بەفێت یان بە هەمان نرخ کە پێشنیارت کردووە دەیکرێت یان بە هیچ شێوەیەک نایکرێت. ئەگەر نرخەکەی زۆر بەرز بێت، ئەوا هیچ گفتوگۆیەک لە بارەی دابەزاندنی نرخەکەیەوە لە ئارادا نییە. نەخێریش نەخێرە، هەموو کەس ئەوە دەزانێت. بەفێت بەهۆی ڕەقییەتییەکەوە ئەو ناوبەنگەی بەدەست هێناوە کە ئێستا گەرەنتی ئەوەی دەکرێت باشترین ڕێکەوتنی پێشکەش بکرێت هەر لە خاڵی دەستپێکەوە، بێ ئەوەی هیچ کات بە چەندوچونەوە بەسەر ببرێت.

ڕاسپاردەکان، نەزرەکان، یاسا بێ مەرجەکان- ئاسان دەردەکەوێت، بەڵام وانییە. وادابنێ کە تۆ ترێلەیەکی پڕ لە تەقەمەنی لەسەر ڕێگایەکی ڕێک و بێ پێچی یەک ساید لێدەخوڕیت. ترێلەیەکی تر بە ئاراستەی تۆ دێت، ئەویش هەر تەقەمەنی لێبار کراوە. کێ یەکەم جار پێچ دەکاتەوە؟ ئەگەر بتوانیت قەناعەت بە شۆفێرەکەی تر بکەیت کە تۆ ڕاسپاردەیەکی بەهێزترت لە ئەستۆدایە، ئەوا تۆ دەیبەیتەوە. بە دەربڕینێکی تر، شۆفێرەکەی تر یەکەم جار پێچ دەکاتەوە- وایدادەنێت کە ئەو کارێکی لۆژیکانە دەکات-. بۆ نموونە ئەگەر بتوانیت قەناعەت بە شۆفێرەکەی تر بکەیت کە سوکانەکەت قوفڵ بووە و سویچەکەت لە جامەکەوە فڕێ داوەتە دەرەوە ئەوا تۆ

پەیامی ڕاسپاردەیەکی تەواو توندی بۆ دەنێریت. دەبێت نەزرەکانت دەبێت بەو ڕادەیە، بەهێز، توند، باوەڕپێکەر بن بۆ ئەوەی ئاماژەکانت کاریگەر بن.

بۆیە ماڵئاوایی لە ڕێبازی نەرمونیانی بکە. نەرمونیانی دڵتەنگ و ماندووت دەکات، لە ئامانجەکانیشت دادەبڕێت. خۆت زنجیربەند بکە بە نەزرەکانتەوە. بێ ئەملا و سەد لە سەد وابەستە بوون ئاسانترە وەک لەوەی نەوەد و نۆ لە سەد وابەستەیان بیت.

٤

## سندوقی ڕەشی بیرکردنەوە

## واقیع کاری بەسەر هەستەکانی تۆوە نییە، یان بۆچی هەموو هەنگاوێکی هەڵە ژیانت بەرەو پێش دەبات؟

کۆمێت[٤] -١-ی دی هاڤیلاندی بەریتانی یەکەم فڕۆکەی بازرگانی بوو لە دونیادا کە وەک جێتلینەر- واتا مەکینەی جێتی لەسەر بوو- بەرهەمهێنرا. لە ساڵانی ١٩٥٣ و ١٩٥٤ دا توشی چەند ڕووداوێکی نارۆشن بوو، کە مەکینەی فڕۆکەکە لە ئاسماندا لە کاتی فڕیندا دەوەستان. فڕۆکەیەکیان دوای ماوەیەکی کورت ڕێک لە دوای هەڵفڕینی لە فڕۆکەخانەی -کەلکەتا-وە، تێکشکا، دانەیەکی دیکەیان کاتێک بەسەر دوورگەیەکی ئیتاڵیادا بە ناوی - ئەلبا-دا دەفڕی، بوو بە دوو کەرتەوە. چەند هەفتەیەکی کەم دواتر، فڕۆکەیەکی -کۆمێت

---

٤- کۆمێت: یەکەم فڕۆکەی بازرگانی جێت بوو کە لە لایەن ( دامەزراوەی هێزی ئاسمانی دەریایی بەریتانیا)وە, لە ساڵی 1952 دا, بەگەڕ خرا. فڕۆکە -کۆمێت- ەکان دوو هێندەی فڕۆکەکانی پێش خۆیان خێراتر بوون.

١- لە دەرەوەی ناوچەی ناپل کەوتە ناو دەریاوە. لە هەر سێ ڕووداوەکەدا، کەس ڕزگاری نەبوو. ئەفسەری بەرپرسی فڕۆکەکان سزا درا، بەڵام لێکۆڵەرەوەکان نەیانتوانی بڕیار بدەن هۆکاری تێکشکانی فڕۆکەکان چی بوو، بۆیە گەشتە ئاسمانییەکان دووبارە کرانەوە. تەنها دوو هەفتە دواتر، -دووبارە- دروست لە دەرەوەی ناوچەی ناپڵس لە ئاسمانەوە کەوتە خوارەوە- ئەمەش دوا بزمار بوو لە تابووتی - کۆمێت ١-.

سەرەنجام کەلێنەکە ناسێندرا: کەلێنێکی زۆر باریک لە سوچەکانی جامە چوارگۆشەکانی فڕۆکەکەدا هەبوون، ئەمەش بە ناو فڕۆکەکەدا بڵاوببووەوە، ئەمەش سەرەنجام وایکردبوو مەکینەی فڕۆکەکە تێکبشکێت. کۆمێت ١ هۆکاری ئەوەیە کە ئەمڕۆ سەرنشینانی فڕۆکە بە ئاستەم بە تیلە چاوێک لە جامە گۆییەکانەوە سەیری دەرەوە دەکەن. بەڵام ئەنجامێکی گرنگتر هەبوو: دوای کارەساتەکە، لێکۆڵەری ڕووداوەکە- دەیڤد وارن- پێشنیاری کرد کە داتا تۆمارکەرێکی زۆر بەهێز کە بەرگەی بارودۆخی سەخت بگرێت – کە دواتر نازناوی سندوقی ڕەشی پێبەخشرا- لە هەموو فڕۆکەیەکی جێت دا دابنرێت، بیرۆکەیەک بوو دواتر بەشێوەیەکی فەرمی بڕیاری جێبەجێکردنی درا. سندوقێکی ڕەش لە چرکەیەکدا هەزاران پارچەی داتایەک تۆمار دەکات، تەنانەت بەو گفتوگۆیانەشەوە کە فڕۆکەوانەکان لە شوێنی پشوودانیان دەیان کرد، ئەمە وایدەکرد بڕیاردان لە بارەی هۆکاری دروستی تێکشکانی فڕۆکەیەکەوە ئاسانتر بکات.

هیچ پیشەسازییەک وەک فڕۆکەوانی هەڵەکان بە جیددی وەرناگرێت. کاپتن سەلێنبەرگەر لە دوای نیشتنەوە فریاگوزارییە سەرنجڕاکێشەکەی لە نزیک ڕووباری -هەدسن- نووسی" هەموو ئەو شتانەی لە لێخوڕینی فڕۆکەدا دەیانزانین، هەموو ئەو یاسایانەی لە کتێبە یاساییەکادا هەن، هەموو ئەو پرۆسیجەر -ڕێکار-انەی، هەمانن، بەهۆی ئەوەوە دەیانزانین کە چەند کەسێک لە شوێنێکدا مردن." لەگەڵ هەر تێکشکانی فڕۆکەیەکدا، ئەوا گەشتی داهاتووتر سەلامەتتر دەبێت. ئـەم یاسایە- با پێی بڵێین سندوقی ڕەشی بیرکردنەوە- ئەمە ئامرازێکی زیهنی نایابە کە دەتوانرێت لە هەر بوارێکی دیکەی ژیان جێبەجێ بکرێت. زاراوەی سندوقی ڕەشی بیرکردنەوە لە لایەن -ماسیۆ سید-ەوە کە کتێکبێکی تەواوی بۆ ئەو بابەتە تەرخان کرد، داهێنرا.

مرۆڤەکان ڕێک بە پێچەوانەی پیشەسازی فڕینەوەن. بۆ نموونە وایدابنێ کە چەند ساڵێک لەمەو پێش چەند پشکێکت کڕی و نرخی هەر پشکێکیش سەد دۆلار. ئێستا نرخەکانیان زۆر کەم بووەتەوە و بۆ هەر پشکێک دە دۆلارە. ئێستا چی لە مێشکی تۆ دا دەگوزەرێت؟ هیوا دەخوازیت- ڕەنگە دوعاش بکەیت- کە ئەم نرخە چەقبەستووە، چەند زووە دووبـارە بـەرز ببێتەوە. یان جوێن بە بەڕێوبەرانی کۆمپانیاکە دەدەیـت. یان پەنا بۆ بتڵێک شـەراب دەبەیت تا ئەو تورەییەت کە گەیشتۆتە لێوار بەسەریدا خاڵی بکەیتەوە. ژمارەیەکی زۆر کەم لە خەڵکی حەقیقەتەکە قبوڵ دەکەن و تۆمارکەرەکان ناو فڕۆکەکانیان لێکدەدەنەوە. ئەمە بە دروستی پێویستی بە دوو شتە:

یەکەم، قبوڵکردنێکی بەهێز، دووەم، سندوقی ڕەشی بیرکردنەوە. سەرەتا یەکەم دانە، دواتر ئەوەی دیکە.

پارەی بانک قەرزاریت؟ بە داوای لێبووردنەوە بێ گوێدانە هەستەکانت، ئەوە هەر لە شوێنی خۆیەتی. نامەیەکی تووڕە بۆ بەڕێوبەرەکەت دەنێریت؟ هیچ وەڵامدانەوەیەک لە ئارادا نییە، ئینجا گرنگ نییە تۆش چەند پێک شەراب هەڵدەدەیت لە هەوڵدانت دا بۆ پاکانە کردن بۆ ئەو شۆکە کتوپڕەت. نە ئەو شێرپەنجەیەی لە ناو جەستەشتدا گوێ بەوە دەدات کە ئاخۆ بیری لێدەکەیتەوە یاخود پشتگوێی دەخەیت.

پاوڵ دۆلان دەروونناس لە کۆلێژی ئابووری لەندەن سەرنجی ئەوەی داوە کە چۆن ئەو کەسانەی زۆر کۆڵ بە شتەوە هەڵدەگرن وردە وردە سەرنجیان دەگۆڕن بۆ سەر ئەو بابەتانەی ژیانیان کە لە مەودای ژیانیاندا کەمتر پەیوەست و گرنگە- بۆ نموونە پیشەکانیان. بۆچی؟ چونکە ئاسانترە دووبارە سەرنجت ئاراستە بکەیتەوە وەک لەوەی چیتر کۆڵی پێوە هەڵنەگریت. کەچی ئەوانەشی کۆڵ بە شتەوە هەڵدەگرن کەمتر گرنگی بە سەرنجدان و بەرژەوەندی و پاڵنەرەکانی تۆ دەدەن. دونیا هەر دووراو دووریش گرنگی بەوە نادات بۆ چۆن بیر لەو دەکەیتەوە و چ هەستێکت هەیە. ئەو هەموو تاکتیکە دوواکەوتووانە لە مێشکت دوور بخەرەوە.

بیرکار و براوەی خەڵاتی نۆبڵ لە نوسینێکدا دەڵێت" لە ماوەیەکی دوور و درێژ دا هیچ شتێک هێندەماندووکەر و بێزارکەرتر نییە لە هەوڵی ژیانی ڕۆژانەدا بڕوا بە شتێک بهێنیت کە ڕۆژ لە دوای

ڕۆژ جێگەی باوەڕ نییە. تەواوکردنی ئەم هەوڵە بارێکی زۆر گرنگ لە دڵنیایی و بەختەوەری هەرهەری لێدەکەویتەوە." بەدڵنیاییەوە ئەمە زیادەڕەوییە، چونکە دڵنایی و بەختەوەری هەرهەری بوونی نییە. کەچی هێشتا براتند ڕەسێل لە تێڕوانینیدا ڕاست دەکات کە خۆهەڵخەڵەتاندن ناگونجێت لەگەڵ ژیانێکی باش دا. کاتێک ئەوەی دەیبینیت بەدڵتە قبوڵکردن ئاسانە، بەڵام دەبێت کاتێک بە دڵت نییە – بە تایبەتی کە بە دڵت نییە- قبوڵی بکەیت. ڕەسێل بە نموونەیەک بــەردەوام دەبێـت" ئـەو شـانۆنوسـانـەی هـەرگـیز شانۆکانیان سەرکەوتوو نابێت، دەبێت بەهێمنی ئەو گریمانایە لەبەرچاو بگرن کە ئەوان هەمیشە خراپن." ڕەنگە تۆ شانۆ نەنوسیت، بەڵام دڵنیام لە ژیانی خۆتدا توشی چەند نموونەیەک بوویت. لەوانەیە تۆ هیچ بەهرەیەکت لە زمانە بیانییەکاندا نەبێت؟ یان بەڕێوەبەرێکی سروشتی یان وەرزشکار نەبیت؟ ئەوا دەبێت ئەم حەقیقەتانە بە هەند وەربگریت- ئەوا دەبێت ئەنجامەکانیش لەبەرچاو بگریت.

قبوڵکردنێکی توندی شکست، بێتوانایی، لەپڕ کەوتن- ئەمە چۆن بەڕێوە دەچێت؟ ئەگەر ئێمە بۆ ئامێرەکانی خودی خۆمان جێبهێڵرێین، ئەوا ئەوە ئەرکێکی ناخۆشە. زۆرجار خەڵکی زۆر زیاتر بەڕوونی دەبینین، وەک لەوەی خۆمان دەبینین- هەر لەبەر ئەوەشە زۆربەی جار بەهۆی کەسانی دیکەوە نائومێد دەبین، بەڵام بەدەگمەن بەهۆی خۆمـانـەوە نائومێد دەبیـن- کـەواتـە باشترین بـژاردەت ئەوەیە کە هاوڕێیەک یان هاوبەشێک بدۆزیتەوە بتوانیت پشتی پێ ببەستیت کە هەموو کەموکورتییە ڕاستەکانی خۆتت پێبڵێت. تەنانەت

ئەو کاتەش، مێشکت ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدات کە بەرە بەرە ئەو حەقیقەتە هێواش بکاتەوە کە بەدڵی نین. بە تێپەڕبوونی کات، سەرەڕای ئەوەش، ئەوا فێر دەبێت بڕیاری کەسانی دی بە جیددی وەربگریت.

هاوتەریب لەگەڵ ڕەتکردنەوە توندەکەدا، پێویستیشت بە سندوقێکی ڕەشە. سندوقێک بۆ خۆت دروست بکە. هەر کاتێک بڕیارێکی گەورە دەدەیت، ئەوەی لە مێشکت دا دەگوزەرێت بینوسە- بیروبارەوەڕەکانت، زنجیرەبەندی بیرۆکەکانت، دواوتەکانت. ئەگەر بڕیارەکە واکەوتەوە بێبەها بێت، ئەوا سەیرێکی داتا تۆمارکەرەکەی ناو فڕۆکەکەت بکە- پێویست ناکات وا دروستی بکەیت نەشکێت، بەڵکو تەنها دەفتەرێک ئەوکارە تەواو بە باشی دەکات-. بەدروستیش لێکی بدەرەوە کە چی بوو بە هەڵەکەتی گەیاندی. بەو ڕادەیە ئاسانە. لەگەڵ هەر هەڵەیەکی کوشندەی ڕوون و ئاشکرادا، ژیانت باشتر دەبێت. ئەگەر ناتوانیت هەڵەکەت دیاری بکەیت، ئەوا یان لە دونیا تێناگەیت یان لە خۆت تێناگەیت. با بە شێوەیەکی تر دەریببڕین، ئەگەر ناتوانیت ئەو خاڵە دیاری بکەیت کە یەکەمین هەنگاوی هەڵەت نایە سەر، ئەوا دووبارە جارێکی تر تەخت بە دەمدا دەکەویت. کۆڵنەدان لە لێکدانەوەکانتدا سەرەنجام هەر بە سەرکەوتنت دەگەیەنێت.

تێبینی لاوەکی: سندوقی ڕەشی بیرکردنەوە نەک تەنها لەسەر ئاستی ژیانی کەسی کار دەکات، بەڵکو هەروەها لە دونیای بازرگانیش دا. ئەوە دەبێت بۆ هەموو دامەزراوەیەک ستاندارێکی کارپێکراو بێت.

قبوڵکردنی توند و سندوقی ڕەشی بیرکردنەوە بە تەنها بەس نین. دەبێت هەڵەکانت ڕاست بکەیتەوە. لە داهاتووشدا بەو شێوەیە بەردەوامبە. هەر وەک هاوبەشە بازرگانییەکەی وارن بەفێت ـ کە ناوی چارلی مەنگەر-ە، تێبینی کردووە" ئەگەر لە کاتێکدا کە کێشەکە لایەقی چارەسەرکردنە پەلاماری نەدەیت، ئەوا چاوەڕێ بە تا لە دەست دەردەچێت، ئەوا دەتوانیت چەندوچون لەسەر ئەوە بکەیت کە ئەوەندە گەمژەیت شایستەی کێشەکەیت." چاوەڕێ مەبە دەرەنجامەکان خۆیان چارەسەر ببن. نوسەر -ئەلێکس هالی- ئاگاردارمان دەکاتەوە" ئەگەر تۆ دەست و پەنجە لەگەڵ واقیع دا نەرم نەکەیت، ئەوا واقیع دەست و پەنجەت لەگەڵدا نەرم دەکات."

بۆیە واقیع قبوڵ بکە- بەتوندی قبوڵی بکە. بەتایبەتی ئەو بەشە وردانەی بەدڵت نین. ڕەنگە لە کاتی خۆیاندا ئازاربەخش بن، بەڵام هەر دەبێت بکرێن. دوای ئەوە شایستەی دەبێت. ژیان ئاسان نییە. تەنانەت بوونی ژیانێکی باشیش، ئەوا دەبێت دەست و پەنجە لەگەڵ پشکی تەواوی خۆت لە شکست نەرم بکەیت، شتێکی ئاسایشە ئێستا و ناوبەناو هەنگاوێکی هەڵە بنێیت. خاڵە گرنگەکە ئەوەیە هۆکاری ئەوە بدۆزیتەوە کە بۆچی ئەوە ڕوویدا و بابەتەکە لە بنەوە چارەسەر بکەیت. چونکە کێشەکان وەک شەرابی کۆنە ساڵ نین-بەتێپەڕبوونی کات خۆشتامتر نابن.

## ٥
## زیانبەخشی
## بۆچی کاتگێڕەوەکان زۆرجار کات بەفیڕۆدەرن؟

ئۆتۆمۆبێل. ئەمە هیچ جێگەی پرسیار نییە کە بە بەراورد بە پێ ڕۆیشتن، یاخود ئەسپ و گالیسکە، لە ڕووی کارامەیی و چوست و چالاکییەوە گۆڕانکارییەکی بەهێزە.لە جیاتی گەڕان بە چوار میل لە کاتژمێرێکدا و هەڵتەک هەڵتەک سەرکەوتن بەسەر گردێکدا، خلۆربوونەوە بەخێرایی دە میل لە کاتژمێرێکدا لە دۆڵێکی بچووکدا، ئەمڕۆ تۆ دەتوانیت بە ئاسانی لە ڕێگای خێرادا سەد میل لە کاتژمێرێکدا ئۆتۆمۆبێل لێبخوڕیت بێ هەر هیچ هەوڵێکی ئەوتۆ بدەیت. هەرچەندە ناوبەناو گلۆپێکی سوورت بۆ هەڵدەکرێت، لە سەرووی هەموویەوە، بە ڕای تۆ تێکڕای خێرایی ئۆتۆمۆبێلەکەت چەندە؟ پێش ئەوەی لە خوێندنەوە بەردەوام بیت، خەملاندنەکەی خۆت لە لێواری ئەم لاپەڕەیەدا بنوسە.

چۆن ئەم حسابەت کرد؟ بە مەزەندەی خۆت ڕەنگە تێکڕای ئەو میلانەی لە ساڵێکدا ئۆتۆمۆبێلەکەت لێخوڕیوە دابەشت کردبێت

بەسەر نزیکەیی ژمارەی ئەو کاتژمێرانەی لە ماوەی ساڵێکدا لەسەر ڕێگا و بانەکان بەسەرت بردوون. ئەمە شێوەیەکە، لە لاوە، شاشە ئەلیکترۆنییەکەی ناو ئۆتۆمۆبیلەکەت دەتوانێت بیخاتە بەردەستت. ئامێری ناو ئۆتۆمۆبیلە -ڕۆڤەر-ەکەی، من نزیکەی سێ میلە لە کاتژمێرێکدا. کەچی هێشتاش ئەم حسابکردنە ناڕاستە. چەندین هۆکاری دیکەش هەن کە دەبێت بە هەند وەربگیرێن: أ) ژمارەی ئەو کاتژمێرانەی دەبێت کار بکەیت بۆ ئەوەی ئۆتۆمۆبیلێک بکڕیت. ب) ژمارەی ئەو کاتژمێرانەی دەبێت کار بکەیت بۆ ئەوەی پارەی سەلامەتی، چاککردنەوە، بەنزین، پارەی سەرپێچی ڕاگرتنی یاسای بدەیت. ج) ئەو کاتەی لە سەفەرکردندا بەسەری دەبەیت بۆ ئەوەی کار بۆ خاڵی (أ)و (ب) بکەیت، بۆ نموونە دانیشتن لە کاتی قەرەباڵغی ناو شەقامەکاندا. قەشەی کاسۆلیکی -ئیڤان ئیلیڤ- هەموو ئەم لێکدانەوانەی لە بارەی ئۆتۆمۆبیلەکانەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کۆکردەوە. سەرەنجام؟ ئۆتۆمۆبیلێکی ئەمریکی تێکڕای خێرایی لە ساڵێکدا بە دروستی ۳,۷ میلە لە کاتژمێرێکدا- بە دەربڕینێکی تر هەر بە پێ ڕۆیشتنەکە دەکاتەوە. ئەمەش لە ساڵانی حەفتاکاندا بوو، کاتێک ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەدا چل ڕێژەی دانیشتوانی کەمتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها چەند ڕێگایەکی خێرای هەبوو. ئەمڕۆ تێکڕای خێرایی بەدڵنیاییەوە لە خوار ۳,۷ میل لە کاتژمێرێک دایە.

ئیلیچ بەم کاریگەرییەی دەگووت زیانبەخشی. ئەم زاراوەیە ئاماژە بۆ ئەو ڕاستییە دەکات کە هەرچەندە هەندێک لە بەرهەمە تەکنەلۆجییەکان لە یەکەم تێڕوانینەوە وا دەردەکەون کە کات و

پارەمان بۆ بگێڕنەوە، کاتێک لێکدانەوەی تەواو بۆ هەموو تێچوونەکان دەکەیت، ئەم گێڕانەوەیە دەبێت بە پووشی بەر با. گرنگ نییە تۆ چ ڕێگایەکت لا پەسەندە بۆ گەشتکردن، بەڵام زیانبەخشی بڕیارێکە کە دەتخاتە پاقلەکەوە، تۆش وا باشترە وازی لێبهێنیت.

ئیمەیڵ بە نموونە وەربگرە. لە شوێنێکی دوورەپەرێزدا دیارە، ئەمە نایابە. دەتوانیت لە ماوەی چەند چرکەیەکدا بینوسیت و بینێریت- بەخۆڕاییشە، لەوێدا! بەڵام بەڕووکەش دەکرێت هەڵخەڵەتێنەر بێت. هەموو ئیمەیڵ ئەدرەسێک کۆمەڵێک -سپام Spam[٥]- بە لای خۆی دا ڕادەکێشێت، کە دەبێت هەموویان بسڕیتەوە تا چیتر بۆت نەیەن. لەوەش خراپتر، زۆربەی ئەو نامانەی دەچنەسندوقی نامەکانتەوە پەیوەندیدارنین بەتۆوە، بەڵام هێشتا دەبێت بیانخوێنیتەوە بۆ ئەوەی بڕیار بدەیت بۆ ئەوەی بزانیت کە ئاخۆ ئەوان داوای کردنی کارێک لە تۆ دەکەن یان نا. ئەمە بەڕادەیەکی زۆر کات بەفیڕۆدانە. با بێ پێچ و پەنا قسە بکەین، ئەوا پێویستە پشکێک لە تێچوونی کۆمپیوتەر و مۆبایلە زیرەکەکەت و هەروەها ئەو کاتەشی پێویستتە بۆ – update نوێکردنەوەی- بەرنامەکانیان، لەبەر چاو بگریت. خەمڵاندنێکی نزیکەیی بۆ هەر ئیمەیڵێکی پەیوەندیدار بە کارەکانتەوە بە یەک دۆلار دەخەملێنێت- بۆ نموونە هەر بە هەمان شێوەی نامە کۆنەکان.

با سیمینارێک بە نموونە وەربگرین. بابەتێکە بۆ – بەڕێوەبەر و کڕیارەکان پێشکەش دەکرێت- هەمیشە پێکدەهات لە زنجیرەیەک

---

[٥]- Spam: کۆمەڵێک بابەتی ڕیکلامە کە بۆ هەموو بەکارهێنەرێکی ئیمەیڵەکە بیەوێت.

بەلگەی یەک لە دوای یەک. تێبینییە دەستنوسەکان بەس بوون، سەرنجراکێشتربوون، ڕەنگە بە چەند دێڕێکی کەمیش بەس بووایە وەک لە پڕۆجێکتەرێکی بەرز بە ڕاسەری خەلکەکەوە. لە سالی ١٩٩٠ دا بەرنامەی –پاوەر پۆینت PowerPoint- کەوتە بازاڕەکانەوە. هەموو بە یەکجار، ملیۆنان بەڕێوەبەر لەگەڵ هاوکارەکانیان دەستیان کرد بە بەفیرۆدانی چەندین کاتژمێر لە سیمینارەکانیان، زیادکردنی ڕەنگە زەقەکان، فۆنتە سەیرەکان، ئیفێکتە ئەنیمەیشنە پێکەنیناوییەکانیان دا. دەستگەیشتن بە هێلی ئینتەرنێت: هیچە. لە ناکاو، هەموان دەستیان کرد بە بەکارهێنانی بەرنامەی پاوەرپۆینت، بۆیە دواتر هەر زوو کاریگەری خۆی لەدەست دا، بەشێوەیەکی لاسیکی وەک کاریگەری بەدەستهێنانی زۆرترین و باشترین چەک وایە( سەیری بەشی چل و شەشەم بکە). تێچووی شاراوەی زیانبەخشی دەست بەرۆلگێرانی خۆی دەکات، لە ڕێگای بەفیرۆدانی چەندین کاتژمێر بە فێربوونی بەرنامە تەکنەلۆجییەکانەوە، دابەزاندنی بێکۆتایی دواقێرژنی بەرنامەکان، دواتر لە کۆتاییش دا نەخشەسازی کردن و جوانکاری کردن بۆ لاپەڕەکان. بەشێوەیەکی گشتی پاوەر پۆینت وەک بەرنامەیەکی "بەرهەمدار" سەیر دەکرێت. هەرچەندە کە دروستتر وایە پێیبگووترێت بەرنامەیەکی " زیانبەخش".

کاریگەرییە زیانبەخشەکان ڕەنگە زۆر جار ئێمە بێئاگا بین لە بارەیانەوە- بەلام ئەمە هیچ جێگای سەرسامی نییە بۆ زیندەوەرناسەکان. کاریگەرییەکان بۆ ماوەی ملیۆنان سالە لە سروشتدا بە ڕوونی دیارن. نێرەی تاوس- ڕازاوەتەوە، جۆرێک بالی هەیە لە جوانیدا پێشبڕکێ دەکات، کە زۆر درێژ و پەڕەکانیشی زۆر

جوانن- هەر کە ڕووی تەقی بە ڕووی ڕێوییەکدا ئەوا ڕووبەڕووی کاریگەرییەکان ناپێویستی دەبێتەوە. تا پەڕەکانی درێژتر و ناوازەترین ئەوا دەرفەتەکانی لەگەڵ خانماندا باشتر دەبن، دەبێتە نێچیرێکی ئاسنتریش بۆ ئاژەڵە ڕاوچییەکانی دیکە تا نیشانەی لێبگرنەوە. زیاتر لە ملیۆنان ساڵە، باڵانسێک بەرەو پێش چووە لە نێوان سەرنجراکێشی لە ڕووی سێکسییەوە و دوورەپەرێزی- کە ڕزگار بوون دڵنیا دەکاتەوە. هەر سانتیمێک پەڕی زیادە کاریگەری زیانبەخشی هەیە. لە لای لابەلاوە هەمان شتیش بۆ شاخی نێرەی ئاسک و بەهرە دەنگییەکانی خوێندنی باڵندەکان ڕاستە.

بۆیە لە حاڵەتی ئامادەباشیدابە بەرامبەر زیانبەخشی. چونکە ئەوە تەنها لە سەیرکردنی دووەم دا ڕوون دەردەکەوێت. دەبوو ڕابێم کە تەنها یەک لاپتۆپ بەکاربهێنم- هێڵی ئینتەرنێت لە ماڵەکەمدا بوونی نییە- ژمارەی بەرنامەکانی ناو مۆبایلە زیرەکەکەشم بۆ کەمترین ئاست بهێڵمەوە، تەنها بە دەگمەنیش ئەو بەرنامە کۆنانەی بەردەوام کاریان پێدەکەم نوێ بکەمەوە. خۆم لە هەموو تەکنەلۆجیاکانی تر بە دوور دەگرم. نە تەلەفزیۆن، نە ڕادیۆ، نە سەر گەرم کردن بە یارییەوە، نە کاتژمێری زیرەک، هیچ ئامێرێکی تەکنەلۆجی. لەو شوێنەوەی لێیدادەنیشم ئەو ماڵانەی ئامێری زیرەکیان زۆر تێدا بەکاردەهێنرێت بە لای منەوە سیناریۆی فیلمی ترسناکن. پێم باشترە گڵۆپەکانی ماڵەکەم بە دەست هەڵبکەم و بکوژێنمەوە، وەک لەوەی بەرنامەیەک بەکاربهێنم کە ناچار بم دایبەزێنم و پەیوەستی بکەم بە ئینتەرنێتەوە و بەردەوامیش نوێ –Update-ی، بکەمەوە. لەگەڵ ئەوەشا، گڵۆپە کۆنەکەی من ناتوانرێت هاک بکرێت، هۆکارێکی تر کە دەکرێت

زیانبەخشی لاببرێت. بیرتە کاتێک کامێرا دیجیتاڵەکان کەوتنە بازاڕەوە؟ ئازادی! لانیکەم لەو کاتەدا ئەو هەستەمان هەبوو. چیتر پارە بە فیلمە گرانەکانی وێنەگرتن نادەین، چیتر چاوەڕێ ناکەین پێش بکەوێت، چیتر وێنە فۆتۆگرافەرییە ناشرینانە ناگرین- هەر سووک و ئاسان دەتوانین یەک دەرزەن زیاتر وێنە بگریت. ئەمە وەک ئاسانکارییەکی گەورە دەردەکەوت، بەڵام کە دواتر لێیتێدەگەیت ئەمەش بەڕوونی شێوازێکی تری زیانبەخشی ە. ئەمڕۆ ئێمە لەسەر یەک کێو وێنە و ڤیدیۆ دانیشتووین، نەوەد و نۆ لە سەدیان لە پێداویستیت زیاترن، بێ ئەوەی کاتیشت هەبێت چاوێکیان پێدا بخشێنیت، کەچی ناچاریشیت هەموویان لە درایڤێکی پاڵپشتی لە لای خۆت یان لە ناو کۆمپیوتەرێکی دیکەدا کە هەڵبگریت کە لە لایەن دامەزراوەیەکی ئینتەرنێتی گەورەوە دەبینرێت و دەتوانرێت بەکاربهێنرێت. لەسەرو هەمووشیانەوە ئەو کاتەیە ئێستا دەبێت بۆ کارکردن لەسەر ئەو وێنانە و ئەو بەرنامە کۆمپیوتەرییانەی ماوە ماوە داوای تازەکردنەوەت لێدەکات، بەسەر ببەیت، هەروەها کاتێک کۆمپیوتەرێکی نوێ دەکڕیت گواستنەوەی ئەو هەموو فایلە تاقەتپڕوکێنە بە ناچاری هەر دەبێت بیانگوازیتەوە.

سەرەنجام؟ تەکەنەلۆجیا- بەردەوام بانگەشەی پڕ لە بەڵێنی دەکرد- زۆرجار کاریگەرییەکی زیانبەخشی لەسەر چۆنێتی ژیانی ئێمە هەیە. یاسایەکی بنچینەیی ژیانێکی باش بەم شێوەیەیە: ئەگەر بەڕاستی شتێکی پێنەبەخشیت، ئەوا دەتوانیت بە بێ ئەویش هەڵبکەیت. ئەمەش بۆ تەکنەلۆجیا دوو هێندە ڕاستە. بۆ جاری داهاتوو هەوڵبدە لە جیاتی دەستدرێژ کردن بۆ نزیکترین ئامێر، هەوڵبدە مێشکت دابگیرسێنیت.

٦

# هونەری نەرێنی ژیانێکی باش

## هیچ شتێکی هەڵە مەکە، شتە دروستەکە ڕوودەدات

" فڕۆکەوانی پیر هەیە و فڕۆکەوانی ئازاش هەیە، بەڵام هیچ فڕۆکەوانێکی پیر و ئازا نییە." وەک فڕۆکەوانێکی پێگەیشتوو، زۆر جار ئەم قسەیە جوان لە گوێ دەگرم. زۆر حەزم لەوەیە ڕۆژێک ببم بە فڕۆکەوانێکی پیر. بەدڵنیاییەوە ئەمە لە جێگرەوەکەی تر باشترە.

کاتێک بە چنگەخشێ لە ناو فڕۆکە کۆنە یەک مەکینەییەکەمدا- ساڵی ١٩٧٥ بەرهەمهێنراوە- دەچمە شوێنی پشوودانەکەم، هیچ شتێکی سەرنجڕاکێش ناکەمە ئامانج. تەنها هەوڵ دەدەم فڕۆکەکەم تێکنەشکێت. هۆکارە شاراوەکانی تێکشکاندنێک تەواو دامەزراون: فڕین لە کەشوهەوایەکی خراپدا، فڕین بە بێ لیستی پشکنین، کاتێک زۆر ماندوویت فڕۆکەوانی بکەیت، بێ ئەوەی سوتەمەنی تەواو بپارێزیت فڕۆکەوانی بکەیت.

وەبەرهێنان لە بازاڕی کڕین و فرۆشتندا لەوانە نییە هۆکارەکانی ڕزگاربوونت بخەنە مەترسییەوە، بەڵام پارەیەکی زۆر لە وەبەرهێنانەکەدایە. وەبەرهێنەکان زۆرجار باسی "لایەنی باشە" و "لایەنی خراپە"ی، دەکەن. مەبەست لە "لایەنی باشە" مەبەستیان ئەوەیە تێکڕای ئەگەر و دەرەنجامە ئەرێنییەکانی وەبەرهێنانێک - وەک ئەوەی لە سەرو تێکڕای قازانجەوە بێت-، لە کاتێکدا " لایەنی خراپ" بە تەواوی هەموو ئەگەر و دەرەنجامە نەرێنییەکان – وەک مایەپووچ بوون- لە خۆ دەگرێت. ئەم زاراوانە دەکرێت بە سەر فرۆکەوانیش دا جێبەجێ بکرێن. لە پێش و لە کاتی فڕۆکەوانیش دا، دروست بەدیاریکراوی تەرکیز دەکەمە سەر هۆکارە شاراوەکانی لایەنی خراپە و چۆنێتی خۆ لێ لادانی. لە لایەکی ترەوە " لایەنی باشە" سەرنجێکی زۆر کەمم بە لای خۆیدا دەبات. گەورەیی چیا بەفرینەکانی ئالپ، پێکهاتەی جوانی هەورەکان، تامی لەفەکەم لەم بەرزییە سەرسامکەرەدا- ئەوانە هەموویان بۆ خۆیان دێن. ئەگەر ئاگاداری لایەنی خراپە ببم، ئەوا لایەنی باشە خۆی ئاگاداری خۆی دەبێت.

وەبەرهێن چارلس ئێلیس هەمان ڕێباز بۆ یاریزانێکی پێگەیشتووی یاری تێنس پێشنیار دەکات. بە پێچەوانەی –پرۆس- ەوە، کە بەشێوەیەکی ستوونی هەر شوێنێک دیاری بکات بتوانێت تۆپەکەی دروست لەو شوێنە بدات، یاریزانی پێگەیشتوو یەک دونیا هەڵە دەکات. ئەوان تۆپەکە بە تۆڕەکەدا دەکێشن. ئەوان لە ناو گۆڕەپانی یاریکردنەکەدا ئامانجەکەیان زۆر دوور یان

زۆر بەرز دەبێت. تێنسی پرۆفیشناڵ تەواو یارییەکی جیاوازە لە فرەیی پێگەیشتوویی: پرۆس خاڵ دەباتەوە، یاریزانی پێگەیشتوو خاڵ دەدۆڕێنێت. ئەمە واتا ئەگەر بەرامبەر یاریزانێکی پێگەیشتوو یاری دەکەیت، باشترین بژاردەت ئەوەیە کە تەرکیزت لەسەر ئەوە بێت کە هیچ هەڵەیەک نەکەیت. بە پارێزگارییەوە یاری بکە، تا بۆت دەکرێت با تۆپەکە لە ناو گۆڕەپانەکەدا بێت. ئەگەر بەرامبەرەکەت بە مەبەست بە هەمان شێوەی تۆ بە پارێزەوە یاری نەکات، ئەوا یاریزانەکەی بەرامبەرت چ ژن بێت چ پیاو هەڵەی زیاتر دەکات وەک لەوەی تۆ دەیکەیت. لە تێنسی پێگەیشتوو دا یارییەکان نابرێنەوە- دەدۆڕێنرێن.

تەرکیزکردنە سەر لایەنی خراپە وەک لایەنی باشە ئامێرێکی زیهنی بەنرخە. بیرکەرەوە یۆنانی و ڕۆمانی و تەنانەت ئەوانەی چاخەکانی ناوەڕاستیش ناویان لەم تێڕوانینە ناوە: سیۆلۆجی[٦] نەرێنییانە- ڕێگای نەرێنی، ڕێگای ڕەتکردنەوە، بواردن، کەمکردنەوە. بیرۆکەی بنچینەیی ئەوەیە کە تۆ ناتوانیت بڵێیت خودا چییە، بەڵکو تەنها دەتوانیت بڵێیت خودا چی نییە. یان بە زاراوەکەی خۆمان ناکرێت بڵێیت ژیانێکی باش گرەنتی چی دەکات، بەڵکو تەنها دەتوانیت بڵێیت ژیانێکی باش گرەنتی چی ناکات- بەڵام بەدڵنیاییەوە دەتوانیت ئەوە بڵێیت.

بۆ ماوەی ٢٥٠٠ ساڵ، فەیلەسوفەکان، لێکۆڵەرەوە ئایینییەکان، پزیشکەکان، کۆمەڵناسەکان، دەروونناسەکان، لێکۆڵەرەوانی بواری

[٦]- سیۆلۆجی: تێڕوانین و بیروباوەڕی ئایینی.

مێشک، بەڕێوەبەڕی ڕیکلامەکان، هەوڵیان داوە ئەوە بدۆزنەوە کە چ شتێک خەڵکی دڵخۆش دەکات، کەچی جەستەی ئەو زانیارییەی دروستیان کردوە، هێشتا لاوازە. ئەوان بە ئێمە دەڵێن پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان گرنگن. یارمەتیت دەدات کە جۆرێک لە مەبەستت هەبێت لە ژیاندا. وەک مامەڵەیەکی ئەخلاقی ڕەنگە سێکس بیرۆکەیەکی باش بێت. بەڵێ، نایابە. پێموایە، ڕەنگە بمانتوانیایە بۆ خۆمان ئەوەمان چارەسەر بکردایە. دەرئەنجامەکەی ئەوان بە ئاستەم ڕەنگە کەمێک کەمتر بێت. لە ڕووی هۆکارە یارمەتیدەر و بەرجەستەکانی دڵخۆشییەوە- لایەنی باشی بەختەوەری- ئێمە هێشتا لە ناو تاریکیدا دەستەکوتێمانە.

بەڵام کاتێک دەپرسین کە چ هۆکارێک کاریگەرییەکی نەرێنی گرنگی لەسەر ژیانێکی باش هەیە- کام هۆکارانە دڵخۆشی لەناو دەبەن- ئەوا بەدروستی یەک بە یەک دیارییان دەکەین: خواردنەوەی مادده کحولییەکان، ئالودەبوون بە ماددەی هۆشبەرەوە، فشاری دەروونی درێژخایەن، ژاوەژاو، زۆر ڕۆیشتن بە هۆکارەکانی گواستنەوە، ئەو پیشەیەی ڕقت لێیەتی، بێکاری، هاوسەرگیرییەکی ناچالاک، پێشبینیکردنی کردنی باڵا و گەمژانە، هەژاری، قەرز و سەربەخۆ نەبوون لە ڕووی ئابوورییەوە، تەنیایی، بەسەر بردنی کاتێکی زۆر لەگەڵ مینگە مینگە مینیز دا، زیاد پشتبەستن بەوەی کەسانی دیکە دانت پێدا بنێت، هەمیشە خۆبەراوردکردن بە کەسانی دیکە، هەستکردن بە گوناه، بێز لە خۆکردنەوە، نەخەوتن بۆ ماوەیەکی زۆر، خەمۆکی، نیگەرانی، توڕەیی، ئیرەیی. پێویست ناکات

زانست ئەوانەت پێبڵێت. تۆ بۆ خۆت ئەوانە دەزانیت- لە مێشکی خۆتدا، لەناو هاوڕێکانتدا، لەناو کۆمەڵگاکەتدا. لایەنی خراپ هەمیشە بەرجەستەترە وەک لایەنی باش. لایەنی خراپ وەک بەردی گرانیت وایە- ماددەیەکی ڕەقی، دیار و توندە. ئەمە لە کاتێکدا لایەنی باشە وەک هەوا وایە.

بۆیە بەشێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێـژراو ئـەوپـەڕی هـەوڵی خـۆت بـدە لە لایەنە خراپەکان بپارێزیت لە ژیانتدا-ئەوا دەرفەتێکی ڕاستەقینەت دەبێت بۆ ئەوەی ژیانێکی باش بەدەست بهێنیت. بەدڵنیاییەوە، لەوانەیە چارەنوس لە هەر کاتێک دا بێت دەستتێوەردان بکات: ئەستێرەیەکی کشاو خانوەکەت وێران دەکات، جەنگێک بەرپا دەبێت، منداڵەکەت لە ئاودا نوقم دەبێت، کۆمپانیاکەت بەرەو مایەپوچی دەچێت. بەڵام چارەنوس، بە پێناسەکەی، دوورە لە کاریگەری. بۆیە زۆر کۆڵی پێوە هەڵمەگرە.

لەوانەیە پێتوابێت کە یـەک دوو شتم لـەو شتەی سـەرەوە بەجێهێشت: نەخۆشی، خاوەن پێداویستی تایبەتی، جیابوونەوەی هاوسەری. هەرچەندە، چەندین لێکۆڵینەوە ئەوەیان خستۆتە ڕوو کە کاریگەرییەکانی ئەم هۆکارانە لەوە خێراتر کاریگەرییان نامێنێت وەک لەوەی ئێمە بە خەیاڵماندا دێت. لە مانگە سەرەتاکانی دوای برینداربیەکدا، ئەوانەی توشی ئیفلیجی بوون بە تایبەت تەرکیز دەکەنە سەر کەمتواناییان- ئەمەش ڕوونە بۆ تێگەیشتن- بە هەمان شێوەش هەست بە غەمباری دەکەن. کەچی تەنها دوای چەند مانگێکی کەم، باری دەرونیان بەرەو ئاسایی بوونەوە دەچێت. بەشێوەیەکی

ئاسایی، هەموو بابەتە ڕۆژانەییەکان گرنگی خۆیان وەردەگرنەوە لە مێشکیاندا، ئەمە لە کاتێکدا برینە جەستەییەکانیان وردە وردە دەبێت بە شتێکی پاشخانی. هەمان شتیش بۆ جیابوونەوەی هاوسەرگیری ڕاستە. دوای ساڵێک یان دووان لەو ئێش و ئازارە دەروونییە، دەگەیتە لایەکەی تری دۆڵە پڕ لە فرمێسکەکە. بەڵام ئالودەبوون بە ماددەی کحولی، ئالودەبوون بە ماددەی هۆشبەرەوە، فشاری دەروونــی مـاوە درێـژ، ژاوەژاو، گەشتی دوور و درێـژ بەهۆی کارکردنەوە- لەڕاستیدا، هەر یەکێک لە هۆکارەکانی لیستی یەکەم: ئەوانە ئەو شتانە نین خەڵکی فێرببن لەگەڵیان بژین. ئەوانە وا بەئاسانی ئاسایی نابنەوە. ئەوانە هەمیشە ئامادەییان هەیە، ئەوانەش ژیانێکی باش مەحاڵ دەکەن.

ئەو وەبەرهێنانەی بۆ ماوەیەکی درێژ سەرکەوتوو بوون، وەک وارن بەفێت و چارلی مەنگەر، کار بە تەڵەکە و ئامێر و هەڵوێستە مێشکییەکانیان دەکـەن، کە زۆر مایەی بەکارهێنانن بۆ هەموو ڕۆژێکی ژیانی ڕۆژانە. هەنگاوی یەکەم: خۆت لە لایەنی خراپ لابدە. بەفێت و مەنگەر لە وەبەرهێنانەکانیاندا پێش هەموو شتێک و لە هەموو شتێکیش گرنگتر بەر لەوەی بیر لە لایەنی باشە بکەنەوە، ئاگاداری ئەو شتانە دەبن کە دەبێت خۆیانی لێبپارێزن- بۆ نموونە ئەو شتانەی نابێت بیانکەن-. بەفێت ئەوەی نیشانداوە" من و چارلی فێری ئەوە نەبووین کە چۆن کێشە سەختە بازرگانییەکان چارەسەر بکەین. ئـەوەی فێری بووین ئەوەیە کە خۆمانی لێ لابدەین." بۆ کردنی ئـەوە پێویست ناکات زۆر بلیمەت بیت. چارلی مەنگەر

سەرنجی خۆی لەو بارەیەوە نوسیووە" ئەوە شتێکی بەرچاوە کە کەسانی خاوەن سودی ماوەدرێژی وەک ئێمە ئەوەی بەدەستیان هێناوە بەهۆی هەوڵدانی بەردەوامیانەوە بووە بۆ ئەوەی گەمژە نەبن، لە جیاتی ئەوەی هەوڵبدەن زۆر زیرەک بن."

کەواتە لە هەموو ئەم شتانەوە دەبێت چی وەربگرین؟ بەشێکی گەورەی ژیانێکی باش پەیوەندی ڕوونی بە خۆلادان لە گەمژەیی، گێلێتی و لە جیاتی ئەوە ئاراستە گۆڕینە بەرەو هەوڵدان بۆ بەختەوەری بنچینەیی. گرنگ ئەوە نییە کە چی زیاد دەکەیت بۆ ئەوەی ژیانت دەوڵەمەند دەکەیت- گرنگ ئەوەیە چی لادەدەیت. یان هەر وەک جارێکیان مەنگەر بەتەنزێکەوە ( ئەوەی درکاند کە لە ڕووی قسەخۆشیشەوە لە هیچی کەم نییە) گووتی" هەموو ئەوەی دەمەوێت بیزانم ئەوەیە بزانم لە چ شوێنێک دەمرم، بە ئەوەی هەرگیز نەچم بۆ ئەوێ."

٧

## یانسیبی هێلکەیی

## بۆچی سەرکەوتنی خۆتت بەدەست نەهێنا؟

بەختەوەری شتێکە هەتە، بەڵام سەرکەوتن دەبێت بەدەستی بهێنیت- یان ئێمە پێمانوایە دەبێت بەدەستی بهێنیت. سندوقەکەت بهێنە و لە خۆت بپرسە: تا ئێستا ژیانم چەند سەرکەوتوو بووە؟ هێڵێک بکێشە لە ژمارە (٠)ەوە تا ژمارە (+١٠) بەکاربهێنە بۆ (کەسایەتییەکی زۆر سەرکەوتوو)ت، هەروەها لە ژمارە (٠) یشەوە، تا ژمارە (-١٠) بەکاربهێنە بۆ (کەسایەتییەکی تەواو شکستخواردوو). خێرا وەڵامەکانت لە لێواری لاپەڕەکەدا بنوسە. دواتر ئەم پرسیارە یەک لە دوای یەکانە لە خۆت بپرسە: چەندێک لەم سەرکەوتنانە دەکرێت پەیوەست بکرێت بە کارەکان -هەوڵەکان، ماندووبونەکان، دەستێوەردانەکان-تەوە؟ بە دەربڕینێکی تر چەندێک لەم سەرکەوتنانە بەڕاستی هی خۆتن؟ چەندیشیان پەیوەندییان بە بەخت، یاخود ئەو هۆکارانەوە هەیە کە لە دەرەوەی توانای خۆتن؟ ئەم هۆکارانە لای خۆت تەنها بە سەدا دوو بە تێبینی دیاری بکە. بە مەزەندەی من سەدا شەستی سەرکەوتنەکانت وابەستە کرد بە

بەدەستهێنانەکانی خۆتەوە و سەدا چلیشت پەیوەست کرد بە ئەو هۆکارانەی لە دەرەوەی تواناکانتن. لانیکەم ئەمە ئەو وەڵامەیە کە لە زۆربەی خەڵکەوە وەرمگرتووە.

ئێستا دەمەوێت بە خێرایی سەیری ئەو لێکدانەوە بچووکە بکەم کە لە لایەن -وارن بەفێت-ەوە، کراوە" بیهێنە بەر چاوی خۆت دوو دوانەی لێکچوو لە منداڵدانی دایکێک دان، هەردووکیان بەشێوەیەکی یەکسان گەش و پڕ وزەن. فریشتەی پارێزەریش پێیا دەڵێت: یەکێکتان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەدایک دەبێت، یەکێکیشتان لە بەنگلادیش لەدایک دەبێت. ئەگەر خۆشتان لە بەنگلادیش ببیننەوە ئەوا هیچ باجێک نادەن. ئەوا سەدا چەنی داهاتەکەتان بۆ ئەوەتان زیاد دەکات کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەدایک دەبێت؟" بەفێت لێرەدا لە بارەی -یانسیبی هێلکەیی-ەوە، قسە دەکات. تۆ بەدڵنیاییەوە دەتوانیت لە جیاتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەمە بکەیت بە هەر وڵاتێکی تری پێشکەوتوو وەک بەریتانیا، ئەڵمانیا. تۆ چۆن وەڵام دەدەیتەوە؟

زۆربەی ئەو کەسانەی پرسیاریان لێدەکەم ئەم ڕێژەیە دەکەن بە سەدا هەشتا دادەنێن. منیش هەمان شت دەڵێم. بە دەربڕینێکی تر، ئێمە ئامادەکراوین بۆ ئەوەی ڕێژەیەکی زۆر بەرز لە داهاتەکانمان بکەینە قوربانی لەبەر ئەوەی لە وڵاتە دڵخوازەکەماندا دەژین. لەبەر ئەو ڕاستییەی شوێنی لەدایکبوونمان شایستەی ئەو پارەیەیە بۆ ئێمە، ئەمە ڕوونە کە چەند بەشێوەیەکی گەورە ئەوە کاریگەری لەسەر سەرکەوتنمان هەیە.

یانسیبی هێلکەیی-ەکەت، تەنها بە وڵاتی لەدایکبوونت تەواو نابێت. تۆ تەنها لە وڵاتێکی دیاریکراودا لەدایکنەبوویت، بەڵکو وردتر لە ناو کۆمەڵێک تایبەتمەندی تەندروستی و لەناو خێزانێکی دیاریکراویش دا لەدایکبوویت. هیچکام لەمانە لە دەسەڵاتی تۆدا نییە. تۆ کۆمەڵێک بەها، ڕەفتار، یاسات پێبەخشراوە کە لە ژیانی ڕۆژانەت دا یارمەتیت دەدات یاخود دەبێتە بەربەست، ئەمانەش دووبارە لە دەسەڵاتی تۆدا نین. تۆ خراویتەتە ناو سیستەمێکی پەروەردەییەوە کە کۆمەڵێک مامۆستای تێدان خۆت هەڵتنەبژاردوون. بێزاربوویت و بەدەست دارلاستیک و تیرەکانی چارەنوستەوە زۆرت چەشت( یان پشتگوێت خستن)، بەتەواویش بەرپرس نەبوویت لە هیچیان. خزایتە نێو زنجیرەیەک ڕۆڵەوە و چەند بڕیارێکت دا- لەسەر چ بنەمایەک؟ ڕەنگە کتێبێکت خوێندبێتەوە کە ژیانی گۆڕیبێت- بەڵام چۆن هەواڵی ئەو کتێبەت پێگەیشت؟ وایدابنێ کەسێکت بینی دەرگاکانی بۆ کردیتەوە و بەبێ ئەو نەدەگەیشتیتە ئەو شوێنەی ئەمڕۆ لێیت. چیت هەیە بۆ سووپاسکردنی ئەم ناسیاوە؟

تەنانەت ئەگەر پشکی تەواویشت لە بەرنگاربوونەوە هەبووە، ئەوا دەبێت دانی پێدا بنێیت کە بێئەندازە بەبەخت بوویت. شەش لە سەدی هەموو ئەو مرۆڤانەی تا ئێستا لەسەر زەوی ژیاون بەم چرکەساتەدا زیندوون. با بەشێوەیەکی تر بڵێین، شەش لە سەدی هەموو ئەو کەسانەی لە ماوە ئەم سێ سەد هەزار ساڵەی پێشوودا لەدایکبوون- لەو کاتەوەی مرۆڤ زانیاری لە بارەی دانیشتوانی دونیاوە پەیدا کرد- لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆماندا دەژین. ئەوان هەر

سووک و ئاسان دەکرا لە سەردەمێکی تردا بژین، لەڕاستیدا ئەگەری ئەمە سەدا نەوەد و چوارە. بیهێنە بەرچاوی خۆت کە کۆیلەیەکیت لە دەوڵەتی ڕۆمانییەکان دا، یاخود کچە سەماکارێک لە سەردەمی مینگ دیناستی، یان ئاوبەرێک لە میسری کۆندا. لەم جۆرە ژینگانەدا چەند لە بەهرە لەدایکنەبووەکانت بەکاردەهاتن؟

من و خێزانەکەم دووانەیەکمان هەیە، بەڵام لەیەکچوو نین. ئەوەیان کە چل چرکە گەورەترە، چاوێکی شین و قژێکی زەردی هەیە، ئەمە لە کاتێکدا ئەوەی دووەمیان قژێکی ڕەش و چاوێکی ڕەشی هەیە. هەرچەندە ئێمە هەموو هەوڵێکی خۆمانمان دا بۆ ئەوەی هەر دووکیان وەک یەک بەخێوبکەین، بەڵام کەسایەتییان بەشێوەیەکی بنچینەیی جیاوازە. یەکێکیان هەمیشە مەزاجی باشە، گەرم و گوڕ و کرایەوە لەگەڵ خەڵکیدا. دووەمیان تێکەڵبوون و کۆمەڵایەتی بوون قورسە بەلایەوە، بەڵام زۆر بەهرەمەندە لە هەر شتێکدا کە بەکارهێنانی دەستە بچووکەکانی تێدا بێت. هەر لە لەدایکبوونییەوە وابووە. ئەم تێکەڵبوونە بێ پلانەی من و خێزانەکەم دوو مرۆڤی نوێی بەرهەم هێنا. بەهەمان شێوە جینەکانی تۆش تێکەڵبوونی ڕێکەوتی نێوان جینەکانی دایک و باوکتن، کە هی ئەوانیش بە هەمان شێوە تێکەڵبوونێکی ڕێکەوتی نەنک و باپیرتن، بەم شێوەیە بەرەو پاش و بەرەو پێشیش. لە سەردەمی حوکمی لویسی چواردەیەم دا، سەن کینگ، بەنزیکەیی چوار هەزار کەسی زیندوو هەبوون کە هاوبەشییان کردووە لە پێکهێنانی مادده جینییەکانی تێکەڵە هاوچەرخەکەی تۆ. تۆ وەچەی ئەوانیت. ئایا تۆ

تێکەڵی هیچ کام لەم چوار هەزار کەسەت کرد؟ نەخێر. بۆ جاری داهاتوو کە سەردانی -ڤێرسەیلیس-ت، کرد بیر لەوە بکەرەوە.

تۆ هەر چییەک بیت ئەوا قەرزاری جینەکانتیت- هەروەها قەرزاری ئەو ژینگەیەشیت کە نەخشەی جینەکانتی تێدا دروست بوو. تەنانەت ئاستی زیرەکیشت بە ڕێژەیەکی لە ڕێگەی جینەکانتەوە بڕیاری لێوە دەدرێت. جا هەر چۆنێک بیت، کەسێکی گۆشەگیر، یاخود کۆمەڵایەتی، مێشک کراوە، یان نیگەران، باوەڕپێکراو یاخود کەمتەرخەم. ئەگەر بڕوات وایە سەرکەوتنەکانت بەشێوەیەکی توند بەندە بە زۆر خۆ ماندووکردن، کۆڵنەدان و ئەو هەموو کارکردنەی شەفتی شەوانەتەوە هەیە، ئەوا تۆ زۆر هەڵەنیت. تەنها ئەوە هەیە کە لەوەت کەمە بیرکردنەوەکانت کۆنترۆڵ بکەیت لەوەی کە زۆر شانازی بە کارلێکی نێوان جینەکان و ژینگەکەت دەکەیت.

کەواتە، هەموو ئەو شتانەت پێبەخشراوە: چ ڕێژەیەک لە سەرکەوتنەکانت دەدەیتە پاڵ دەستکەوتەکانی خۆت؟ ڕاستە. وەڵامە لۆجیکییەکە سفر لە سەدە. سەرکەوتنی تۆ بەشێوەیەکی بنچینەیی بەندە لەسەر ئەو شتانەی کە هیچ دەسەڵاتێکت نییە بەسەریاندا جا هەر شتێک بێت. لە ڕاستیدا دەستکەوتەکانت "بەدەست" نەهێنا.

دوو ئەنجام. یەکەم: بە خاکەڕایی بمێنەرەوە- بە تایبەتی ئەگەر کەسێکی سەرکەوتوویت. تا سەرکەوتنەکەت زیاتر بێت، دەبێت کەمتر کەشوفش بکەیت و خۆت هەڵبکێشیت. ئەمڕۆ خاکیبوون لە ڕەفتار و مامەڵەکردنمان دا دەرهێنراوە، هیچ شتێکیش نییە بە قەدەر فیز لێدانمان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانمان حەزمان لێبێت. خۆت

لەوە ڕابگرە. لێرەدا باسی خاکیبوونێکی خراپ ناکەم، بەڵکو باسی بابەتە ڕەسەنەکە دەکەم. شتەکە ئەوەیە، وەک خۆت دەزانیت، ئەو کەسانەی بە شان و باڵی خۆیاندا هەڵدەدەن- تەنانەت ئەگەر زۆر بە بێدەنگیش ئەوە بکەن- بەهۆی وەهمێکەوە ڕێگەیان بە خۆیان داوە ئەوە بکەن. شانازیکردن تەنها شتێکی بێسوود نییە، بەڵکوهەر بەڕاستی لە شوێنێکی خراپ دایە. وازهێنان لێی بەردی بناغەی -ژیانێکی باش-ە ( لە بەشی ٥١ دا زیاتر دەخوێنیتەوە لە بارەی ئەم بابەتەوە). ڕۆژانـە بیری خۆتی بهێنەرەوە کە هەرچییەکیت، هەرچییەکت هەیە و هەرچی دەتوانیت بیکەیت، دەرەنجامی هەلێکی کوێرانەیە. بۆ ئەوانەمان کە بەختێکی باشمان پێبڕاوە- بۆنموونە من و تۆش- سوپاسگوزاری تاکە وەڵامی پڕ بەپێستە. کاریگەرییەکی جوانی لاوەکی سوپاسگوزاری ئەوەیە کە کەسانی سوپاسگوزار بەشێوەیەکی دیار کەسانی دڵخۆشترن.

دووەم: بتەوێت و نەتەوێت بەشە خۆبەدەستەوە دەرەکەی سەرکەوتنە (بەدەست نەهاتووەکەت) بە لای ئەو کەسانەی لە خێزانێکی نادروست و جینێکی نادروست و لە ناوچەیەکدا بە تایبەتمەندی تەندروستی نادروستـەوە لەدایکبوون، ئـەوە نەک تەنها شتێکی سەرنجڕاکێش نییە، ئەوە شتێکی ژیرانەیە. بەخشین و باجەکان بابەتی ئابووری نین. پێش هەمووشی، لە هەمووشی گرنگتر ئەوانە بابەتی ئەخلاقین.

## ٨
## وەهمی لێکۆڵینەوەی ورد
## هەستەکان بە جیددی وەربگرە- بەس ئەوانەی خۆت نا.

دروست ئێستا چی دەبینیت؟ ئەو کەلوپەلانە چین لەبەردەمتدان؟ هەوڵبدە چەند دروست بۆت دەکرێت وەسفیان بکە. پێش ئەوەی لە خوێندنەوە بەردەوام بیت، خولەکێک بوەستە.

پرسیارێکی تر: دروست ئێستا هەست بە چی دەکەیت؟ دەتوانیت چ جۆرە هەستێک پێناسە بکەیت؟ هەوڵبدە چەند بە دروستی بۆت دەکرێت وەسفیان بکە. پێش ئەوەی لە خوێندنەوە بەردەوام بیت، خولەکێک بوەستە.

لە حاڵەتی یەکەم دا دڵنیام وەڵامەکانت زۆر ورد بوون. لاپەڕەی کتێبێک دەبینیت، چەند پیتێکی ڕەش لەسەر تەختێکی سپی. ڕەنگە سەریشت هەڵبڕیبێت تا چاوێک بە دەوری ژوورەکەدا بخشێنیت: کەلوپەلەکان، ڕووەکەکانی ناو گۆزەکان، وێنەکانی سەر دیوارەکە. گرنگ نییە چیت بینی، وەسف کردنیان ئاسان بوو.

ئێستا سەیری پرسیارەکانت بکە لە بارەی پرسیاری دواترەوە کە لە بارەی هەستەکانەوە بوو. لەوانەیە کەمێک نارۆشن بن. ڕەنگە ئێستا مەزاجێکی خراپت هەبێت، بەڵام بە دروستی هەست بە چی دەکەیت؟ ئایا تورەیت، نائومێدیت، متەقت لە خۆت بڕیوە، بێتاقەتیت، دڵتەنگیت؟ ئەی ئەگەر وایە، لەبەر چییە؟ ئەگەر مەزاجێکی باشیشت هەیە، دروست ئەوە لە کوێوە هاتووە؟ ڕەنگە بەدیاریکراوی هەستت بە هیچ هەستێکی هەنوکەیی نەکردبێت یان وەک لێمپرسین تەنها هەستێکی ڕووکاری بووە.

ئەگەر لە وەسفکردنی هەستەکانت دا بە بارێکی سەختتدا تێپەڕیت، تورە مەبە. ئەوە پەیوەندی بەوەوە نییە کە تۆ توانای دەربڕینی هەست و بیرۆکەکانت نییە. زمانی ئینگلیزی خاوەنی سێ سەد ئاوەڵناوە بۆ ناساندنی هەستە جیاوازەکان. ئێمە وشەی زیاترمان هەیە بۆ هەستەکان وەک لە ڕەنگەکان- کەچی هێشتا ناتوانین بەڕوونی دەریانببڕین. ئێریک شویتزگێبل مامۆستا لە زانکۆی ستانفۆرد ئەم کەمتواناییەی خستۆتە ڕوو" لێکۆڵینەوەی ورد لەم ئەزمونە ئاگاییە هەنوکەییە، بە تەواو دوور لە ئارامی دەروونی، بەنزیکەیی دوور لە هەموو هەڵەیەک، ئەوە هەڵە و متمانەپێنەکرا و فریودەرە- نەک تەنها لەوانەیە بەهەڵەتدا ببات، بەڵکو بەشێوەیەکی زەوەندە و بەربڵاو. پێموانییە تەنها من بم لێرە لەم تاریکییەدا، بەڵکو زۆربەمانین."

ئەگەر تەواوی دونیا تاکۆتا ناچاریان نەکردینایە تا شوێن دڵمان بکەوین، ئەوا ژیان کردن تەواو ئاسان دەبوو تێیدا.

متمانە بە هەستەکانت بکە! گوێ بۆ دەنگی ناوەوەت بگرە! ئەی ئامۆژگاری من؟ خۆت بێزار مەکە. هەستەکانت مەکە بە قیبلەنمای خۆت. دەنگی ناوەوەت- ئەگەر بەردەوام بین لەسەر بەکارهێنانی میتافیری قیبلەنما- لە یەک دەرزەن دەرزی موگناتیسی پێکدێت، هەموویان ئاماژە بۆ ئاراستەی جیاواز دەکەن و بەردەوام بەدەوری تەوەرەکەی خۆیاندا دەخولێنەوە و دەخولێنەوە. ئایا تۆ لە زەریایەکدا بە قیبلەنمایەکی لەو شێوەیەوە دەست بە گەشتەکەی خۆت دەکەیت؟ بەتەواوی. کەواتە ئەوە بەکارمەهێنە بۆ ئاراستەکردنی ژیانت.

لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی وردەوە -ژیانێکی باش- نادۆزیتەوە. دەروونناسەکان بەمە دەڵێن وەهمی لێکۆڵینەوەی ورد- ئەو بیروباوەڕە بەهەڵە وەرگیراوەیە کە دەتوانین لە ڕێگەی تێڕامانێکی مێشکی وردەوە بزانین بەڕاستی ئارەزووی چی دەکەین. کە دەتوانین مەبەست و مانای ژیانمان بدۆزینەوە، کرۆکێکی ئەوپەڕی بەختەوەری و ئاڵتوونی هەڵبکۆڵین. لە ڕاستیدا شوێنکەوتنی دڵت لە ناوەڕاستی دارستانێک دا- بۆ ئەوەی وەسفێکی باوی شاعیرانە بۆ دیمەنە سروشتییەکەت بەکاربهێنیت- گەرەنتی ئەوەت دەکات کە بێ هیچ هیوایەکی ڕزگار بوون ون ببیت. لە کۆتایی دا دەگەیت بەوەی لە مەزاجە جیاواز و پەرژی بیرکردنەوەکانت و هەستە کورتخایەنەکانت دا گیر بخۆیت.

ئەگەر تا ئێستا چاوپێکەوتنێکت بۆ پیشەیەک کردبێت، ئەوا لەگەڵ کێشەکەدا ئاشنا دەبیت. بۆ ماوەی نیو کاتژمێر قسە لەگەڵ کاندیدەکەدا دەکەیت، دواتر پێشبینیت دەکرێت بڕیارەکەت لەسەر

ئەم بنەمایە ڕابگەیەنیت. لێکۆڵینەوەکان پیشانیان داوە کە ئەم چاوپێکەوتنانە بێسوودن، تۆش واباشترە لێکدانەوە بۆ تۆماری دەنگی کاندیدەکە بکەیت. ئەمە زیاتر لۆژیکی ترە. دوای هەمووی، چی مانادارترە: سی خولەکی کورت گفتوگۆکردن یان سی ساڵ تەواو کاری سەرکەوتن؟ لێکۆڵینەوەی ورد جگە لە چاوپێکەوتنێکی کار لەگەڵ خۆتدا هیچی دیکە نییە- بەڕێژەیەکی باڵا ئەمە متمانەی ناخرێتە سەر. ئەوەی دەبێت بیدۆزیتەوە ڕابردووەکەتە. پەیامە باوەڕپێهێنەرەکانی ژیانت چیین؟ لە بەڵگەکان بکۆڵەرەوە، نەک لێکدانەوەی دواتری خۆت.

بـەڵام کـەوایـە بـۆچی لێکۆڵینەوەی ورد هێندە لاوازە بۆ پشتپێبەستن؟ لەبەر دوو هۆکار. یەکەم، گوێگرتن بۆ دەنگی ناخی خۆت لە هەموو کات قوڵتر، زۆرجار یارمەتیت نادات جینەکانت بۆ نەوەی داهاتوو بگوازرێتەوە. لە تێڕوانینی بیردۆزی پەرەسەندنەوە، زۆر گرنگترە بتوانیت هەستی ئەوانی تر بخوێنیتەوە. کە ئەمە دڵنیاکەرترە، چونکە بەڕووکەش وا دەردەکەوین کە زیاتر بەهرەدار بین لـەوەدا. بـە دەربڕینێکی پراکتیکی- کـردارەکـی- ئەمە بەو مانایە دێت باشترین بژاردەت ئەوەیە کە داوا لە هاوڕێیەکت یان هاوپیشەیەکت بکەیت چی لە ناو سەرتدا دەگوزەرێت. ئەوا ئەو چ کچ بێت یان کوڕ زیاتر بابەتی دەبێت لە حوکمدان دا.

دووەم هۆکار کە لێکۆڵینەوەی ورد هێندە لاوازە لە پشت پێبەستن دا چییە؟ ئـەوەیـە کە خەڵکی هیچ شتێکیان ئەوەندە خۆشناوێت بەڕادەی ئەوەی خۆیان تاکە سەرچاوەی دەسەڵات بن

له گۆڕەپانەکەدا. بڕیار له هەر شتێک دەدەین له قوڵایی ناخمانەوە هەستی پێدەکەین، هیچ کەسێکیشمان له دەور نییە تا مشتومڕمان لەگەڵ بکات. ڕەنگە هەست بکەین ئەوە ئیسراحەتە، بەڵام زۆر یارمەتیدەر نییە، چونکە هیچ میکانیزمێک بۆ ڕاستکردنەوە نییە.

لەبەر ئەوەی هەستەکانمان زۆر جێگەی پشت پێبەستن نین، یاسایەکی باشی ڕێنمایی کردن ئەوەیە کەمتر هەستەکان بە جددی وەربگریت-بەتایبەتی نەرێنییەکان. فەیلەسوفە یۆنانییەکان بەمەیان دەگووت توانای ڕێگرتن لەو شتانەی لە -ئەتاراکسیا-وە، دێن، زاراوەیەکە بە مانای هێمنی و ئارامی دێت، ئارامی مێشک، دانبەخۆداگرتن، هەڵنەچوون، یاخود خوڕاگری. گەورەی ئەتراکسیا سەرەڕای بەرهەڵستییەکانی چارەنوس، هاوسەنگی خۆی لەدەست نادات. ئاستێک بەرزتر پێیدەگووترێت ئەپاسیا، لەڕیشەدەرهێنانی تەواوی هەستەکان، ئەمانە نمونەییەکانن-ئایدیاڵ- گەیشتن بەم ئاستە لە ڕووی کردارییەوە مەحاڵە، بەڵام نیگەران مەبە: من داوت لێناکەم هەوڵی ئەوە بدەیت. هەرچەندە من بەڕاستی بڕوام بەوە هەیە پێویستە گەشە بە پەیوەندییەکی نوێ بدەین لەگەڵ دەنگەکانی ناخی خۆمان دا، دەنگێک دوورە و یەکێک گوماناوییە، یەکێکیش گاڵتەپێکەرە.

بۆ نموونە من بەشێوەیەک مامەڵە لەگەڵ هەستەکانم دا دەکەم وەک ئەوەی ئەوانە هی من نەبن. ئەوان لە شوێنێکی دیکەوە دەگەن، سەرێکم لێدەدەن، دواتر دەگەڕێنەوە. ئەگەر حەزت لێیە بە دەربڕینێکی میتافۆری بۆت ڕوون بکەمەوە، من خۆم وەک بازاڕێکی

گەورەی فێنکی داپۆشراو دەبینم، کە تێیدا هەموو جۆرە باڵندەکان لەم شوێن بۆ ئەو شوێن دەفڕن. هەندێکجار لە ناو بازاڕەکەدا فڕەفڕ لە باڵەکانیان دەهێنن، هەندێک جار کەمێک زیاتر خاوەخاو دەکەن، هەندێک جاریش شتێک دەخەنە خوارەوە. بەڵام، زوو بێت یان درەنگ، هەر دەست بە خۆ کۆکردنەوە دەکەن بۆ ڕۆیشتن. هەندێکیان زیاترم خۆشدەوێن، هەندێکیان کەمتر، بەڵام لەبەر ئەوەی لە مێشکی خۆمدا چوارچێوەی ئەم وێنەیەم کێشاوە، بۆیە چیتر هەستەکانم "خاوەندارێتی"م، ناکەن. تەنانەت هەستیش ناکەم حەزم لەوە بێت ئەوان هی من بن. هەندێک لەم سەردانیکەرانە بەتەواوی زۆر مایەی بەخێرهاتن نین، بەڵام زۆر بێزارم ناکەن-وەک ئەو باڵندانەی لە بازاڕە سەرداپۆشراوەکەدان. پشتگوێیان دەخەم، یان لە دوورەوە سەیریان دەکەم. مێتافۆری باڵندەکانیش هێشتا دەتوانرێت زیاتر سودیان لێوەربگیرێت: ئەگەر هەندێک جۆر لەم باڵندانە بە هەستکانت بچوێنیت، ئەوا تەنانەت دەتوانیت زیاتر بە دەست و پەنجەیەکی نەرمترەوە مامەڵەیان لەگەڵ دا بکەیت. ئیرەیی، لە خەیاڵدانی من دا چۆلەکەیەکی سەوزی بچووکی جیکەجیککەرەوە. نیگەرانی باڵندەیەکە بەردەوام شەقەشەقی باڵی دێت. ئینجا بەو شێوەیە بەردەوام دەبێت- وێنەکەت پێگەیشتووە.

ڕەنگە لە ئەزموونی خۆتەوە ئەمە بناسیتەوە: ئەگەر هەوڵبدەیت تەنها لە ڕێگەی هێزی ئیرادەوە هەستە نەرێنییەکان خەفە بکەیت، ئەوا تەنها بەهێزتریان دەکەیت. بەڵام ئەگەر ڕێگایەکی ئاسوودەتر و ئاسانتر بگریتە بەر بۆ ئەوەی مامەڵەیان لەگەڵ دا بکەیت، لەوانە

نییە دانبەخۆداگرتنێکی ڕەها بەدەست بهێنێت- هیچ کەس ئەمەی بۆ ناکرێت- بەڵام بەدڵنیاییەوە جۆرێک لە ئارامی دەدۆزیتەوە. بەڵام ئەگەر میتافۆری باڵندەکە سەرنجی ڕانەکێشایت، ئەوا وا بیهێنەرە بەر چاوی خۆت کە هەستەکانت منداڵێکی تازە پێگرتوون. چونکە فشارەکان زۆر دوورت ناخاتەوە لێیان، بەڵام ڕێگای خۆشی و گەمەکاری کارێکی سەروسوڕهێنەر دەکات.

با ددان بەوەدا بنێم کە هەندێک لە هەستەکان- بەتایبەتی بەزەیی بە خۆدا هاتنەوە، نیگەرانی، ئیرەیی- هێندە ژەهراوین کە ڕێگای گەمەکاریش بۆ خۆی هیچ فێڵێکیان لێناکات. ئەوان پێویستیان بە ستراتیژییێکی زیادە هەیە کە لە ڕووی مێشکییەوە لێی تێبگەیت کە لە بەشەکانی (٢٤، ٢٩، ٣٢) دا، دەچینە سەریان. هەرچەندە لە بنچینەوە پەیامەکە ئەم ڕاستییە لەخۆ دەگرێت: متمانە بە هەستەکانت مەکە. دەتوانیت زۆر زیاتر بەوردی و دیاری کراوی بزانیت -بیگ ماک[٧]- چی تێدایە، وەک لەوەی لە کاتی خواردنی دا هەست بە چی دەکەیت. کەواتە هەستی کەسانی دیکە زۆر بە جددی وەربگرە، بەڵام هی خۆت نا. لێگەڕێ بەناوتدا بفڕن- هەرچۆنێک بێت هەر کاتێک پێیان خۆش بێت دێن و دەڕۆن.

---

٧-بیگ ماک: جۆرێک هەمبەرگرە کە لە لایەن کۆمپانیای -مادۆنال-ەوە, دروست دەکرێت, لە هەمبەرگری ستاندارد زیاتر گۆشتی تێدایە.

# ٩

# داوی ڕاستگۆیی

## بۆچی پێویستت بە سەرۆکێکی حکومەتە

کەسانی ڕاستگۆت بەدڵە؟ بەدڵنیاییەوە بەدڵتن. لەگەڵ کەسانی ڕاستگۆدا هەمیشە دەزانیت لە کوێ دا بوەستیت. دەزانیت بیر لە چی دەکەنەوە و هەست بە چی دەکەن، چی دەکەن و چی لە خەیاڵیان دایە. ئەم کەسە ڕاستگۆ و ڕاشکاوانە هیچ نهێنییەک دروست ناکەن کە چی لەژێر ڕووپۆشەکەوەیە، هەر لەبەر ئەوەیە تێکەڵبوونی کەسایەتی لەگەڵ ئەواندا زۆر گیانی بە گیانی، ئاسوودە، چوست و چالاکانەیە. هیچ جێگەی پرسیار نییە کە مۆدی ڕاستگۆییە. لە ژیانی ئەمڕۆماندا بە ئاستەم دەتوانیت سیمینارێکی ڕاهێنان تێبپەڕێنیت بێ ئەوەی بەشێک لەو بارەیەوە نەبێت. هیچ کتێبێک لە بارەی سەرکردایەتییەوە تەواو نییە ئەگەر بەشێکی تێدا نەبێت لە بارەی "سەرکردایەتی ڕاستگۆیانە"وە، هیچ نهێنییەکی سەرکەوتن نانوسرێت لەسەر ماڵپەڕێکی ئینتەرنێت بە بێ ئەوەی کورتەیەک هەبێت لە بارەی ئەوەی چۆن دەبیت بە"ڕاشکاو" و، تا بۆت دەکرێت

ڕاستگۆ نەبێت. هەر وەک ئەوەی شتێکی بێویژدانییە وەبەرهێنان لە -پیکاسۆ-یەکی، ساختەدا بکەیت، بەهەمان شێوەش بێویژدانییە کە وەبەرهێنان لەو کەسانەدا بکەیت کە "ڕەسەن" نین، - چ لە ڕووی کاتەوە چ لە ڕووی پارەوە.

بەڵام باسی چ جۆرە ڕاستگۆییەک دەکەین؟ با بەخێرایی بیرێک لە تاقیکردنەوەیەکی زانستی بکەین. وایدابنێ کە دیدەنی ڕاستگۆترین هاوڕێت دەکەیت کە ناوی – لیز- بۆ نانی نیوەڕۆ. واڕێدەکەوێت ئەو بیست خولەک دوا دەکەوێت، قژی دەڵێیت پشیلە چنگی لێداوە. لەژێر لێوەوە داوای لێبووردنێک دەکات، دواتر تەواو بەدەنگی بەرز ئەوە دەردەبڕێت کە سەرتاپای ڕیستۆرانتەکە گوێیان لێی دەبێت بۆ ئەم نانی نیوەڕۆیەی ئەمڕۆ "هەر بەڕاستی جەوی ساف نییە"و بێگومانیش لەو ڕیستۆرانتەدا نییە کە بـەردەوام پڕکەیف بوو." ئەوانەی لەسەر مێزەکانی نزیکتانەوەن چەتاڵەکانیان نزم دەکەنەوە. دوای تاوێک بێدەنگی، لیزا دەست بە وەسف و سەنای ڕووکاری دەرەوەت دەکات، هەرچەندە ئاماژە بەوە دەکات کە کاتژمێرەکەت" بەڕاستی لەگەڵیدا ناگونجێت"لانیکەم بەو شێوەیە نییە کە هەموو شتەکانت پێکەوە گونجاندووە. خۆی بۆ ئەوبەری مێزەکە درێژ دەکات بەخێرایی پڕ دەداتـە ئەو پەرداخە شەرابەی ئێستا داوات کربوو، بە یەک قوم چۆڕبڕی دەکـات و دواتـر دەڵێت" ببوورە، زۆۆۆۆرم تینوبوو!" دوای تەواوکردنی پێشژەمەکەی، دواتر سەری دەدات بەسەر مێزەکەدا و دەخەوێت- تۆش بۆ نیگای پڕ تانە و تەشەری ئەو خەڵکە غەریبەیە بەجێدەهێڵێت. پێنج خولەک دواتر،

کاتێک –سپاگێتی-یەکە، پێشکەش دەکرێت، لەخەو هەڵدەستێت و بە باوێشکێکی ئاژەڵئاساوە خۆی درێژ دەکات، پێدەکەنێت و دەڵێت" دەزانیت من بە بێ ئەم سەرخەو شکاندنەم کە هێزم بۆ دەگێڕێتەوە هەر خۆم نیم؟" داو لە دوای داوی سپاگێتییەکە هەڵدەگرێت، بە پەنجە لە ساسەکەیان هەڵدەکێشێت، ئینجا بەری دەداتەوە بۆ ناو دەمی، دەڵێت کە" بەو شێوەیە زۆر خۆشترە." دواتر لەبەر ئەوەی ئەو" دەبێت بەسانایی هەرچی لە سینەیدایە هەڵیبڕێژێت" هەموو ئەوەی دوێنێ شەو لە خەودا بینیویەتی بۆت دەگێڕێتەوە، هەموو ئەو شتە تەواو بێمانایانە-بەڵام کەچی تۆ پێشتر داوای وەسڵی حسابەکەت کردبوو. خوێنەری ئازیز، ئەوە لەسادەترین جۆری دا، بەنزیکەیی پاڵفتەی ڕاستگۆییە.

فەیلەسوفی بەریتانی سیمۆن بلاکبێرن لە کتێبەکەیدا بە ناوی – ئاوێنە، ئاوێنە-چیرۆکی بە خاکسپاردنی چارلس داروین لە وێست مینیستەر ئابی[8] دەگێڕێتەوە. ویلیام کوڕی گەورە و زیندەوەرزانی نایاب، ( هەروەها نزیکترین کەسیش لە مردووەکەوە)، لە ڕیزی پێشەوە دانیشتبوو، لە ناکاو هەستی بە گوژمێک بای سارد کرد بەر ئەو تەپڵە سەرە کەچەڵەکەی کەوت، بۆیە دەستکێشە ڕەشەکانی داکەند و خستنیە سەر سەرە ڕووتەکەی- هەر لەوێ دا بەجێیهێشتن تا لە ماوەی تەواوی مەراسیمەکەدا هەمووان بیبینن.

ڕەنگە ولیام داروین هێندەی دیدەنیی خەیاڵییەکی نانی نیوەڕۆی

[8] وێست مینیستەر ئابی: کڵێسایەک زۆر گەورەیە لە وێستمینیستەر لە شاری لەندەن، یەکێکە لە بەناوبانگترین باڵەخانەکانی بەریتانیا. زۆربەی کەسایەتییە بەناوبانگەکانی بەریتانیا لەوێ نێژراون.

لیزا خراپ نەبوو بێت، بەڵام وا سەلامەتترە بڵێیت تۆش دەتوانیت ئەوەندە ڕاستگۆییەت تێدا بێت. تا ئاستێکی دیاریکراو پێشبینی مامەڵەی دروست، شێواز و خۆکۆنترۆڵکردن لە کەسە مەدەنییە خراپ نوێنەرایەتی کراوەکان دەکەین. لانیکەم ڕووبەڕوو. ئێمەش لە مێژە لە ڕێگەی ئۆنلاینەوە دابەزیوینەتە ئاستی لیزا. ئەگەر پێش چوونت بۆ سەر جێگای نوستن ناواخنترین هەستت لە ڤیدیۆیەکی ئۆنلاین دا بڵاونەکەیتەوە، ئەوا تۆ بە کەسێکی ڕەسمی و بێ مەبدەئ هەژمار دەکرێیت. هێشتا بەشێوەیەکی بنچینەیی تەنانەت ڕەسەنترینی ئەم نمایشانە لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە دەستکرد و بەرنامە بۆ دارێژراو دانراوە. بەکارهێنەرەکانیش ئەوە دەزانن.

پێشنیاری من چییە؟ باوەڕ بە ڕاستگۆیی ڕیکلامەکان مەکە. لەبەر چەند هۆکارێک. یەکەم: حەقیقەتێکی سادە هەیە کە بەڕاستی نازانین ئێمە کێین. وەک لە بەشی پێشوودا بینیمان، دەنگی ناخمان هەموو شتێکە، قیبلەنمایەک باوەڕپێکراو نەبێت. زیاتر وەک تێکەڵ و پێکەڵەیەکە لە پاڵنەرە سەربەکێشەکان. ئێمە لە خۆمان تێناگەین، کەواتە بە دروستی مامەڵەی "ڕاستگۆیانە" قەرارە چی بدرکێنێت؟ ڕاستگۆیی ڕۆڵێکی هەیە تا لە پەیوەندییە ڕۆمانسییەکاندا یان لە پەیوەندییەکی زۆر نزیک دا بیگێڕێت، لە پەیوەندییە ناسیاوییە ڕێکەوتییەکانیش دا لە هیچ قوژبنێکەوە دیار نییە، بەدڵنیاییشەوە لە شوێنە گشتییەکان دا هەر بە هەمان شێوەیە.

دووەم: وا لە خۆت دەکەیت گەمژانە دەربکەویت. ناوی یەک کەسایەتی دیار بهێنە کە بەڕاستی ڕێزی لێدەگریت- کەسایەتییەکی

سیاسی، ژەنەڕالێک، فەیلەسوفێک، بەڕێوبەری کۆمپانیایەک، زانایەک- کە ناو بە ناو ناواخنترین هەستی خۆی لە دەم دەربچێت. یەک کەس نادۆزیتەوە. خەڵکی بەهۆی ئەوەی بەڵێنەکانیان بەجێدەگەیەنن ڕێزیان لێدەگیرێت، نەک بەهۆی ئەوەی ڕێگەمان بدەن بەدزییەوە گوێ بۆ مۆنۆلۆگەک[٩]انەی، ناو ناخیان بگرین.

سێیەم: خانەکان خشتی بونیادنەری ژیانن. هەموو خانەیەک بە توێژاڵێک داپۆشراوە، بە مەبەستی ئەوەی بەرپەرچی مشەخۆرە نەیارەکان بداتەوە و بەدروستیش بۆ ئەوەی خۆی لەگەڵ ئەو گەردیلانەدا ڕێک بخاتەوە کە ڕێگەیان پێدەدرێت بە ناویدا گوزەر بکەن. هەمان شانۆی دینامیکی-جوڵەیی- بەگشتی لە زیندووەکان دا دەبینین- هەر لەبەر هەمان هۆکاریشە کە ئاژەڵەکان پێستیان هەیە، درەختەکان توێکڵیان هەیە. هەر گیانەوەرێک توێژاڵێکی دەرەکی نەبێت یەکسەر دەمرێت. لە ئاستێکی سایکۆلۆژی -دەروونی- دا، ڕاستگۆیی دروست بە مانای ئەوە دێت کە تۆ دەستت لەم بەربەستە هەڵگرتووە. بەئاشکرا بەشێوەیەکی کرداری بانگی خەڵکی دەکەیت بتچەوسێننەوە. تۆ تەنها خۆت والێناکەیت گەمژە بیت، بەڵکو وا لە خۆت دەکەیت بەرگەی هیچ نەگریت.

ژەنەڕاڵ ئیسینهاوەر بە مەبەست بەهونەری خۆی کارەکتەرێکی دروست کرد بۆ ئەوەی دونیای دەرەوە بیبینن. ستوونوسی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز دەیڤد برووک باسی ئەوە دەکات کە ئیسین هاوەر "خودی دووەم"ی، پێگەیاندووە کە لەگەڵ بیروباوەڕە

[٩]-مۆنۆلۆگ: کاتێک کەسێک قسە لەگەڵ خودی خۆی دەکات.

هاوچەرخە باوەکان دا نامۆیە کە تەنها یەک خودی "ڕاستەقینە" هەیە. ئەم کارەکتەرە دووەمە داتاشراوەیەکی وەستاو و جێگیر نییە، وەک لەوەی کەسایەتییەکی جێگیری پرۆفیشناڵ، ڕێک، باوەڕپێکراو لەبەر چاوی خەڵکی کە هیچ شوێنێک بۆ گومان، توڕەیی، بێئومێدی- ئەوانەی کە بۆ ناسنامەکەتن، هاوکارەکەت، سەرینەکەت- جێناهێڵێت. من پێشنیاری ئەوەت بۆ دەکەم کە ئاماژەیەک لە ئیسینهاوەر وەربگرە و خودی دووەمی خۆت وەربگرە. ڕاستگۆییت تەسک بکەرەوە بە ڕاستگۆ بیت لەگەڵ بەڵێنەکانت و بەگوێرەی پرەنسیپەکانت مامەڵە بکەیت. ئیتر ئەوەی ماوە کاری هیچ کەسێکی تر نییە.

ئەگەر نموونە باڵا مێشکییەکەی کارەکتەری دووەم لەگەڵ تۆدا ناگونجێت، ئەوا هەوڵبدە بەم شێوەیە دایبنێ: وەک دەوڵەتێک بیر لە خۆت بکەرەوە، وەزارەتی دەرەوی هەیە و وەزیری دەرەوەی هەیە. یاسا بنچینەییەکانی سیاسەتی دەرەوەت بنوسە. دەبێت خۆت ڕۆڵەکە بگێڕیت- وەک جۆرێک لە کەسایەتییەکی یەکگرتوو. تۆ وەزیرێکی دەرەوەت ناوێت کە هەموو ئەو بیرۆکانەی لە مێشکت دایە لە ڕێگەی کەناڵەکانەوە پەخشی بکات، کە ئەمە لاوازی یاخود توانەوەی گومانە خودییەکان پیشان دەدات. تۆ وەزیرێکی دەرەوەت دەوێت کە وابەستەی بەڵێنەکان بێت و بەگوێرەی ڕێککەوتنەکان هەڵسوکەوت بکات، بەشێوەیەکی پرۆفیشناڵانە مامەڵە بکات، خۆی لە دەنگۆکان ببوێرێت، بۆڵەبۆڵەکان سنوردار بکات و بەشێوەیەکی بەڕەوشت بمێنێتەوە.

جا تۆ پێیدەڵێیت" کارەکتەری دووەم" یان " وەزیری دەرەوە"

ئەوا هەر زوو درک بەوە دەکەیت کە ئەم بەربەستە، ئەم پێستە، ئەم توێکڵە، نەک تەنها لە کاریگەری مادده ژەهراوییەکانی دەرەوە دەتپارێزێت، بەڵکو ئەوەی لە ناویشی دایە جێگیری دەکات. وەک هەموو سنورەکان، ئەم پێکهاتە دەرەکییە ئاستێک لە ئاشکرایی ناوەکی دادەمەزرێنێت. بۆیە ئەگەر تەنانەت کەسانی دیکەش- کارمەندەکانت و هاوڕێ ڕەسەنەکانت- ناوبەناو داوای ئەوەت لێدەکەن کە " ڕاستگۆیی زیاتر" پیشان بدەیت، مەکەوەرە داوەکەوە. سەگ ڕاستگۆیە. تۆ مرۆڤیت.

١٠

## پێنج چرکە بۆ نەخێر

## چاکە بچووکەکان، بەهەڵەداچوونە گەورەکان

کەسێک داوای چاکەیەکی بچووکی لێکردوویت. چەند زوو زوو بێ ئەوەی بۆ دووەم جار بیربکەیتەوە دەڵێیت بەڵێ؟ چەند زوو زوو ڕەتی دەکەیتەوە؟ چەند زوو زوو زۆرت لە خۆت کردووە بۆ ئەوەی دواتر ڕازی بیت؟ ئەی چەند جاریش پەشیمان بوویت لە گووتنی نەخێر؟

چەند ساڵێکی کەم لەمەو پێش لە کاتی کۆکردنەوەی ئامارەکان بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە- درکم بەوە کرد لەزۆر زیاتر ڕازیبووە چاکە لەگەڵ خەڵک بکەم- شتە بچووکەکانی وەک وانەیەک پێشکەش کردن، ئامادەکردنی بابەتێک، یان کردنی چاوپێکەوتنێکی کورت زۆرجار کاتی زیاترم بەکارهێناوە وەک لەوەی یەکەم جار وێنا دەکرد کە دەرەنجامێک بەرهەمبهێنێت کە لە ڕووی گرنگییەوە کەمتر بەسوودە وەک لەوەی هیوام بۆ هەموو شتە نیگەرانکەرەکان دەخواست. کاتێک دەستمپێکرد دەمویست چاکەیەک لەگەڵ کەسان

دیکە دا بکەم، بەڵام لە کۆتاییدا هیچ چاکەیەکم لەگەڵ خۆم دا نەکرد.

ئەم " نەخۆشی ڕازیکردن"ە، لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ بە سالانی ١٩٥٠ دا، زیندەوەرزانەکان هەوڵیان دا بۆیان دەربکەوێت کە بۆچی ئەو ئاژەڵانەی لە ڕووی خوێنییەوە وابەستەی یەکتر نین هێشتا هاوکاری یەکتر دەکەن. بۆ نموونە بۆچی مەیمونە شامپازییەکان گۆشت لەگەڵ مەیمونە شامپازییەکانی تردا بەش دەکەن؟ بۆچی گۆریلایەک کولکی گۆریلایەکی دەدۆزێت؟ کاتێک باسی ئەو ئاژەڵانە دەکەیت کە لە ڕووی خوێنییەوە پەیوەستن، وەڵامەکە ڕوونە: ئەوان ڕێژەیەکی باڵای هەمان جین بەش دەکەن. یارمەتیدان یارمەتی ئەوە دەدات ئەم هاوجینانە بەردەوامی بە ژیان بدەن، تەنانەت ئەگەر بەو مانایەش بێت کە چەند تاکێکی دیاریکراو شتێک بکەن کە نایانەوێت- ئەگەر تەنانەت بەو مانایەش بێت کە دەمرن. بەڵام بۆچی ئەو ئاژەڵانەی لە ڕووی خوێنییەوە پەیوەستی یەکتر نین ئەم قوربانییە قبوڵ دەکەن؟ بۆ ئەوەی پرسیارەکە بەشێوەیەکی تر بکەین: بۆچی ئەو ئاژەڵانەی لە ڕووی خوێنییەوە پەیوەستی یەکتر نین هەندێک جار بەو شێوە خەمخۆرییە مامەڵە دەکەن؟ بۆچی شامپازییەکە گۆشتەکە لە جیاتی ئەوەی لەگەڵ هاوڕێکەی دا بەشی بکات، بە تەنیا نایخوات؟ بۆچی گۆریلاکە لە جیاتی ئەوەی ئەو هەموو کالۆرییە بەنرخە و کاتژمێرە لە ژماردن نەهاتووانە بەفیرۆ بدات لە گەڕان لە کولکی ئاژەڵێک دا کە پەیوەست نیین لە خوێن دا بە دوای مێرووودا، سووک و ئاسان ناڕوات؟ ئەمانە پرسیاری هەوانتە نین.

وەڵامەکە خۆی لە ناو بیرکاری دا حەشارداوە، بەتایبەتتریش لە کێبڕکێ دا. شارەزای سیاسی ئەمریکی ڕۆبێرت ئەکسیلۆرد جارێکیان خولێکی پێشبڕێکی کردەوە کە تێیدا چەندین پرۆگرامی کۆمپیوتەری جیاواز دژ بە یەکتری پێشبڕکێیان دەکرد. هەر پرۆگرامێک شوێن ستراتیژیەتێکی تایبەت کەوتبوو کاتێک کاتی لەگەڵ ڕکابەرەکەی دا بەسەر دەبرد- هاوکاری دەکرد، ناپاکی بەرامبەر دەکرد، خۆپەرستانە مامەڵەی لەگەڵ دەکرد، هەمیشە شتێکی دەبەخشی...هتد. لە ماوەیەکی درێژ دا، ستراتیژیەتێکیان وەک سەرکەوتووترینیان دەرکەوت، ئەوەی کە ئەکسیلۆرد پێیدەگووت تۆڵەکردنەوە. ستراتیژیەتێکی ئاسانە، لەم ڕێنماییانە پێکدێت: یەکەم جار یارمەتیدەر بە، دواتر لە تەواوی یارییەکەدا لاسایی مامەڵەی ڕکابەرەکەت بکەرەوە. کەواتە ئەگەر- دوای یەکەم جوڵە- ڕکابەرەکەم هاوکاریم بکات، ئەوا منیش هاوکاری دەکەم. ئەگەر ڕکابەرەکەم یارمەتیم نەدات، هەرچەندە ئەو جا چ کوڕ بێت چ کچ فرسەتم لێبهێنێت، ئەوا منیش لە یارمەتیدانی دەوەستم. ئەگەر ڕکابەرەکەم تا کۆتایی یارییەکە بە یارمەتیدان دەست پێبکات، ئەوا من مامەڵەی خۆم دەگۆڕم بۆ ئەوەی جارێک زیاتر یارمەتیدەر بم.

ئەمە دروست ئەو مامەڵەیەیە کە لە شانشینی ئاژەڵان دا دەیبینین. ئەمە پێیدەگووترێت خەمخۆری دەستیاوانە یاخود خەمخۆری دەستیاو.ئەو شەمپازییەی ژەمە خواردنەکەی لەگەڵ ئەندامێکی تری کۆمەڵەکەیدا بەش دەکات، چونکە ئەو وایدادەنێت کە بۆ جاری داهاتوو کاتێک هاوڕێکەی خواردنی پێبوو بۆ بەشکردن

ئەوا ئەو چاکەکەی خۆی وەردەگریتەوە. ئەگەر شەمپازییەکە لە ڕاوکردنی دواتر بە دەستی بەتاڵ بگەڕێتەوە، هێشتا پێشبینی ئەوە دەکات شتێک بخوات.

دەستیاو تەنها لە ناو ئەو ئاژەڵانەدا دەخوات کە یادەوەرییەکی درێژیان هەیە. شەمپازییەک تەنها لەو کاتەدا دەتوانێت بەسەرکەوتوویی شوێن ئەم ستراتیژییە بکەوێت کە بیری بێت ئاخۆ ئەندامێکی تری کۆمەڵەکە پێشتر خواردنی لەگەڵ بەش کردووە یان نا. تەنها ژمارەیەکی کەم لە جۆری ئاژەڵە باڵا پێشکەوتووەکان ئەو توانا پێویستەی بیرهاتنەوەیان هەیە- بەشێوەیەکی سەرەکی مەیمون.

بەدڵنیاییەوە مەیمونەکان لە ستراتیژییەتی "بیرکردنەوە" ئاگادار نین، لە جیاتی ئەوە پەرەسەندن ئەم مامەڵەیەی کردووە بە شتێکی خۆڕسک. ئەو گروپە مەیمونانەی شوێن ستراتیژیەتی دواکەوتنی ورد ناکەون، لەو کۆمەڵە جینە سڕدراونەتەوە. لەبەر ئەوەی ئێمەی مرۆڤ تاکە چەشنی بونەوەری باڵاین، ئەم گوژمە بۆ دەستیاوی لە ئێمەش دا ئامادەگی هەیە.

ستراتیژیەتی لاساییکردنەوەی دەقاو دەق دروست ئەو شتەیە کە بەردەوامی بە ئابووری جیهانی دەدات. ئێمە ڕۆژانە هەماهەنگی لەگەڵ دەیان کەس دا دەکەین کە پەیوەست نین پێمانەوە، هەندێکیان لەوپەڕی دونیان و بەشێوەیەکی دیاریش سودیان لەوە بینیوە.

بەڵام وریا بە. دەستیاوی مەترسی مەڵاسدراویشی هەیە. ئەگەر کەسێک شتێکی باشت لەگەڵ بکات، ئەوا تۆ هەست بەوە دەکەیت

ئەرکە و دەبێت پێوەی پابەند بیت تا بۆیان قەرەبوو بکەیتەوە- بۆ نموونە بۆ ئەوەی تۆش چاکەیەکیان لەگەڵ بکەیت. ئەوا تۆ ڕێگە بە خۆت دەدەیت بەکاربهێندرێیت. لەوەش زیاتر، دووەم مەترسییەکی گەورەتریشی تێدایە. هەموو ستراتیژییەتێکی لاساییکردنەوەی دەقاودەق بە دەستپێشخەرییەک دەستپێدەکات، گۆڕانێکی لە ناکاو لە باوەڕ دا، یەکەمجار بە بەڵێیەکی لەخۆوە دەستپێدەکات، زۆر جار ئەمە بەدروستی ئەوەی لەگەڵ دا دێت کە پەژیوانبوونەوەی بەدوادا دێت. هەر ئەوەندەی کە بەڵێ لەخۆوەکە لە دەممان کەوتە خوارەوە، ئەوا ئێمە مەیلی ئەوەمان هەیە بەڵگەی ئەقڵانی بۆ بهێنینەوە. بیر لە بەڵگە بەهێزەکان دەکەینەوە بۆی، نەک ئەو کاتەی ئەو بۆ بەدیهێنانی ئەو بەڵێیە دەمانەوێت. ئێمە بەهای بەڵگەکانمان بە لاوە زیاترە وەک لە کات- ئەمە هەڵەیەکە لە بەڵگەهێنانەوەی ئەقڵانی دا، چونکە ژمارەیەکی ناکۆتا بەڵگە هەیە و ماوەیەکی یەکلاکەرەوەش لە بارەی کاتەوە هەیە.

لەو کاتەوە درکم بەوە کردووە ڕازیبوونی لەخۆوە بۆ شتەکان کاردانەوەیەکی بایەلۆجی توند و قورسە، من -پێنج چرکە نەخێر- ەکەی چارلی مەنگەر م وەک تاکتیکێکی دژ بەکارهێناو" ئەگەر نەوەد لە سەدی جارەکان بڵێیت –نەخێر- ئەوا لە دونیادا شتێکی زۆر بە دەست نادەیت." ئەگەر داوای چاکەیەکم لێبکرێت، ئەوا پێش ئەوەی بڕیاری خۆم بدەم و یەکلایی ببمەوە دروست پێنج چرکەکە بە هەند وەردەگرم- زۆربەی جاریش وەڵامەکە نەخێرە. من پێم باشە بەشێوەیەکی سیستماتیک زۆربەی داواکارییەکان ڕەت بکەمەوە،

ناوبانگەکەم بکەم بە قوربانی وەک لەوەی پێچەوانەکەی هەڵبژێرم.
بۆچی تاقی ناکەیتەوە؟ شتێکی دەگمەنە یەکسەر دوای ئەوە خۆت ببینیتەوە کە وەک کەسێکی نەخوازراو بەجێتدەهێڵن. لە ڕاستیدا زۆربەری خەڵک بەنهێنی ئەو ڕەقییەی تۆیان بەدڵە.

دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا فەیلەسوفی ڕۆمانی -سینیکا- نوسیویەتی" هەموو ئەوانەی تۆ بۆ لای خۆیان بانگ دەکەن، ئەوا تۆ لە خودی خۆت دوور دەخەنەوە." کەواتە هەر بە هاکەزایی پێنج چرکە نەخێر تاقیبکەرەوە. یەکێکە لە باشترین یاساکانی ژیانێکی باش.

١١

## وەهمی تەرکیزکردن

## بۆچی لە دەریای کاریبی دڵخۆشتر نابیت؟

با بڵێین زستانە و لە نیویۆرک دەژیت. شەقامەکان بە بەفرێکی پیس ڕووپۆش کراون. بە سڕینەوەی جامی پێشەوەی ئۆتۆمۆبێلەکەتەوە سەرقاڵیت. باش خێرا خێرا تەلاشە سەهۆڵ لەگەڵ خۆی ڕادەماڵێت و دەیدا بە دەموچاوت دا، پێڵاوەکانیشت پڕن لە بەفری نیمچە تواوە. سەری پەنجەکانت دەرزی ئاژن بوون. بە یەک تەکان، دەرگای ئۆتۆمۆبێلەکە دەکەیتەوە. لەسەر کوشنە چەرمەکە دانیشتوویت، کە وەک شەختە سەهۆڵ ساردە، دەستیشت لەسەر سووکانە زەمهەریر ئاساکە دادەنێیت. هەناسەکەشت کاتێک لە دەمت دێتە دەرەوە شێوەی هەورێکی سپی دەنەخشێنێت. پرسیارەکە ئەوەیە: ئەگەر لە کەنارەکانی میامی بژیایتایە چەند دڵخۆشتر دەبوویت کە کەشوهەوایەکی خۆشی هەیە بەردەوام بیست و شەش پلەی گەرمای سیلیزییە و شنەبایەکی ناسکیش لە دەریاوە دێت؟ لەسەر هێڵێک کە لە (٠)ەوە-تەنانەت یەک تۆزیش دڵخۆشتر نیت- دەستپێدەکات تا (١٠=) کە بەتەواوی دڵخۆشتریت-.

زۆربەی ئەو کەسانەی پرسیاریان لێدەکەم وەڵامەکەیان لە نێوان ٤ بۆ ٦ دایە.

له خاڵی شوێنی ڕاگرتنی ئۆتۆمۆبێلەکەتەوە کە دەستت بە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێلەکەت کردووە تا بچیتە سەر کار، تاوێک دواتر لە ڕێگا لە قەرەباڵغی شەقامەکەدا گیر دەخۆیت. سی خولەک درەنگ دەگەیتە دیدەنگەکەت[10] کە بە یەک تەوژم ئیمەیڵ و مقۆ مقۆیەکی پڕ لە سەرئێشەی هەمیشەیی لەگەڵ بەڕێوەبەرکەت دا بەخێرهاتنت دەکرێت. دوای کار، بازارکردنە هەفتانەییەکەت ئەنجام دەدەیت. کاتێک دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە ژەمە دڵخوازەکەت لێدەنێیت- تامیشی خۆشە- لەسەر قەنەفەکە لێیڕادەکشێیت و سەیری فیلمێکی باش دەکەیت و دەچیتە سەر جێخەوەکەت.

هەر وەک پێشتر لە فلۆریدا، لە ماڵەوە بەڕێدەکەویت، لە قەرەباڵغی شەقامەکان دا گیر دەخۆیت، مامەڵە لەگەڵ ئیمەیڵ و بەڕێوەبەرە بێزارکەرەکەتدا دەکەیت، بازارکردنە هەفتانەییەکەت دەکەیت، خواردنی بە تام دەخۆیت، سەیری فیلمێکی باش دەکەیت. دووبارە لێت دەپرسم: ئەگەر لە کەناری میامی بژیایتایە چەند دڵخۆشتر دەبوویت؟ زۆربەی کەس ئێستا ئەو وەڵامەی دەیدەنەوە لە نێوان(٠) بۆ( ٢) دایە.

بۆ ماوەی دە ساڵ لە کەنارەکانی میامی ژیاوم. پێش ئەوە و دوای ئەوەشی کە لە سویسڕا ژیام- بەفری نیمچە تواوە ناوە ناوە دەیدات بە جامی ئۆتۆمۆبێلەکەت دا و هەموو ئەو شتانە. کە لە کەنارەکانی میامی بووم چەند دڵخۆشتر بووم؟ وەڵام: دڵخۆش نەبووم.

---

[10]-دیدەنگە: ئۆفیس.

ئەمە پێیدەگووترێت وەهمی تەرکیزکردن. وەک دانیاڵ کاهنیمان ڕوونیدەکاتەوە" لە ژیاندا هیچ شتێک کاتێک بیری لێدەکەیتەوە ئەوەندە گرنگ نییە کە پێتوایە گرنگە." تا وردتر تەرکیز بخەینە سەر لایەنێکی دیاریکراوی ژیانمان، ئەوا کاریگەرییە بەرچاوەکەی گەورەتر دەبێت. لە دەستپێکی وەسفکردنەکەی سەرەوەدا، بەنزیکەیی تەواو جەختم لە کەشوهەوا کردەوە- شەختە لە نیویۆرک، ساماڵ لە میامی. لەبەر ئەوە کاتێک داوام لێکردیت بەراوردی ئاسوودەیی ژیان لە نیویۆرک و ژیان لە میامی بکەیت ئەم لایەنە باڵادەست بوو. دواتر چوارچێوەی تەواوی وێنەکەمان کێشا، هەر لە بەیانی دەرچوون لە ماڵەوە تا ئێوارەیەکی ئاسوودە لەسەر قەنەفە پاڵدانەوە، کە تێیدا کەشوهەوا تاکە بنەما بوو. ئەگەر ئەمە فراوانتر بکەین بۆ ماوەیەکی زەمەنی درێژتر- هەفتەیەک، مانگێک، ساڵێک، تەواوی تەمەن-بۆمان دەردەکەوێت کە لە ناکاو کەشوهەوا لە سەرتاپای ئاسودەییەکەدا دەبێت بە لایەنێکی کەمبایەخ.

سەرکەوتن بەسەر وەهمی تەرکیز دا کلیلی بەدەستهێنانی -ژیانێکی باش-ە. ئەمە واتلێدەکات خۆت لە چەندین بڕیاری گەمژانە لابدەیت. کاتێک شتەکان بەراورد دەکەیت-ئۆتۆمۆبێلەکان، پیشەکان، شوێنی گەشتکردن لە کاتی پشووەکان دا- ئەوا تۆ مەیلی ئەوەت هەیە بەتایبەت و بەنزیکی تەرکیز بخەیتە سەر یەک لایەن، سەد هۆکارەکەی تر پشتگوێ بخە. بەهۆی -وەهمی تەرکیز-ەوە، بەهایەکی نائاسایی گرنگ بەم لایەنە دەدەیت. باوەڕت وایە ئەم لایەنە لەوە هەستیار و گرنگترە وەک لەوەی لە ڕاستیدا هەیە.

کەواتە چیت لەدەست دێت بۆ بەرەنگاری کردنەوەی ئەمە؟ یان

هەر سەد هۆکارەکەی تر بەراورد دەکەیت، پڕۆسەیەکی کارکردنی سەخت یان – بەشێوەیەکی کرداری تر- هەوڵدەدەیت ئەو دوو شتەی بەراوردیان دەکەیت بەتێکڕایی بیانبینیت. لە دوورەوە بەراوردیان بکە بۆ ئەوەی خۆت لە زیاد جەختکردنەوە لە هەر تاکە هۆکارێک ببوێریت. گووتنی لە کردنی ئاسانترە. با وێنەی خاڵە سەرەکییەکەمت بۆ بکەم: منداڵێکی ساوا تەنها بیرلەوە دەکاتەوە کە هەنووکە لەبەر دەمیدایە. یەکێک لە یارییەکان لە منداڵە سێ ساڵەکەم دەبەم، ئەویش بە جۆرێک وڕکی لێدەگرێت وەک ئەوەی کۆڵەکەی ئاسمان ڕووخا بێت- هەرچەندە یەک دەرزەن یاری دیکەی هەیە و ئەو دانەیەشی ئێستا لێمسەندووە دەمێکە پشتگوێی خستووە. لە ماوەی ژیانیشمان دا، فێر دەبین خۆمان لە باوردۆخە لە ناکاوەکان ڕزگار بکەین. ئەگەر هەست بکەم لە دەمەو عەسرێکی نیمچەفێنکی هاوین دا حەزم لە بیرەیە، دواتر دەرگای بەفرگرەکە بکەمەوە ببینم نەمانماوە، دەست بە هاوارکردن مەکە شیرەت ڕۆژە ڕێیەک بڕوات. دەتوانم تەرکیزم لەسەر بیرەکە دوور بخەمەوە، بۆیە ناخۆشی بەتاڵی بەفرگرەکەم تەنها کاریگەرییەکی بچووکی لەسەر باشیم دەبێت. سەرەڕای هەمووی ئێوارەکەم ناشێوێت.

هەرچەندە بەدبەختانە لەم ڕوانگەیەوە بەرەو پێشچوونمان ناتەواوە. ئێمە زۆر بە لامانەوە قورسە لە هاوێنەیەکی زۆر گۆشە فراوانەوە سەیری بارودۆخی هەنوکەییمان بکەین. ئەگینا بە شتە پڕوپوچەکان بێزار نابین.

تا ئێستا چەند جار لە خۆتت پرسیوە ئەگەر پیشەیەکی جیاوازت هەبووایە، لە شوێنێکی تر بژیایتایە، بەشێوازێکی تر سەرت چاک بکردایە، ژیانت چەند باشتر دەبوو؟ باشە، کەمێک جیاواز دەبوو. بەڵام ئێستا دەزانیت کاریگەری گۆڕانکارییەک بەشێوەیەکی بەرچاو کەمترە لەوەی وەک تۆ بیری لێدەکەیتەوە. درێژترین دیمەنی شیاو لە ژیانت دا بە نموونە وەربگرە. ئەوە بزانە کە ئەو شتانەی لە حاڵی حازر دا زۆر گرنگ دەردەکەون، بچووک بوونەوە بۆ ئاستی چەند خاڵێک- چەند خاڵێک بە ئاستەم کاریگەرییان لەسەر تەواوی وێنەکە هەیە. ژیانێکی باش تەنها ئەو کاتە بەدەست دێت ئەگەر ناو بە ناو لە ڕێگەی هاوێنەیەکی گەورەوە بە تیلە چاو سەیرێک بکەیت.

کاتێک لە دوا گەشتم دا بۆ پاریس گەیشتمە ئوتێلی شەنگری لا لە تەنیشت جاردینس دو تڕۆکادیرۆ سەیرم کرد خۆم بینییەوە لە تەنیشت پیاوێکەوە وەستابووم دەستیکرد بوو بە سەرزەنشتکردنی کارمەندی پرسگەکە- وادیار بوو لەبەر ئەوەی کچە کارمەندەکە نەیتوانی بوو ژوورێکی بۆ بدۆزێتەوە کە چاوی لە بورجی ئیڤڵ بێت. پیاوەکە شیڕاندی" تەواوی گەشتەکەمت بۆ پاریس تێکوپێک دا!" سەرم ڕاوەشاند. لەسەر چرپای ناو ئوتێلەکەتەوە بورجی –ئیڤڵ-ت لێوە دیار بێت یان نا لە ڕاستیدا هەر بابەت نییە. زۆر لەوە گرنگتر ئەوەیە چەند بە ئاسودەیی تێیدا دەخەویت. بینینی بورجی ئیڤڵ لایەنێکی زۆر زۆر بچووکی گەشتێکی سەرکەوتووە بۆ پاریس. لە هەر حاڵەتێکیان دا بێت، هەر هەنگاوێکت لە ئوتێلەکە نایە دەرەوە، دەتوانیت بە کامی دڵی خۆت سەیری بورجەکە بکەیت. بەڵام پیاوەکە، کە ئێستا وەک

تەماتە سوور بووبووەوە، وا دەردەکەوت خەریک بوو لە توڕەیی دا دەتەقییەوە. وەهمی تەرکیزکردن کێچێکی لەم پیاوە کرد بوو بە گایەک.

کاتێک دێتە سەر بابەتی پارە، ئەوا بەتایبەتتر لە ڕووی - وەهمی تەرکیزکردن -ەوە قەڵەمی ئەژنۆمان دەشکێت. چەند دڵخۆشتر دەبوویت ئەگەر ملیۆنێرێک بوویتایە؟ وارن بەفێت، یەکێک لە دەوڵەمەندترین کەسەکانی دونیا، جارێکیان ژیانی خۆی لەگەڵ هاوڵاتییەکی ئاسایی دا بەراورد کرد. هەستی نەدەکرد ئەوەندە جیاوازی هەبێت. بەفێت سێیەکی ژیانی بەخەوتن لەسەر دۆشەکێکی ئاسایی بەسەر دەبات- هەر وەک من و تۆ. بەفێت جلەکانی لە هەمان ئەو بازاڕە هەرزانانەدا دەکڕێت هەر وەک ئەوانەی من و تۆ. خواردنی دڵخوازی کۆکاکۆلایە. ئەو خواردنەی دەیخوات لە هی خوێندکارێک نە باشترە نە تەندروستترە. لەسەر مێز و کورسییەکی ئاسایی ئیش دەکات. دیدەنگەکەی لە ساڵی ١٩٦٢ەوە هەر لە هەمان شوێن بووە- لە باڵەخانەیەکی خراپۆکە دا لە ئۆماها، نیبراسکا. ئەگەر خولەک بە خولەکی ژیانی بەفێت لەگەڵ ژیانی خۆت دا بەراورد بکەیت، کاریگەری سامانەکەی کەمبایەخە.

یەک جیاوازی زۆر بچکۆلە هەیە: بەفێت خاوەنی فڕۆکەیەکی -جێت-ی تایبەتە، ئەمە لە کاتێکدا کەسانی وەک ئێمە هەر خۆمان بە لایەنی ئابوورییەوە گرێداوە.دوای ئەم بەشە، هەرچەندە کە زۆر خراپتر لە کورسییەکی تەسکی ناو فڕۆکە دەزانین- کە تەنها سەدا ٠,١ی ژیانتی تێدا بەسەر دەبەیت- تەسکی بیرکردنەوەیە. بە تەرکیز خستنە سەر شتە بێبەهاکان، ئەوا -ژیانە باش-ەکەت بەفیڕۆ دەدەیت.

١٢

## ئەو شتانەی دەیانکڕیت هیچ کاریگەرییەکی ڕاستەقینە بەجێناهێڵن

## بۆچی دەبێت کەمتر بکڕیت و ئەزموونی زیاتر بکەیت؟

چەند چێژ لە ئۆتۆمۆبێلەکەت وەردەگریت؟ لەسەر هێڵێک لە ژمارە (٠)ەوە، تا ژمارە (١٠) بنوسە. ئەگەر ئۆتۆمۆبێلیشت نییە، ئەوا هەمان شت بۆ خانوەکەت، شوقەکەت، لاپتۆپەکەت، هەر شتێکی تری لەو جۆرەت هەیە بکە. دەروونناسان، نۆربێرت شوارز، دانیاڵ کاهنیمان، جینگ خو، ئەم پرسیارەیان لە شۆفێرەکان کرد و وەڵامەکانیان بەراورد کرد بە بەهای ئابووری ئۆتۆمۆبێلەکان. ئەنجام چی؟ تا ئۆتۆمۆبێلەکە زیاتر کەشخەتر بێت، ئەوا چێژی زیاتر بە خاوەنەکەی دەبەخشێت. ئۆتۆمۆبێلێکی بی ئێم دەبلیو BMW– ٧- لە سەدا پەنجا زیاتر چێژ دەبەخشێت وەک لە ئۆتۆمۆبێلێکی فۆرد ئیسکۆرت. تا ئێستا، باشە: کاتێک کەسێک پارەیەکی زۆر دەخاتە نێو کڕینی ئۆتۆمۆبێلێکەوە، لانیکەم لە بەرامبەر دا لەوەبەرهێنانەکەیان

دا شتێکی باشیان بۆ دەگەڕێتەوە کە لە شێوەی خۆشی دا خۆی دەردەخات.

ئێستا با پرسیارێکی کەمێک جیاوازتر بکەین: لە ماوەی دوایین گەشتت دا بە ئۆتۆمۆبێلەکەت چەند دڵخۆش بوویت؟ لێکۆڵەرەوەکان ئەم پرسەش دەخەنە ڕوو، دووبارەش وەڵامەکانی شۆفێرەکان لەگەڵ بەهای ئۆتۆمۆبێلەکان دا بەراورد دەکەن. سەرەنجام؟ هیچ هاوگۆڕانێک لە نێوانیان دا نییە. گرنگ نییە ئۆتۆمۆبێلەکەت چەند کەشخەیە یان پەڕپووتە، پێوانەکردنی بەختەوەری خاوەنەکانیان هەموویان بە یەکسانی لە یەک ئاستدان.

یەکەم ڕاپرسی هاوگۆڕانکارییەکی لە نێوان بەهای دارایی ئۆتۆمۆبێلەکە و ئەو خۆشییە هەستپێکراوەی دەیدات بە خاوەنەکەی- تا کەشخەییەکەی زیاتر بێت، چێژ و خۆشی زیاتر دەبەخشێت. کەچی ڕاپرسی دووەم هیچ هاوگۆڕانکارییەکی لەم شێوەیەی دەرنەخست- ئۆتۆمۆبێلێکی کەشخە بە هیچ شێوەیەک خاوەنەکەی دڵخۆشتر ناکات. ئەمە چۆن دەبێت؟ ئاسانە: یەکەم پرسیار وات لێدەکات بیر لە ئۆتۆمۆبێلەکە بکەیتەوە، ئەمە لە کاتێک دا پرسیاری دووەم واتلێدەکات بە تەواوی بیر لە شتە جیاوازەکان بکەیتەوە- پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لە کاتی گەشت دا،باروودۆخێک لەسەر کار، قەرەباڵغی سەر شەقامەکان، شۆفێرێکی گەمژە لەبەر دەمت دا قووت دەبێتەوە. با بەشێوەیەکی ئاسان دەریببڕین، ئۆتۆمۆبێل تەنها کاتێک دەتوانێت بەختەوەرت بکات کەبیری لێدەکەیتەوە نەک کە لێیدەخوڕیت. ئەمە کاریگەری وەهمی تەرکیزکردنە کە لە بەشی

پێشوودا گەنگەشەمان کرد.

بەدڵنیاییەوە ئەمەتەنها بۆ ئۆتۆمۆبێلەکان ڕاست نییە. وەهمی تەرکیزکردن کاریکەگەری لەسەر چێژی هەموو ئەو شتانە هەیە کە دەیانکڕیت. کاتێک بیر لە -س-دەکەیتەوە، ئەوا تۆ مەیلی ئەوەت هەیە زۆر خراپ زیاد لە پێویست مەزەندەی کاریگەرییەکانی -س- بکەیت لەسەر ژیانت. جا ئەوە ماڵێک بێت بۆ کاتی پشووەکانت، تەلەفزیۆنێکی گەورەی پلازما بێت، یان جوتێک پێڵاوی ژنانەی پاژنە بەرز بێت، بیرکردنەوەت لە بارەی کڕینییەوە بەشێوەیەکی جەختلێکەرەوەوە دڵخۆشت دەکات- بەڵام لە کاتی بەکارهێنانی ڕۆژانـەدا کاڵ دەبێتەوە دەبێت بە شتێکی لاوەکی لە مێشکت دا، کاریگەرییەکەی لەسەر بەختەوەریت کەم دەبێتەوە. کاتێک -زیانبەخشی-ش بە هەند وەردەگرین و باسی دەکەین، چونکە کاریگەرییەکی نهێنی و لاوەکییان هەیە تێچوویەکی شاراوەیان هەیە لەبەدەستهێنانی شتە جوانەکان دا ( هەم لە ڕووی پارەوە هەم لە ڕووی کاتەوە، وەک لە بەشی ٥ دا بینیمان) لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم دوو کاریگەرییە زۆر جار پێکەوە کۆدەبنەوە تا واتلێدەکەن ئیتر دەستت پێیڕاناگات- دەرەنجامی تۆڕەکە ئەوەیە کە لە بەختەوەری دا دۆڕاویت.

سەختە بـاوەڕی پێبکەیت؟ با نموونەیەک وەربگرین" تۆ خانویەکی نایابی گەورەت لە دەرەوەی شار کڕیوە. لە ماوەی سێ مانگی سەرەتادا چێژ لە هەریەکە لە پانزە ژوورەکەی وەردەگریت، بە بچووکترین وردەکاری خانووەکە دڵخۆشیت. کەچی تەنها شەش

مانگت تێپەڕاندووە، بە ئاستەم سەرنجی ئەو سامانە دەدەیت کە لە دەورتدایە. هەموو ڕۆژێک کە تۆ سەرقاڵی شتەکانی دیکەیت لە بابەتی گرنگەکانی دیکەدا پێتگەیشتوتەوە. لە هەمان کاتدا هەندێک شت گۆڕاون- خانوویەک کە پانزە ژوور و باخچەیەکی هەیە جیاوازە لەو شووقە سێ ژوورییەی لە ناوەڕاستی شار دا بەکرێت دەگرت. ئێستا تۆ پێویستت بە پاککەرەوەیەک و باخەوانێک هەیە. چیتر ناتوانیت بچیت بە پێ سەوزەواتەکەت بکڕیت، چوون بۆ سەر کاریشت لە جیاتی ئەوەی بە بیست خولەک بە سواری پاسکیل بیگەیتێ، یەک کاتژمێرت پێدەچێت بە ئۆتۆمۆبێل. بەشێوەیەکی بنچینەیی ئەم ماڵە شاهانەیەت تۆڕێکی بۆ لەدەستدانی بەختەوەریت دروست کردووە. هەژمارە بانکی باشی بارودۆخت پارەی زیاد لە پێویستی دەوێت.

ئەم نموونەیە دروستکراو بوو، بەڵام لە ژیانی ڕاستەقینەدا بینیومە ئەوە ڕوویداوە. هاوڕێیەکم یەختێکی هەیە- واباشترە بڵێم هەیبوو، چوونکە یەکسەر فرۆشتییەوە. ئێستا کەمێک ژیرتر دەردەکەوێت: دوو خۆشترین ڕۆژ لە ژیانی خاوەن یەختێک دا کە ئەو بە کورتی و بە پوختی خستوویەتییە ڕوو، ئەو ڕۆژەیە کە دەیکڕیت و ئەو ڕۆژەیە کە دەیفرۆشیت.

هەر وەک ئێستا خۆتان دەیزانن، ئەگەر بەدوای -ژیانێکی باش-ەوەیت، ئەوە مایەی ئامۆژگاریکردنە کە کەمێک دەست بەو شتانەوە بگریت کە دەیانکڕیت. دەگووترێت کۆمەڵێک "کەلوپەل" هەن کە چێژ و خۆشییەکەیان بەهۆی -وەهمی تەرکیزکردن-

ەوە لەناو ناچێت: ئەزموونەکانن. کاتێک ئەزموونی شتێکی بەچێژ دەکەیت، ئەوا تۆ بە تەواوی بە دڵ و بە مێشک ئامادەییت هەیە. کەواتە هەوڵبدە زیاتر وەبەرهێنان لە ئەزمونەکان دا بکەیت وەک لە کەلوپەلە ماددی و بەرجەستەکان. سودێکیان ئەوەیە زۆربەی ئەزموونەکان پارەی کەمتریان تێدەچێت و کەمتر دەبنە بابەت بۆ کاریگەری زیانبەخشی. خوێندنەوەی کتێبێکی باش، گەشتکردنێک لەگەڵ خێزانەکەت دا، کردنی یارییەکی کۆنکەن لەگەڵ هاورێکانتدا- ئەوانە هەموویان شتی هەرزانن. بەدڵنیاییەوە هەنێک ئەزموون پێویستیان بە گیرفانێکی پڕە، وەک گەشتێکی جیهانی یان گەشتێکی تایبەت بۆ بۆشایی ئاسمان. بەڵام ئەگەر پارەت هەبوو، ئەوا ئەوانە گەرەنتی وەبەرهێنانێکی باشترت بۆ دەکەن وەک لە پارە کۆکردنەوە بۆ کڕینی ئۆتۆمۆبێلێکی پۆرش.

لابەلایە، بەڵام گرنگە: پیشەکەشت ئەزموونە. کاتێک خەریکی کارەکەتیت هەر وا بە هەوانتە مەیگرە، -پۆرش-ێکیش هەر وا سادە و ئاسان لەوێیە، بەڵام کاتێک لێیدەخوڕیت وردە وردە کاریگەرییەکەی دەبێت بە شتێکی لاوەکی لە مێشکتدا. پیشەکەت دەست بەسەر بیرکردنەوەکانت دا دەگرێت: پیشەکەت داوای بەردەوامبوونت لێدەکات، سەرقاڵبوونێکی توندپێیەوە- ئەگەر کارەکەتت خۆشبوێت ئەوە شتێکی نایابە. بەڵام ئەگەر ڕقت لێبێت، ئەوا کێشەیەکی سەختت هاتۆتە بەردەست. بە بیرکردنەوەکانی ترت ناتوانیت هیوای ئەوە بخوازیت لە پیشە ناخۆشەکەت دوور بخرێیتەوە.

ئەم بابەتە هۆکارێکی سەرەکی بوو لەوەی کە بڕیارم دا ببم

بە نوسەر. من حەزم لە پرۆسەی نوسینە. ئەوە بە لای منەوە زۆر لە کتێبە چاپکراوەکە گرنگترە. بەدڵنیاییەوە هەر جارێک کە یەکەم نوسخەی کتێبەکەم هەڵدەگرم زۆر خۆشحاڵ دەبم. بەسۆزەوە بە بەرگی کتێبەکە دەکێشم، چاوێک بە لاپەڕەکانی دا دەخشێنم، بۆنی شکۆداری ئەو کەتیرە نوێیەی نێوان بەرگی کتێبەکە هەڵدەمژم. بەڵام هەر زوو کتێبەکە لەسەر ڕەفەکە دیارنامێنێت، منیش بە دەگمەن بۆ دووەم جار بیری لێدەکەمەوە-من هەر پێشتر بیرم لە کتێبی دووەم کردۆتەوە.

هیچ شتێک لەوە گەمژانەتر نییە خۆت لە پیشەیەک دا بکوژیت کە پارەیەکی زۆرت بۆ پەیدا دەکات، بەڵام هیچ خۆشییەکت بۆ ناهێنێت- بە تایبەتی ئەگەر ئەو پارەیە لە وەبەرهێنانی کەلوپەلەکان دا بەکاربهێنیت نەک لە ئەزمونەکان دا. وارن بەفێت بەم شێوەیە دەری دەبڕێت" کارکردن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە واتلێدەکەن هێلنج بدەیت، زیاتر وەک ئەوەیە لەبەر پارە هاوسەرگیری بکەیت- ڕەنگە بیرۆکەیەکی خراپ بێت جا لە هەر بارودۆخێک دا بێت، بەڵام ئەگەر پێشتر خۆت دەوڵەمەند بیت ئەوا ئەوە ئەوپەڕی شێتییە."

با لە بارەی هاوسەرگیرییەوە بدوێین: لە کۆتاییدا ئەمەش ئەزموونە. شتێکی ناپێویستە درێژە بە پەیوەندییەک بدەیت کە دڵخۆشت ناکات تەنها لەبەر دڵسۆزییەکی ڕووت یاخود نەبوونی هیچ بژاردەیەکی تر. وەهمی تەرکیزکردن بە فریات ناکەوێت. بەدڵنیایەوە هەموو پەیوەندییەک بە تەنیا هەموو ڕۆژێکی هەر خۆش نییە، بەڵام ڕۆژە ناخۆشەکانیش نابێت لە ڕۆژە خۆشەکان زیاتر بن.

ئەگەر هەوری زریان هەموو شتێکی گرتەوە، ئەوا هەوڵبدە هونەری ڕاستکردنەوە تاقیبکەیتەوە (بەشی دووەم). ئەگەر بەتەواوی هیچ بە کەڵک نەهات، ئەوا پەتی پەڕەشووتەکەت ڕابکێشە. پەیوەندییەک- بەتایبەتی پەیوەندی ڕۆمانسی- هەرگیز ناکشێتەوە بۆ بەشی دواوەی مێشک.

بەکورتی و بەپوختی؟ ئێمە زۆر کاریگەری کڕینی کەلوپەلەکان زیاد لە پێویست دەخەملێنین، بەڵام کاریگەری ئەزموونەکان زۆر کەم دەخەملێنین. بۆ نموونە بیرێک لەماڵەکەت بکەرەوە- تەنانەت ئەگەر هەنوکەش تێیدا دانیشتبیت- لە ناو گەرەلاوژەی بیرکردنەوە ڕۆژانەییەکانت دا ونبووە. لەگەڵ ئەزموون دا ئەمە نموونە نییە. ئەی ئەگەر پێشتر پێڵاوە پاژنەبەرزەکانت کڕیبێت؟ ئەوا لانیکەم دڵنیایت لەوەی بەشێوەیەکی ئاگایی چێژیان لێدەبینیت. بەشێوەیەکی نموونەیی دەتەوێت هەموو بەیانییەک بیانسڕیتەوە و بۆیاخیان بکەیت، هەموو شەوێک خەو بە هیچەوە نابینیت ئەو پێڵاوە پاژنە بەرزە سوورانە نەبێت. بۆ یەک جاریش بێت وەهمی تەرکیزکردن لە بەرژەوەندی خۆت بەکاربهێنە.

## ١٣
# پارە بە نەفرەت بێت
# ڕزگارکردنی ئازادیت

خۆر پشتە ملم هەڵدەقرچێنێت، چۆن پارچە شووشەیەک لەسەر لم دەدرەوشێتەوە، هەوا دروست بەو چەشنەیە. پوکەکانت لە زبریدا دەڵێی سمارتەن. دوو ڕۆژ پێش ئێستا دوا دڵۆپی ئاوەکەتت خواردەوە، لەو کاتەشەوە هەر چوار پەلت شکاوە، بەرەو مێرگێکیش کە لە ئاسۆدا دیارە چنگەخشێتە. دروست ئێستا چەند بە لیترێک ئاو دەدەیت؟

بابڵێین پارەت داوە و ئاوەکەشت وەرگرتووە. خراپترین بەشی تینوێتییەکەتت شکاندووە. چەند بە دووەم لیتر دەدەیت؟ ئەی بە سێیەم؟

ئەگەر وا ڕێنەکەوێت بە جۆرێک لە جۆرەکان فەقیر بیت، واتە هێزێکی بان مرۆییت نەبێت بۆ بەرگە گرتن، ئەوا لەوانەیە هەموو ئەو پارەیەی هەڵتگرتووە بەموچەی خانەنشینییەکەشتەوە لەگەل ئەو کوخەی بۆ کاتی پشووەکانت تەرخانت کردووە بدەیت بە

لیتری یەکەم. بۆ لیتری دووەم، ڕەنگە کاتژمێرە – بریتلینگ-ەکەت. بۆ لیتری سێیەم، هێدفۆنەکەت. بۆ چوارەم، ناوکەفی پێڵاوەکانت. ئابوریناسەکان بەمە دەڵێن لەناوبردنی سوودە لاوەکییەکان. هەر لیترێکی زیاتر کەمتر پێداویستی لاوەکی بەرگەی دەکرێت وەک لە لیتری پێشووتر، دوای خاڵێکی دیاریکراویش هەر هیچ شتێک بەرگەی ناگرێت. بەشێوەیەکی کرداری ئەمە بۆ هەموو کەلوپەکان ڕاستە- ئاو، جلوبەرگ، کەناڵەکانی تەلەفزیۆن- بەڵام لە سەرو هەموویانەوە بۆ پارە. ئەمە دەمانگەیەنێت بەو پرسیارەی هەزاران ساڵ تەمەنییەتی: ئایا دەتوانی بە پارە بەختەوەری بەدەستبهێنیت؟ ئەمە پرسیارێکی تاقیکردنەوەیە: دەبێت لە ساڵێکدا چەند پەیدا بکەیت بۆ ئەوەی هەست بکەیت ئەو داهاتە زیادەیە چیتر هیچ کاریگەرییەکی لەسەر باشبوونی بەرچاوی تۆ نییە؟ پێش ئەوەی لە خوێندنەوە بەردەوام بیت لە لێواری لاپەڕەکەدا بڕەکە بنوسە.

لێکۆڵینەوەکان وەڵامێکی ڕوون دەخەنە ڕوو. ئەگەر بە هەژاری دەژیت، ئەوا پارە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت. نەهامەتییە داراییەکان تەواو مایەی خەمبارین. ئەگەر لەسەر داهاتی مامناوەندی دەژیت، ٣٨,٠٠٠ دۆلار لە ساڵێکدا، ئەوا پارە ڕۆڵێکی مامناوەندی تر دەگێڕێت. لەسەرو داهاتی خێزانەوە کە لە ساڵێکدا ٧٥,٠٠٠ دۆلارە( لە سانفرانسیسکۆ کەمێک زیاتر، لە سینسیناتی تۆزێک کەمتر) کاریگەری داهاتی زیادە کەم دەبێتەوە بۆ سفر- ئەگەر داهاتەکەت بشبێت بە یەک ملیۆن دۆلاریش ئەوە هەر لە شوێنی خۆیدا دەمێنێتەوە. ئەوە هێندە سەرسامکەر نییە. وێنای ژیانی ملیاردێک چرکە بە چرکە لە

خۆرهەڵهاتنەوە تا خۆرئاوابوون بهێنەرە پێشچاوی خۆت. تەنانەت کەسە دەوڵەمەندەکانیش دەبێت دەم و ددانیان بشۆن. ئەوانیش هەندێک جار قوڵ دەخەون. ئەوانیش هەست بە بێکەڵکی و پوچی دەکەن، لەگەڵ خێزانەکەیان دا دەمەقاڵێ دەکەن، لە پیربوون و مردن دەترسن. لەسەروی هەموویەوە دەبێت سەرتاپای دەستوپێوەندی ستافەکەی بەڕێوە ببات، فریودانی میدیا، یەک تەوژم نامەی پڕ لە پاڕانەوەی خەڵکی تا لە لایان کار بکەن. ئایا هەبوونی حەوزێکی مەلەکردن بە ئەندازەی حەوزی یارییەکانی ئۆلۆمپیاد لە باخچەکەت دا هەموو ئەو شتانە هەڵدەوەشێنێتەوە؟

لە لێکۆڵینەوەیەکی بەناوبانگ دا کە لە ساڵی ١٩٧٨ دا کرا، توێژەرەکان ئاستی ڕازیبونیان لە ژیانیان لای براوەکانی یانسیت لێکدایەوە. دەرەنجام؟ چەند مانگێکی کەم دوای بردنەوە گەورەکانیان، ئەو ملیۆنێرە نوێیانە بە هیچ شێوەیەکی وا گرنگ لە پێشووتر خۆشحاڵتر نەبوون.

ئابووریناس ڕیچارد ئیستەر ئاستی خۆشگوزەرانی ژیانی لای ئەمریکییەکان لە ساڵی ١٩٤٦ بە بەراورد بە ساڵی ١٩٧٠ پێوا. هەرچەندە بەنزیکەیی پێوەرەکانی ژیان لەو ماوەیەدا دوو هێندە بوو بوو( لە ساڵی ١٩٧٠ دا بەنزیکەیی هەموو کەسێک ئۆتۆمۆبێل، بەفرگر، جلشۆر، ئاوی گەرمی هەبوو) ئاستی خۆشگوزەرانی ژیانی هەر بەجێگیری مابووەوە. ئیستەرلین کاتێک داتاکانی بەراورد کرد هەمان ئەنجامی لە هەژدە وڵاتی دیکەدا بۆ دۆزییەوە. بە دەربڕینێکی تر، خەڵکی لە ساڵی ١٩٧٠ دا هیچ لە کاتی دوای تەواوبوونی جەنگ

خۆشحاڵتر نەبوون. بەرەوپێشچوونی ماددی ڕەنگدانەوەی لە بەرزبوونەوەی ڕێژەی خۆشگوزەرانی دا نەبوو. ئەم دەرخستەیە پێیدەگوترێت –پارادۆکسی[11] ئیستەرلین-: هەرئەوەندە بە پێداویستییە بنچینەییەکانی ژیانت گەیشتیت، بەدەستهێنانی زۆربوونە داراییەکانت، بەردێک ناخاتە سەر بەختەوەری تۆ.

ئەی باشە بۆچی بەردەوام تامەزرۆی ئەوەین ببین بە ملیۆنێر- ئەمە لەبەرچاوی هەموو توێژینەوە گشتییەکانە؟ هۆکارە سەرەکییەکە ئەوەیە، سامان شتێکی ڕێژەییە، نەک ڕەها.

با بڵێین کە تۆ و هاوپیشەکەت زنجیرەیەک بەڵێنامەی زۆر بەسوودتان خستۆتە بەردەمی بەڕێوبەرەکەتان. تۆ کامیان هەڵدەبژێریت: أ) بە بڕی دە هەزار دۆلار خەڵات دەکرێیت یاخود و هاوپیشەکەشت هیچ وەرناگرێت ب) پانزە هەزار دۆلا وەربگریت ئەمە لە کاتێکدا هاوپیشەکەت بیست هەزار دۆلار وەردەگرێت؟ ئەگەر تۆش وەک زۆربەی خەڵکی وابیت، ئەوا تۆ دە هەزار دۆلارەکە هەڵدەبژێریت- هەرچەندە بژاردەی دووەم دەوڵەمەندترت دەکات.

بیهێنەرە بەرچاوی خۆت کە پارچە زەوییەکت لە شوێنێکی خۆش کڕیوە و خانوویەکت لەسەر دروست کردووە. خانووەکە زۆر خۆش و نایابە، لانیکەم سێ ژووری نوستنی لە پێداویستی تۆ زیاتر تێدایە. ساڵێک دواتر، کەسێکی تر پارچە زەوییەکەی تەنیشتت دەکڕێت و خانوویەکی زۆر گەورە دروست دەکات کە وا لەوەی تۆ دەکات تەنها وەک تەویلەیەک دەربکەوێت. چی ڕوودەدات؟ فشاری خوێنت بەرز

١١- پارادۆکس: دژ یاخود پێچەوانە.

دەبێتەوە و ڕێژەی ڕازیبوونت لە ژیان دادەتەپێت- هەرچەندە هێشتا ژیانێکی زۆر باشیش دەگوزەرێنیت.

پارە ڕێژەییە. نەک تەنها بە بەراورد بە کەسانی دیکە، بەڵکو بە بەراورد بە ڕابردووی خۆشت. ئەگەر لەنیوەی یەکەمی کارەکەتدا لە ماوەی ساڵێکدا ٥٠,٠٠٠ دۆلارت بەدەستهێناوە و ئەمڕۆ ٧٥,٠٠٠ بەدەستدەهێنیت، ئەوا دڵخۆشتر دەبیت لەو کاتەی ئەگەر یەکەمجار ٧٥,٠٠٠ دۆلارت بەدەستبهێنایە، ئێستاش ٦٠,٠٠٠ دۆلار. ئەمە سەرەڕای ئەو حەقیقەتەی دوای تێکڕاکردنی ژمارەکان، سەرەڕای هەر هەموو شتێک سیناریۆی دووەم بۆت باشترە.

با بەڕوونی بیڵێین، ئاستی سامانەکەت- لەسەرو هێڵی هەژارییەوە بێت- بەشێوەیەکی بنچینەیی بابەتی لێکدانەوەیە. بەڵام ئەمە هەواڵە خۆشەکەیە، واتا ئەوە دەکەوێتەوە سەر خۆت کە ئاخۆ پارە دڵخۆشت دەکات یان نا.

لێرەدا چەند یاسایەکی کەمی باش هەیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پارەدا. یەکەمیان لە لایەن چەند کەسایەتییەکی زمانەوانی سەرکێشەوە ئەم زاراوەیـەی بۆ داتاشراوە پارە بە نەفرەت بێت، بە ئاماژەکردن بۆ دوو وشەی کۆتایی- لە هەمووکات زیاتر واخەملێنراوە- پێش ئەوەی وەک ڕەشەبا لە دەرگای دیدەنگەکە بچیتە دەرەوە بەسەر بەڕێوبەرەکەتدا دەشیرێنیت. لەبنەڕەتدا، پارە بە نەفرەت بێت ئاماژە بۆ ئەو ڕزگارکردنە دەکات کە ڕێگەت دەدات هەر لەو چرکە ساتەی سەرنجتدا، واز لە کارەکەت بهێنیت، بەبێ ئەوەی لە کۆتاییدا بگەیت بە بارێکی دارایی زۆر سەخت. بابڵێین موچەی ساڵێک. پارە بە نەفرەت

بیت ئازادییە. تەنانەت لە سەربەخۆیی ماددیش گرنگتر -پارە بە نەفرەت بیت-ە کە ڕێگات دەدات بەشێوەیەکی بابەتی ببینیت و بیر بکەیتەوە. کەواتە ئەگەر هێشتا لە ڕێگەی -پارە بە نەفرەت بیت-ەوە خۆت ڕزگار نەکردووە، ئەوا بەردەوام بە لە خەرجییە نزمە جێگیرەکانت. تا گەڕان و چوونەدەرەوەکانت کەم بکەیتەوە، خێراتر دەگەیت بە ئامانجەکەت. لە هەر حاڵەتێکدا بێت، هەستێکی خۆشە پارەت هەبێت و بێ ئەوەی زۆریشی لێ خەرج بکەیت.

دوو: کاردانەوەت بۆ ئەو لەرزین و گۆڕانانەی لە داهات و سامانەکەتدا ڕوودەدات نەبێت. ئایا ئەمڕۆ بەهای -پۆڕتفۆلیۆکەت- لە سەدا یەک بەرز بووەتەوە یان دابەزیوە؟ مەهێڵە ئەوە نیگەرانت بکات. هەر لە بنەڕەتەوە، زۆر بیر لە پارە مەکەرەوە. ئەگەر زیاتر بیر لە پارە بکەیتەوە، ئەوا خێراتر بۆت چەند هێندە ناکات.

سێ: خۆت بە سەرمایەدارەکان بەراورد مەکە. ئەوە دڵتەنگت دەکات. ئەگەر هەر پێویست بێت خۆت بەراورد بکەیت، ئەوا خۆت لەگەڵ ئەوانەدا بەراورد بکە کە پارەیان کەمترە- بەڵام وا باشترە هەر بە هیچ شێوەیەک خۆت بەراورد نەکەیت.

چوار: ئەگەر ئەوەندە دەوڵەمەندیت لێتدەڕژێت، ئەوا هەر بە خاکەڕاییانە بژی. سامان خەڵک توشی ئیرەیی دەکات. هەر کەسێک پارەی کاشی تەواوی هەبێت دەتوانێت یەختێکی جوان و نایاب بکڕێت- ئەوە هیچ بەهرەیەکی تێدا نییە. ئەگەر ملیاردێرێکیت، ئەوا وا سەرنجڕاکێشترە نەیکڕیت، بۆ ئەوەی خاکەڕاییانە بژیت. بەشێوەیەکی بنەڕەتی، هەر ئەوەندەی هێڵی هەژاریت لە دوای خۆتەوە بەجێهێشت

و تورێکی ئابووری سەلامەتیت دروست کرد، ئەوا پارە لە ناو ئەو هۆکارانەدا نییە کە بەردێک بخاتە سەر ژیانێکی باش. کەواتە لە جیاتی کۆکردنەوەی پارە ئیش لەسەر هۆکارەکانی تر بکە. وەک لە کۆتا بەش دا دەیبینین، سەرکەوتنی ڕاستەقینە هەموو شتێکە، پارە نەبێت.

١٤

## بازنەی پێشبڕکێ
## بۆچی گرنگە سنورەکانی خۆت بزانیت

هیچ کەسێک بەتەواوی لە دونیا تێناگات. زۆر لەوە ئاڵۆزترە لە مێشکی یەک تاقە مرۆڤدا جێگەی ببێتەوە. تەنانەت ئەگەر کەسێکی باڵا و ڕۆشنبیریش بیت، تەنها دەتوانیت لە یەک بەشی بچووکی تێبگەیت. هێشتا، ئەوە شتێکە- ئەم پارچە بچکۆلەیە دەرچەیەکی هەڵهاتنە پێویستتە بۆ ئەوەی لێوەی هەڵبێیت، ئەوەی پێویستتە بیکەیت ئەوەیە خەونە بەرزەفڕەکانت بەدەستبهێنیت. ئەگەر خەونێکت نەبێت، ئەوا هەرگیز لە زەوی جودا نابیتەوە.

وارن بەفێت زاراوەیەکی ناوازەی بۆ بەکاردەهێنێت بازنەی پێشبڕکێ. لە ناو ئەو بازنەیەدا ئەو بەهرانە هەن کە تۆ تێیدا باڵایت. لە پشت ئەوەوە ئەو شتانە هەن کە تەنها بەشێوەیەک لێیتێدەگەیت نەک هەمووی. دروشمی ژیانی بەفێت" بازنەی پێشبڕکێ-کەت بزانە، لەناویدا بمێنەرەوە. قەبارەی بازنەکە زۆر گرنگ نییە، بەڵام زانینی سنورەکانی گرنگە." چارلی مەنگەر ئەوەی بۆ دەخاتە سەر

و دەڵێت" هەر یەکێک لە ئێوە دەبێت تواناکانی بدۆزێتەوە کە لەکوێدان. بەڵام ئەگەر هەوڵبدەیت لەو شتانەدا سەرکەوتووبیت کە خراپتریینیت، ئەوا ئیتر کارێکی زۆر خراپت دەبێت. دەتوانم گرەنتی بکەم." تۆم واتسۆن کەسێکی زیندووە و سەلمێنەری ئەم تیزەیە. خۆشی گووتوویەتی" من بلیمەت نیم. من لە چەند خاڵێکدا زیرەکم- بەڵام لەناو ئەو خاڵآنەدا دەمێنمەوە."

لە ڕێکخستنی ژیانت دا لە دەوری ئەم بیرۆکەیە ورد بە، چونکە تەرکیزێکی توندت لەسەر بازنەی پێشبڕکێ لە میوەی پارەدار زیاتر شت لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت. بەشێوەیەکی یەکسانیش جیاوازی جۆرایەتی هەستەکانیش گرنگە. ئەوا تۆ هەستێکی بەهانەپێوراو لە باڵایی بەدەستدەهێنیت و چوست و چالاکتر دەبیت، چونکە هەموو جارێک پێویست ناکات بڕیار بدەیت ئەرکێک قبوڵ بکەیت یاخود ڕەتیبکەیتەوە. بە شێوەیەکی ورد و درشت ڕوونکردنەوەی بازنەی پێشبڕکێ، داواکارییە نەگونجاوەکان، بەڵام بەرلێنەگیراوەکان لە ناکاو دەبێت بە بەرلێگیراو.

بەشێوەیەکی گرنگ، هەرگیز نابێت پێ بنێیتە دەرەوەی -بازنەی پێشبڕکێ-کەت. چەند ساڵێک لەمەو پێش قۆنتەراتچییەکی دەوڵەمەند یەک ملیۆن یۆرۆی خستە بەردەستم بۆ ئەوەی بایۆگرافییەکەی بۆ بنوسم. ئەوە پێشنیارێکی زۆر سەرنجڕاکێش بوو. ڕەتم کردەوە. بایۆگرافیا لە دەرەوەی - بازنەی پێشبڕکێ-ی مندایە. بایۆگرافییەکی نایاب پێویستی بە دونیایەک گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەی وردە. ئەوە جگە لەو بەهرانەی بۆ ڕۆمان و بابەتە ناخەیاڵییەکان پێویستن، پێویستی

بە بەهرەی دیکەیە کە من نیمە. منیش سوکانی خۆم سوڕاندووە و تورە بووم و لە هەمووشی گرنگتر لەوپەڕی هەوڵی خۆمدا کتێبێکی مامناوەندیم نوسیوە.

لە کتێبە زۆر لە مامناوەند باشترەکەیدا -زیرەکی قوربانیدان- دیلان ئیڤانس وەسفی یاریزانێکی پرۆفیشناڵی تاوڵە دەکات بە ناوی -جەی پی-" ئەو یاریزانە چەند هەڵەیەکی کەمی بە مەبەست دەکرد بۆ ئەوەی بزانێت چەند چاک بەرامبەرەکەی ئەو هەڵە دەقۆزێتەوە. ئەگەر بەرامبەرەکەی یاری باش بکردایە، ئەوا جەی پی لە یاریکردن دەوەستا. بەو شێوەیە، ئەوا پارەیەکی باشی نەدەخستە ئاوەوە. بە دەربڕینێکی تر جەی پی شتێکی دەزانی کە زۆربەی قومارچییەکان نایزانن: ئەو دەیزانی کە چ کات گرەو نەکات." دەیزانی کام ڕکابەرە بە پاڵ لە -بازنەی پێشبڕکێ-کەی دەیکاتە دەرەوە و ئەویش فێربوو خۆیان لێ لابدات.

بە تەریبی لەگەڵ پاڵنەری هەنگاونانە دەرەوەی - بازنەی پێشبڕکێ-کەت ئەوا بەو ڕادەیە یەکسان پاڵنەرێکی دیکە هەیە ئەویش فراوانکردنیەتی. ئەم پاڵنەر و خولیایە بەتایبەتی لە یەک کاتدا نایابە، ئەگەر لە بازنە هەنوکەییەکەتدا سەرکەوتوو بیت، ئەگەر بەتەواوی لەوێدا ئاسوودە بیت. بەرگری لێبکە. بەهرەکان لە گۆڕەپانێکەوە ناگوازرێنەوە بۆ گۆڕەپانێکی تر. بە دەربڕینێکی تر، بەهرەکان -بواری تایبەت-ی خۆیان هەیە. یاریزانێکی باڵای شەترەنج ئۆتۆماتیکی نابێت بە ستراتیژ داڕێژەرێکی نایابی بازرگانی پزیشکێکی نەشتەرگەری دڵ بە ئۆتۆماتیکی نابێت بە بەڕێوبەرێکی

نەخۆشخانەیەکی چاک. دەلاڵێکی بازرگانی نابێت ئۆتۆماتیکی نابێت بە سەرۆکێکی باش.

کەواتە چۆن - بازنەی پێشبڕکێ-ی خۆت دروست دەکەیت؟ لە ویکیپیدیا گەڕان بەدوایدا بەس نییە. شێوازێکی کۆنیش نییە لە هەمان کاتدا. کات دەبات، کاتێکی زۆریش دەبات. یەکێک لە یاساکان کە دیزاینەری ئەمریکی دێبی میلمان دەیبەستێتەوە بە سەرکەوتنی گەورەوە ئەوەیە کە" پێشبینی هەر شتێک بکە کە شایستەی ئەوە بێت ماوەیەکی زۆر درێژ ببات."

ئەوە خولیاشی دەبات، خولیا جۆرێکە لە ئالودەبوون، هەر لەبەر ئەوەشە زۆرجار بە سوکایەتییەوە قسەی لە بارەوە دەکرێت. لە بارەی ئەو گەنجانەوە دەخوێنینەوە کە ئالودەی یارییە ئەلیکترۆنییەکان، زنجیرە تەلەفزیۆنییەکان، مۆدێلی فڕۆکەکان دەبن. ئێستا کاتی ئەوەیە کە ئێمە چوارچێوەیەکی ئەرێنیمان بۆ خولیاکان کێشا. خولیا وا لە خەڵکی دەکات هەزاران کاتژمێر لە یەک شتدا وەبەربهێنێت. بیل گەیتس لە تەمەنی لاوێتیدا خولیایەکی هەبوو ئەویش: پڕۆگرامینگ بوو. ستیڤ جۆب: خۆشنوسی و نەخشەسازی. وارن بەفێت یەکەم جار پارەی گیرفانی خستە پاکەتێکەوە و لە تەمەنی دوانزەساڵی دا دای بە کەسانی دیکە تا بەکاری بهێنن، لەو کات بەدواوە ئالودەی وەبەرهێنان بوو. ئەمڕۆ هیچ کەس ناڵێت کە بیل گەیتس، وارن بەفێت، ستیڤ جۆب گەنجێتی خۆیان بەفیڕۆ داوە. تەواو بەپێچەوانەوە: لەبەر ئەوەیە کە ئەوان زۆر خولیای شتێکیان هەبووە، بە ڕادەیەک کە هەزاران کاتژمێریان وەبەرهێنا بۆ

ئەوەی باڵابوون لە شتێکدا بەدەست بهێنن. خولیابوون مەکینەیەکە، نەک مەکینەی شکستپێهێنان.

بەهەر حاڵ، پێچەوانەی خولیا ڕقلێبوونەوە نییە، بەڵکو "سەرنجڕاکێشان" – شێوازێکی یەکسانە کە بە ڕەوشتەوە بڵێیت" لە ڕاستیدا ئەوە سەرنجی من ڕاناکێشێت."

بۆچی بازنەی پێشبڕکێ بیرۆکەیەکی هێندە بەهێزە؟ نهێنییەکەی چییە؟ ئاسانە. پڕۆگرامدانەرێکی مەزن نە دوو هێندە نە سێ هێندە، تەنانەت نە دە هێندەی پڕۆگرامدانەرێکی باش بەهرەدار نییە، پڕۆگرامدانەرێکی نایاب هەمان کێشە بە یەک لەسەر هەزاری ئەو کاتە چارەسەر دەکات کە پڕۆگرامدانەرێکی دیکە تەنها "باش" بوو پێیدەچێت. هەمان شت بۆ پارێزەرەکان، پزیشکانی نەشتەرگەری، دیزاینەرەکان، لێکۆڵەرەوەکان، کەسانی فرۆشیار ڕاستە. لە ناوەوە بەپێچەوانەی دەرەوەی بازنەی پێشبڕکێ- ئێمە باسی جیاوازییە هەزاربارەکان دەکەین.

لێرەدا شتێکی دیکە هەیە: ئەو بیرۆکەیەی کە دەتوانیت ژیان بە نەخشەیەکەوە وابەستە بکەیت وەهمە (بەشی دووەم). بەخت دەتوانێت بەخێرایی بە ناو هەموو شتێکدا گوزەر بکات، هەندێک جار بەخێرایی زریان. تەنها یەک شوێن هەیە کە زریانەکە بۆ شەماڵێکی فێنک هێواش ببێتەوە، ئەویش ناو -بازنەی پێشبڕکێ-کەتە. تەنانەت ڕەنگە بە ئاسانیش بۆت نەدۆزرێتەوە لەوێدا دەریاڕەوی بکەیت، وەلێ لانیکەم شەپۆلەکان واتلێدەکەن بەشێوەیەکی دروست ئاراستەی خۆت بدۆزیتەوە. بە زاراوەیەکی سادەتر، لە ناو -بازنەی

پێشبڕکێ-کەت دا لە دژی وەهم و هەڵەکان تا ڕادەی دڵنیایی پارێزراویت. تەنانەت قوربانی ئەوەش دەدەیت واز لە نەریتەکانت بهێنیت، چونکە تۆ بەپێی پێویست بارودۆخی هەنوکەییت ڕێکخراوە و بەنزیکەییش دەتوانیت پێشبینی بکەیت کە لەوانەیە چی ڕووبدات.

سەرەنجام؟ دەست لە سەرزەنشتکردنی خۆت هەڵگرە بەهۆی کەمتواناییەکانتەوە. ئەگەر هەردوو قاچت ماون، واز لەوانەکانی فێربوونی سەما بهێنە. ئەگەر منداڵەکانت ناتوانن پێتبڵێن کە ئەو نوسینە شەڕە پشیلەیە قەرارە ئەسپ بێت یان مانگا، ئەوا واز لە خەونی بوون بە هونەرمەند بهێنە. ئەگەر بە ئاستەم دەتوانیت لەگەڵ سەردانێکی پورت دا هەڵبکەیت، ئەوا واز بیرۆکەی کردنەوەی دەرگای ڕیستۆرانتی خۆت بهێنە. ڕاستییەکە ئەوەیە کە ئەوەی تۆ لە چەند بواردا لە ئاستی مامناوەند دایت یان لە خوار مامناوەندەوەیت ئەوە بەتەواوی بابەتێکی ناپەیوەستە. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە لانیکەم تۆ لە یەک بواردا زۆر لەسەر مامناوەندەوەیت- بەشێوەیەکی نمونەیی، باشترینیت لەدونیادا. هەر ئەوە چارەسەر بوو، ئەوا تۆ بنچینەیەکی توندت بۆ ژیانێکی باش هەیە. یەک تاقە بەهرەی بەرچاو هەزاران بەهرەی مامناوەند دەکوتێتەوە. هەر کاتژمێرێک کە لە ناو -بازنەی پێشبڕکێ-ی خۆتدا سوودی لێوەردەگریت لە هەزار کاتژمێری تر کە لە شوێنێکی دیکە بە هەدەری دەدەیت بەنرختره.

## ١٥

## نهێنی بەردەوامی
## بۆچی بێزارەکان لە سەرکێشەکان سەرکەوتووترن.

مامەڵەکارەکان- قۆپچەی ملوانەکانیان دانەخراوە، قۆڵی کراسەکانیان هەڵکراوە- لە یەک کات دا بە چەندین تەلەفۆن هاوار دەکەن، وای نیشان دەدەن وەک ئەوەی ژیانیان لە مەترسیدا بێت. هەوا لە گەرمادا قرچەی دێت. ناوە ناوە ئێستا و دواتر یەکێکتان تەلەفۆنەکە هێندە توند دادەخاتەوە وەک ئەوەی بیەوێت بیشکێنێت. دواتر بازرگانەکان بەدیار کۆمپیتەرە -بلومبێرگ[١٢]-ەکانیانەوە دەست بە هاوارکردن بەسەر یەکدا دەکەن، کە تێیدا نرخی هێلکارییەکان وەک فیشەکە شێتە دەردەپەڕێت. بەم شێوەیە میدیا پەسنی دونیای ئابووری دەکات، وێنەی بەشی کڕینی پشک و بازرگانی لە بانکەکان دا دەخاتە ڕوو.

---

١٢-کۆمپیوتەری بلومبێرگ: جۆرە کۆمپیوتەرێکە کە سیستەمی بەڕێوەبردنی ئەم کۆمپیوتەرە لەلایەت کۆمپانیای -بلومبێرگ-ەوە بەڕێوەدەبرێت و تێیدا نرخ و بەهای دراوە جیهانییەکان و گۆڕاوە جیهانییەکان پیشان دەدات, بەشداربوو دەتوانێت ڕاستەوخۆ گۆڕانکارییەکان ببینێت.

دیمەنەکە دەگۆڕێت. دیدەنگەیەکی پۆخلی نهۆمی چواردەیەمی باڵەخانەیەک کە هێندە بەرزە هەر بە خەیاڵدا نایات لە شاری بێدەنگی ئۆماها، نیبراسکا. بێبایەخترین ویلایەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. نە هیچ کۆمپیوتەرێکی -بلومبێرگ-، نە هیچ کۆمپیوتەرێک، نە هیچ ئیمەیلێک. تەنها مێزێکی کۆن و تەلەفۆنێک. ئەو کەسەی لەوێ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دادەنیشێت و نزیکەی پانزە ساڵیشە لەوێ دانیشتووە: -وارن بەفێت-ە سەرکەوتووترین وەبەرهێنە تا ئێستا.

پێچەوانەکەشی ناکرێت ناخۆشتر بێت. لە سەرێکەوە: مامەڵەکارەکان زیاد لە پێویست چالاک، شەلالهاتوو لە ئارەقدا، هۆرمۆنی نێرینەیان زیاد لە پێویست دەردراوە. لە سەرێکی ترەوە: مامە وارن کەسێکی بێدەنگ و قژ ماش و برنجییە. هەر ئەوەندە کە جیاوازی نێوان وەبەرهێنان کڕین-کڕینی پشک، کەلوپەل-ت بۆ دەرکەوت، ئەوا لە هەموو شوێنێکدا دەست بە بینینی ئەو هێڵە تەریبە دەکەیت- ئەوا دەبیت بە خاوەنی ئامێرێکی زیهنی باشیش بۆئەوەی کاری پێبکەیت.

کەواتە بەردروستی جیاوازییەکەیان چییە؟ مامەڵەکارەکان هەوڵدەدەن هەڵپەبکەن لە کڕین و فرۆشتنی پشکەکاندا بۆ ئەوەی سودێک بەدەست بهێنن. ئەوەی لە پشت ئەو پشکانەوە هەیە- کۆمپانیایەکی سۆفتوێر لە کالیفۆڕنیا، کانێکی مس لە پیرۆ- گرنگ نین. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە بەهای پشکەکان بەشێوەیەکی کاتی بە ئاراستە دروستەکەدا بجولێت.

هەرچەندە وەبەرهێنە کۆنەکان، تەنها لە چەند کۆمپانیایەکی دیاریکراو پشک دەکڕن کە وەک ناوی خۆیان دەیزانن. بیرۆکەی بازار بەلای ئەوانەوە هیچ نییە. ئەرکی ئەوان ماوە درێژە. بۆ ئەوەی خۆیان لە تێچووی بەڵێننامەکان بپارێزن، چەند بۆیان بگونجێت پشک دەکڕن و دەفرۆشن. بەفێت و چارلی مەنگەر تەنانەت خۆشیان ناگەڕێن تا هەلی وەبەرهێنانی نوێ بدۆزنەوە. ئەوان چاوەڕێ دەکەن تا هەلەکان خۆیان بەرەو ڕوویان بێن. ڕێک لە دەمی خۆیانەوە" من و چارلی هەر لێرەدا دەدەنیشین و چاوەڕێی تەلەفۆنەکەین زەنگ لێبدات."

کێ سەرکەوتووترە- مامەڵەکارەکان یان وەبەرهێنەکان؟ لە هەردوو لادا براوە و دۆڕاو هەبوو، بەڵام براوە گەورەکان تەنها لەناو براوەکاندا دەبینرێنەوە. ئەوە بۆچی وایە؟ جیاوازییەکی سەنتەری: وەبەرهێنەکان سوود لە بابەتی ماوەدرێژ دەبینن، بەڵام مامەڵەکارەکان ئەوە ناکەن.

مێشکی ئێمە حەزی لە شتی ماوە کورتە، گەشەی لە ناکاو. زیادەڕەوانە کاردانەوەمان بۆ بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەکان، بۆ گۆڕانە خێراکان و هەواڵە ڕاچڵەکێنەکان هەیە، بەڵام بەئاستەم سەرنجی گۆڕانکارییە بەردەوامەکان دەدەین. سەرەنجام، بەشێوەیەکی سیستماتیکی زیاد لەپێویست لە جیاتی تێبینی نوسین جەخت لەسەر کارکردن، لەجیاتی وریابوون جەخت لەسەر جەزبەگرتن، لەجیاتی چاوەڕێ بوونیش جەخت لەسەر هەڵپەکردن دەکەینەوە.

پڕفرۆشترینی هەموو کتێبەکان کامەیە؟ ئەوانە نا کە هەنووکە لە

لیستی پڕفرۆشەکاندان یاخود لەسەر بەرزترین ڕەفەی کتێبفرۆشەکان دانراون. مەبەستم ئەو کتێبانەیە کە بە بەردەوامی بۆ ماوەی چەندین دەیە و تەنانەت سەدەش چاپ دەکرێنەوە- ئینجیل، کتێبە بچووکە سوورەکەی ماوتسی تۆنگ، قورئان، مانیفیستی کۆمۆنیزم، خودای زنجیرەکان، شازادە بچووکەکە. ئەوانە بە " پڕفرۆشی ماوەدرێژ" ناسراون، هیچ ناوەندێکی چاکردنیش ناتوانێت بێ ئەوانە بەردەوام بێت. هەمان شت بۆ سینەما و هۆڵی شانۆکان، ئەو شوێنانەی سەرنجی گەشتیاران ڕادەکێشن، گۆرانی و چەندین بەرهەمی دیکەش ڕاستە. کامە سەرکەوتووترین ئۆتۆمۆبێلی هەموو سەردەمەکانە؟ تۆیۆتا کۆرۆلا لە ساڵی ١٩٦٦ەوە ، بەشێوەیەکی بەردەوام و نوێ هەمیشە بەردەستە، ئێستا نەوەی نوێیەمی کەوتۆتە بازارەوە. ئەوە خولی ساڵی یەکەم نەبوو کە -کۆرۆلا-ی کرد بە ئەستێرەیەکی درەوشاوە، بەڵکو تێپەڕینی ئەو ماوەیەی تێیدا فرۆشتووە وای لە ئۆتۆمۆبێلی کۆرۆلا کردووە.

ئەو سەرکەوتنە ماوە درێژە زۆرجار پێکهاتەیەکی نادیارە کە ئەرکەکەی وەک خومرە وایە، ئەمە دەبێتە هۆی زیادبوونی بەردەوام لە پڕۆسەکەدا کە لە ماوەیەکی دوورودرێژدا بونیادنراوە. نمونەیەکی وەبەرهێنان وەربگرە: ئەگەر ١٠,٠٠٠ دۆلار وەبەربهێنیت بۆ ئەوەی لە سەدا پێنجت بۆ بگەڕێتەوە، ئەوا دوای ساڵێک ٥٠٠ دۆلار دەوڵەمەندتر دەبیت. کارێکی زۆر ئاسانە. بەڵام ئەگەر ساڵانە بەردەوام بیت لە وەبەرهێنانی ئەو ڕێژە سوودە کەمە، ئەوا دوای دە ساڵ سەرمایەیەک بەدەستدەهێنیت بە بڕی ١٦,٠٠٠ دۆلار، ئەوا دوای بیست ساڵ زۆر

سەرنجراکێش دەبێت، ٢٦,٠٠٠ دۆلار، دوای پەنجا سالیش ئەوا بڕێکی نایاب دەبێت کە ١١٥,٠٠٠دۆلار دەبێت. سەرمایەکەت بەشێوەیەکی ماوەدرێژ زیاد دەکات، بەڵام چەند هێندەیی. چونکە مێشکی ئێمە هیچ مەیلێکی بۆ مەوداکان نییە. هەروەها هیچ هەستێکیان بۆ گەشەکردنی چەندهێندەیی ماوەدرێژ نییە.

هەر ئەمەیە نهێنی بەردەوامی: سەرکەوتنە ماوەدرێژەکان وەک دروستکردنی کێک وایە بە خومرە. پرۆسەیەکی هێواش و بێزارکەر و ماوەدرێژە کە دەتبات بەرەو باشترین دەرەنجام. هەمان شتیش لە ژیانتدا ڕاستە.

بۆ ماوەی یەک سەدە کە تێیدا چالاکی، پیشەسازی و جەزبەگرتن وەک ئەوانەی خۆمان زۆر جێگای دڵخۆشی بوون. ئایینی نوێی "دابڕان" ئەوەمان لێدەخوازێت کە بەردەوام پیشەکانمان، پەیوەندییەکانمان، ژیانمان لە بناغەوە بڕوخێنین و دووبارە بونیادیان بنێینەوە. دەڵێت کە تەنها لە ڕێگەی کردنی ئەوەوە کە هەمووان لەسەری کۆکن، لە ململانێکەدا دەمێنینەوە. بە هەمان شێوە چەندین کەس باوەڕیان بەوە هێناوە بۆئەوەی ژیانێک باش بێت، ئەوا دەبێت یەک هێلی دیاری پڕ لە سەرکێشی، گەشتکردن، شوێنگواستنەوە هەبێت. من باوەڕم وایە پێچەوانەکەی ئەسڵی بابەتەکەیە. تا ژیان ئارامتر بێت، بەرهەمدارتر دەبێت. براتند ڕەسێل کە لەتەمەنێکی زۆر تەواو ئارامانەتردا دەژیا، هاوڕابوو "نیوەی ژیانی پیاوە گەورەکان چەند ماوەیەکی کەمی مەزن نەبێت، لە جۆشوخرۆش دا نەبوون. سۆکرات ناو بە ناو چێژی ژەمێک نانخواردن دەبینی...بەڵام زۆربەی ژیانی لەگەڵ خانتهیپی بەسەر برد،

دوانیوەڕوان پیاسەیەکی دەکرد، یان ڕەنگە جار جار چەند هاوڕێیەکی ببینیایە. دەگووترێت کە ئیمانوێل کانت هەرگیز لە ژیانیدا دە میل لە کۆنیگسبێرگ دوور نەکەوتۆتەوە. چارلس داروورین، دوای ئەوەی بە دەوری جیهاندا گەڕا، تەواوی ئەو ژیانەی مابووی لە ماڵەکەی خۆیدا بەسەری برد. هەموو ئەمانە دەکرێت بەو شێوەیە وەربگیرێن کە ژیانێکی ئارام تایبەتمەندی پیاوە مەزنەکانە و خۆشییەکانیشیان ئەگەر بە چاوێکی ڕووکەشییەوە سەیریان بکەین لەوجۆرە نییە کە جۆشوخرۆشهێن بێت." بەدڵنیاییەوە هەمان شت بۆ کەسایەتییە مێینەکانی مێژووش هەر ڕاستە. هاوپەیوەندییەکی ئەرێنی لەنێوان دەنگی گڕ و بیرۆکەی باش دا، لە نێوان بێئارامی و وردبوونەوەدا، چالاکی و دەرەنجامەکاندا، بە ئاستەم دەدۆزرێتەوە.

کەواتە ئەمە چ مانایەکی هەیە بۆ ژیانێکی باش؟ کەمی سەرقاڵی لەکاردا، ئارامی زیاتر. هەر ئەوەندە بازنەی پێشبڕکێی خۆتت ناسی (سەیری بەشی چواردە بکە)، بۆ ماوەی چەند درێژ دەکرێت پێوەی وابەست ببە. هەمان شتیش ڕاستە ئەگەر هاوژینێکی باش، شوێنێکی گونجاو بۆ ژیان، یاخود خولیایەکی شایستە. کۆڵنەدان، دەستبەردارنەبوون، بیرکردنەوەی دوور مەودا تا ئاستێکی باڵا بایەخدارن، کەچی هێشتا وەک چاکە و خووی باڵای هەژمار ناکرێن. دەبێت دووبارە دەست بە گەشەپێدانیان بکەینەوە. وەک چارلی مەنگەر دەڵێت" پێویست ناکات بلیمەت بیت، تەنها بۆ ماوەیەکی درێژ درێژ، لە کەسانی تر- کەسە مامناوەندەکان- کەمێک داناتر بە."

١٦

## ستەمی کار

## ئەوەی دەتوانیت بیکە، نەک خۆزگە بخوازیت بتتوانیایە

ئەنتۆنی لە ساڵی ٢٥١.ز دا لەدایکبووە، کوڕی خاوەن زەوییەکی دەوڵەمەند بوو لە میسر. کاتێک تەمەنی بوو بە هەژدە ساڵ دایک و باوکی مردن، لە کڵێساش گوێی لەم وشانە بوو کە لە ئینجیلی –مەتا-دا بیست" ئەگەر دەتەوێت بێخەوش بیت، برۆ ئەوەی هەتە بیفرۆشە، بیبەخشە بە هەژارەکان، ئینجا دەبیت بە خاوەنی گەنجینەکانی بەهەشت: ئینجا وەرە و شوێنم بکەوە." بۆیە ئەنتۆنی ڕۆیشت و هەموو کەلوپەلە دونیاییەکانی فرۆشت تا بڕوات بە کەنارەکانی بیاباندا بگەڕێت و هەر لەوێدا وەک سۆفی بۆ چەندین ساڵ ژیا. بە تێپەڕبوونی کات، کەسانی دیکەش شوێنی کەوتن. ژمارەیان بەردەوام گەشەی دەکرد و گەشەی دەکرد- کۆمەڵەکەی پێکهاتبوو لەو کوڕە گەنجانەی سەرنجی بانگکردنەکەی خودایان دابوو. گروپێک لە ڕەبەنە مەبدەئییە شلوشێواوەکان بوون کە ب

جیاجیا دەژیـان، کە کرۆکی ڕەبەنابەتی مەسیحییەتییان پێکهێنا، ئەمڕۆش ئەنتۆنی وەک باوکی ڕەبەنەکان ناسراوە.

هەزار ساڵ دواتر، هەمان شت بەسەر کوڕی کوتاڵفرۆشێکی دەوڵـەمـەنـدی ئیتاڵی هـات. فرانسیس ئاسیسی ژیانێکی پڕ لە بەدڕەوشتی دەژیـا، تا ئـەو کاتەی گوێی لێبوو خـودا لە خـەودا بانگی کرد. هەموو ئەوەی هەیبوو بەخشی، جلەکانی بەخشی بە دەرۆزەکـەرو و ئـەوانـەی وەک ڕەبـەن دەژیـان و کەنیسەکانیان ئـاوەدان دەکـردەوە. وردە وردە خەڵکانی دیکەی بە لای خۆیدا کەمەندکێش کرد و ئەویش ڕێبازی -فرانسیسکان-ی، دامەزراند.

کاتێک ئێمە ئەمڕۆ گوێمان لە وشەی "بانگکردن" دەبێت، ئەوا بیر لە کەسانی وەک ئەنتۆنی و فرانسیس ئاسیسی دەکەینەوە. ئەوان هیچیان لە دەست نەدەهات ئەوە نەبێت کە شوێن بانگەوازی خودا بکەون. هەمان چرکەسات لە ژیانی پاوڵ، ئۆگەستین، بلەیس پاسکاڵ و ئەوانەی دیکەش کە باوەڕیان بۆ گۆڕا بۆ هاتنە ناو ئینجیل و تەنانەت تێپەڕاندنیشی.

لـە هـەمـان کـاتـدا هـەرچـەنـدە "بـانـگـکـردن" ئـاگـادارییـەکی یەکلاکەرەوەی هاوچەرخی هەیە. یەکێک لەو پرسیارانەی ئەمڕۆ لە زۆربـەی گەنجانەوە گوێملێدەبێت ئەوەیە کە " چۆن بتوانم بانگکردنی خۆم بدۆزمەوە؟" هەموو جارێک دەبێت گازێک لە زمانم بگرم، چونکە "بانگکردن" نەریتێکی مەسیحییەتە. بۆ ئەو کەسانەی بڕوایان بە خودا نییە، زاراوەکە بەجۆرێک بە جارەکان وەک ئەفسانە دەردەکەوێت.

بەدڵنیاییەوە ئەو کەسانەی ئێستا بەدوای "بانگکردن"دا، دەگەڕێن بە ئاشکرا حەزیان لە ڕەتکردنەوەی بەرژەوەندییە دونیاییەکان نییە. بەپێچەوانەوە، ئەوان بۆ ئەوە دەگەڕێن زیاتر و لە نزیکترەوە لەگەڵ دونیادا دەست لە ملان بن، ئەوان زۆر ئەو بیرۆکە -ڕۆمانتیکییە-یان، خۆشدەوێت و پارێزگاری لێدەکەن کە دەڵێت لە قوڵایی ناخی هەر مرۆڤێک دا خونچەیەک هەیە دەیەوێت خونچە بکات و ببێت بە شتێکی نایاب. لەبەر ئەوەی ئەوان گرنگییەکی هێندە نزیک بە دەنگی ناخیان دەدەن-ئەوا هیوای ئەوە دەخوازن گوێیان لە بانگکردنێک بێت کە باسی تەواوکردنی چالاکییەک بکات. بەڵام ئەوە مەترسیدارە، چونکە چەمکی بانگکردن یەکێکە لە گەورەترین وەهمەکانی سەردەمی ئێمە.

جۆن کەنەدی تول[١٣] بەو چاوەوە سەیری خۆی دەکرد کە بۆ نوسین لەدایکبووە. کاتێک ئەو نوسەرە ئەمریکییە کاتێک دەستنوسی کتێبەکەی پێشکەش بە ناوەندی سیمۆن&شوستەر[١٤] کرد، باوەڕی وابوو کە ڕۆمانی سەدەی ناردووە بۆ چاپ. بەڵام سیمۆن& شوستەر نائومێدیان کرد، لە هەمان کاتدا هەموو ئەو چاپخانانەی دیکەشی کە تاقیکردەوە هەمان بەیت و بالۆر بوو. ئەو بیروباوەڕانەی لە

---

١٣- جۆن کەنەدی تول: ڕۆماننوسێکی ئەمریکییە لە 17ی دیسەمبەری 1937 لەدایکبووە و لە 23ی مارسی 1969 کۆچی دوایی کردووە. براوەی خەڵاتی پولیتزەر-یشە.

١٤-سیمۆن & شوستەر: ناوەندێکی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبە کە لە بەرواری 2ی کانوونی دووەمی ساڵی 1924 لە لایەن ڕیچارد سیمۆن و ماکس شوستەر دامەزراوە.

قوڵایی ناخیدا هەبوون لە بناغەوە لەرزین، جۆن کەنەدی تول ڕووی لە شەراب خواردنەوە کرد. شەش ساڵ دواتر و لە ساڵی ١٩٦٩ دا، لە بیلۆکسی، میسیسپی، سۆندەیەکی باخچەکەی لە ئەگزۆزی ئۆتۆمۆبێلەکەی خست و لە سەرەکەی تری ئۆتۆمۆبێلەوە بە دوکەڵ قانی دا، خۆی کوشت. دوای خۆکوشتنەکەی، لە کۆتاییدا دایکی هەوڵی دا ناوەندێکی چاپکردن بدۆزێتەوە کە دەستنوسی کتێبەکەی و پارتی گەمژەکان- کە ناوی کتێبەکەیە- لە ساڵی ١٩٨٠ دا چاپکرا، کەوتە بەر سەرنجی لێکدا لێکدای ڕەخنەگران وەک شاکارێکی ئەدەبی ئەمریکای لاتین ناوزەد کرا. تول دوای مردنی خۆی خەڵاتی پوڵیتزەری بۆ باشترین ڕۆمانی ساڵ پێبەخشرا. کتێبەکە زیاتر لە ١,٥ ملیۆن کۆپی لێفرۆشرا.

براتند ڕەسێل نوسی" یەکێک لە نیشانەکانی گەیشتن بە خەمۆکی قوڵ ئەوەیە کە باوەڕت وابێت کاری کەسێک بێئەندازە گرنگە." دروست ئەمە مەترسی بانگکردنە: تۆ خۆت کارەکە لە ئەستۆ دەگریت و کارەکەت زۆر جدییشە. ئەگەر، وەک جۆن کەنەدی تول، هەموو لۆدەکانی خۆت بخەیتە سەر ملی ئەو ئەرکەی قەرارە جێبەجێی بکەیت، ئەوا ناتوانیت ژیانێکی باش بژیت. ئەگەر تول وەک تاکە ئەرکی بانگکراوی خۆی نەکردایە، بەڵکو وەک پیشەیەک سەیری بکردایە کە بەڕێکەوت ئەو بەهرەیەکی تایبەتی تێدا هەیە، ڕەنگە کۆتاییەکەی بەو شێوەیە نەبووایە کە هەیبوو. بەدڵنیاییەوە دەتوانیت بەخۆشەویستییەوە دوای خولیایەک بکەویت، تەنانەت بە جۆرێک لە خوپێوەگرتنیشەوە، بەڵام تەرکیزت دەبێت هەمیشە

لەسەر چالاکییەکە، ئیشەکە، وزەبەخشینەکەت بێت، نەک لەسەر سەرکەوتن، دەرەنجام و دانەوەی کارەکە. باشترە بڵێیت" بەنیازم ئەمرۆ لانیکەم سێ لاپەڕە بنوسم"وەک لەوەی" دەبێت سبەینێ خەڵاتی نۆبڵ لە ئەدەبیات دا ببەمەوە."

ئەو بیرۆکەی ڕۆمانتیکییەی کە دەڵێت بانگکردن تۆ دڵخۆش دەکات هەڵەیە. ئەو کەسانەی هەڵپەیان لە شوێنکەوتنی پیشەکەیاندا دڵخۆش نین، ئەوان تەنها هەڵپە دەکەن- لەوانەشە هەر زوو خراپ توڕە ببن، چونکە لە تێڕوانین بۆ پێشبینییە ناواقیعییەکانەوە زۆربەی بانگرکردنەکان هێندە لە یەک نزیکن کە لە یەک جیانابنەوە. ئەگەر کردوتە بە ئەرک لەسەر خۆت ڕۆمانی سەدە بنوسیت و ڕیکۆردی جیهانی بشکێنیت، یان ئایینێکی نوێ دابمەزرێنیت، بە یەکجار و تاهەتایە کۆتایی بە هەژاری بهێنیت، ئەوا لە تریلیۆنێکدا یەک دەرفەتی ئەوەت هەیە ئامانجەکەت بەدەستبهێنیت. بە هەڵە لێم وەرمەگرە: ئاساییە ئامانجی باڵات هەبێت، بەڵام تەنها بەمەرجێک کە پەیوەندییەکی دوورەپەرێز و ئارامت لەگەڵیان هەبێت. ئەگەر کوێرانە دوای بانگکردنەکەت بکەویت، ئەوە ڕێنیشاندەرێکی دڵنیایانەیە بۆ ژیانێکی پڕ لە خەمباری.

بەهەڵەداچوونێکی پەیوەست بەم بابەتەوە هەڵبژاردنی لایەندارانەیە. ئێمە لە -بانگکردن-دا، تەنها نمونە سەرکەوتووەکان دەبینین: ماری کوری کە لە تەمەنی پانزە ساڵیدا بڕیاری دا ببێت بە زانا و دواتر دوو خەڵاتی نۆبلی بردەوە. یان پیکاسۆ کە لە تەمەنی دە ساڵیدا لە بەشی هونەر وەرگیرا و بەردەوام بوو تێیدا و تا شۆڕشی

له وێنەکێشاندا کرد. ئەم چیرۆکە ئیلهامبەخشانە بوون بە بابەتی چەندەها بایۆگرافی، چاوپێکەوتن، فیلمی دۆکۆمێنتاری. بەڵام ئەوەی ئێمە نایبینین کۆمەڵەیەکی تەواو گەورەتری شکستخواردووەکانە. ئەو زانا تورپانەی کە لێکۆڵینەوەکەیان دروست کرد دوو کەس خوێندییانەوە: خێزانەکەی و دایکی. یان ئەو پیانۆژەنە شرپشێتەی کە ئێستا دوای" بانگکردن"ەکەی، دەکەوێت و کە لە شوێنێکی بێکەڵکی شارۆچکەیەکدا خۆی کردووە بە مامۆستای مۆسیقا، هەرچەندە هیچ بەهرەیەکیشی لەوانەگوتنەوەدا نییە. لە ئەرکەکەیاندا دوای دەنگی بایەقوشەکەیان دەکەون، دواتر بەرەو لەبیرچوونەوە دەچن. کەچی هێشتا ڕاپۆرتی ڕۆژنامە خۆماڵییەکان هیچ لە بارەی ئەم کەسانەوە بڵاودەکەنەوە. بۆ دەبێت بڵاوی بکەنەوە؟

زۆرجار خەڵکی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە هیچ بژاردەیەکیان نییە، جگە لەوەی (س) بکەن. ڕەوانبێژییەکی ڕۆمانتیکی جوانە، بەڵام لە بنەڕەتەوە کارێکی بێمانایە. ڕاوچییەکان و کۆکەرەوەکان هیچ بژاردەیەکی دیکەیان نەبوو. کۆیلەیەکی میسر هیچ بژاردەیەکی دیکەی نەبوو. ژنە جوتیارێکی سەردەمی چاخەکانی ناوەڕاست بژاردەیەکی دیکەی نەبوو. بەڵام ئەگەر کەسێک لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا پێت بڵێت کە دەنگی ناوەوەی هیچ بژاردەیەکی بۆ بەجێنەهێشتووە جگە لەوەی ژیانی تەرخان بکات بۆ گیتارەکەی، ئەوا دەتوانیت بەدڵنیاییەوە ئەقڵانی ببیت و بڵێیت کە لانیکەم ئەقڵی کامڵ نەبووە.

تەنانەت ئەگەر شتێکی وەک بانگکردنی ڕاستەقینە هەبێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە جێگەی ئامۆژگاریکردن نییە داوای ئەوە بکەین کە ڕەنگە

بەدوای خۆیدا بیهێنێت. هاکەرەکان، تەڵەکەبازەکان، تیرۆریستەکانیش هەموو باوەڕیان وایە کە –بانگکردن-ەکەی، خۆیان دۆزیوەتەوە. بەکارەکەیان دڵخۆشن. بێگومان، ئەدۆڵف هیتلەر، ناپلیۆن بۆناپارت، ستالین و ئوسامە بنلادن-یش هەستیان بە هەمان شت کردووە. بەڕوونی بانگکردن هیچ گەرەنتی بۆ قیبلەنمایەکی مۆراڵی ناکات.

کەواتە چی بکەین؟ گوێ بۆ دەنگی ناخت مەگرە. بانگکردن هیچ نییە، جگە لەو پیشەیەی حەز دەکەیت هەتبێت. بە دەربڕینێکی ڕۆمانسی: بوونی نییە، تەنها بەهرە و خولیا بوونی هەیە. لەسەر ئەو بەهرانەی کە بەڕاستی هەتن بناغە هەڵبچنە، نەک لەسەر ئەو جۆرە ئەرکانەی لە پێشەوە باسکران. خۆشبەختانە، ئەو بەهرانەی تێیدا باڵاین زۆرجار ئەو شتانەن کە چێژ لە کردنیان وەردەگرین. گرنگییەکی لاوەکی: خەڵکانی دیکەش دەبێت بەهرەکانت بەرزبنرخێنن. تۆش هەرچۆنێک بێت دەبێت بەشی نانەسکیەکە پەیدا بکەیت. هەر وەک فەیلەسوفی ئینگلیزی جۆن گرەی بەو شێوەیە دەیخاتە ڕوو" چەند کەسێکی کەم هەن هێندەی ئەو کەسانە دڵتەنگ بن کە بەهرەیەکیان هەیە و کەسیش گرنگی پێنادات."

١٧

# زیندانی ناوبانگێکی باش

چۆن لە پاڵپشتی دەرەکییەوە ڕوو لە پاڵپشتی ناوەکی بکەین

تۆ کامیانت لا پەسەندە؟ ببیت بە ژیرترین کەس لەسەر زەوی، بەڵام بە گەمژەترین کەس حساب بکرێیت؟یاخود گەمژەترین کەس بیت، بەڵام وەک ژیرترین کەس حساب بکرێیت؟

کاتێک بۆب دیلان لە ساڵی ٢٠١٦ دا خەڵاتی نۆبڵی پێبەخشرا، تا ماوەی ژەند هەفتەیەک سووپاسنامەی بۆ ڕانەگەیاند. نە هیچ لیدوانێک، نە هیچ چاوپێکەوتنێک. تەنانەت وەڵامی تەلەفۆنەکانی –ئەکادیمیای سوید-یشی نەدەدایەوە. ڕەخنەکان لە هەموو لایەکەوە بەسەریدا دابارین. چۆن دەبێت کەسێک بەو شێوەیە ناسووپاسگوزار بێت؟ زۆر لوتبەرزە! زۆر کەمتەرخەمە! کاتێک دیلان لەکۆتاییدا وەڵامی دایەوە، لە چاوپێکەوتنێکدا قسەی لەگەڵ ڕۆژنامەیەکی بەریتانی کرد، بە ساردوسڕییەکەوە ئەوەی خستەڕوو" من ئەو شەرەفە زۆر بەرزدەنرخێنم." وشەکان بە جۆرێک دەردەکەوتن وەک ئەوەی بە زۆر لە ڕێگەی ڕاوێژکارێکی پەیوەندییە گشتییەکانەوە بە زۆر

لێیدەربهێندرێت. لە مەراسیمی بەخشینی خەلآتەکەدا ئامادەنەبوو-
یان بەدەربڕینێکی دیکە سێ مانگ دواکەوت. کەسێک دەتوانێت
مەزەندەی ئەوە بکات کە ئەو کەمتر گرنگی بە شەرافەتمەندانەترین
خەلآتی دونیا بدات.

گریگۆری پیریلمان لە ساڵی ١٩٦٦ دا لەدایکبووە و وەک
گەورەترین -بیرکار-ی زیندوو هەژمار دەکرێت. لە ساڵی ٢٠٠٢
دا یەکێک لە حەوت "کێشە هەزار ساڵەییەکانی" بیرکاری چارەسەر
کرد. شەش دانەکەی دیکە هێشتا بە چارەسەرنەکراوی ماونەتەوە. بۆ
خەلآتی فیلد میدال- وەک خەلآتی نۆبڵ وایە بۆ بیرکاری- بەلام ئەو
ڕەتیکردەوە. تەنانەت خەلآتی یەک ملیۆن دۆلارەکەشی ڕەتکردەوە،
هەرچەندە کە بە دڵنیایی دەیتوانی بەکاریبهێنێت. پیریلمان بێکارە و
لەگەڵ دایکیدا لە باڵەخانەیەکی چەندین قاتدا لە سانت پترسبۆرگ
دەژی. ئەوەی گرنگە بە لایەوە بیرکارییە. ئەو بەتەواوی لای گرنگ
نییە کە دونیا چۆن بیر لە خۆی و دەستکەوتەکانی دەکاتەوە.

کاتێک یەکەمجار دەستم بە نوسین کرد، گرنگ بوو بە لامەوە
بزانم خەڵک چۆن بیر لە کتێبەکانم دەکەنەوە. من خوێندنەوە
ئەرێنییەکان بۆ کتێبەکە خۆشحاڵ دەبووم وبە وشە بە وشەی
ڕەخنەکانیش نیگەران دەبووم. چەپڵەلێدانەکانم وەک پێوەرێک بۆ
سەرکەوتنی خۆم حساب دەکرد. لە هەندێک خاڵدا لە ناوەڕاستی
تەمەنی چل ساڵیمدا، هەرچەندە منیش هەمان کاتی بۆب دیلان-م
هەبوو، لەوە تێگەیشتم کە پێزانینی گشتی کاریگەرییەکی زۆر کەمی
لەسەر چۆنێتی کارەکانم هەبوو. ئەوانە کتێبەکانم هیچ باشتر نە

خراپتر دەکەن. بەدەستهێنانی ئەم تێڕوانینە هەست دەکرد وەک ئەوەبوو کە لەو زیندانە ڕزگارم ببێت کە خۆم دروستم کردبوو.

بەڵام بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ پرسیارە بنچینەییەکەم. وارن بەفێت بەم شێوەیە دەریدەبڕێت" ئایا تۆ بەلاتەوە باشترە کە ناوازەترین عاشقی دونیا بیت، بەڵام هەموو کەس پێیانوابێت تۆ شکستخواردووترین عاشقی دونیایت؟ یان بەلاتەوە باشترە کە شکستخواردووترین عاشقی دونیا بیت، بەڵام هەموو کەس پێیانوابێت تۆ ناوازەترین عاشقی دونیایت؟" لە مەدا، بەفێت چوارچێوەی بیرۆکەیەک دەکێشێت کە گرنگترینە بۆ ئەوەی بەرەو ژیانێکی باش ڕێنموییت بکات: جیاوازی نێوان خشتەی خاڵ تۆمارکردنی ناوەکی و خاڵ تۆمارکردنی دەرەکی. کامەیان زیاتر بە لاتەوە گرنگترە: تۆ چۆن خۆت دەنرخێنیت یاخود دونیای دەرەوە چۆن تۆ دەنرخێنێت؟ " لە فێرکردنی منداڵەکانتدا، پێموابێت ئەو وانەیەی لە تەمەنێکی زۆر زۆر منداڵیدا فێری دەبن ئەوەیە کە دایک و باوکیان جەختی لێدەکەنەوە. ئەگەر هەموو جەختلێکردنەوەکە ئەوە بێت کە هەموو دونیا چۆن بیر لە تۆ دەکەنەوە، ئەوە لە بیربکەیت لە ڕاستیدا چۆن مامەڵە دەکەیت، ئەوا خۆت دەبینیتەوە خەریکی خاڵ تۆمارکردنی دەرەکیت." ئەوەش، کە دڵنیام پێشتر مەزەندەت کردووە، ڕێگایەکی زۆر کاریگەرە، کاریگەرە لە شکستپێهێنانی -ژیانێکی باش- دا، هەر لە چوارگۆشەی یەکەم دا.

پاڵنەری پشت خستنەڕووی ئەو وێنەیەی خۆمان تا بۆمان دەکرێت ئەوپەڕی باشترین بێت، ئەو گوژمەیە کە بە قوڵاییماندا

گوزەر دەکات. بە ڕای تۆ کامیان گرنگتر بووە بە لای باوباپیرانە کۆچڕەوەکەی ئێمەوە، خاڵ تۆمارکردنی ناوەکی یاخود خاڵ تۆمارکردنی دەرەکی؟ بە دڵنیاییەوە ئەوەی دواییانە. ژیانیان بەتەواوی بەند بووە بەوەی خەڵکی دیکە چۆن بیری لەوان کردۆتەوە. بەند بووە بەو بابای مرۆڤەوە کە هەماهەنگی کردووە لەگەڵیان یان لە کۆمەڵەکە کردوویەتییە دەرەوە. باوباپیرانمان بێئاگابوون لەوەی خاڵ تۆمارکردنی دەرەکییان هەر زوو لە کۆمەڵەی زیندەوەردەکان دەیانکاتە دەرەوە. یەکەمین شارۆچکە یاخود گوند نزیکەی دە هەزار ساڵ لەمەوپێش بونیاد نراوە. چونکە چیتر ڕێیتێنەدەچوو بە لای هەمووانەوە کە لەم شوێنە نیشتەجێبوونەدا هەموو نهێنییە کەسییەکانی دیکە بزانن، گرنگیدانێکی باش بە"ناوبانگ" کە لە پێش تۆوە هەبووە گرنگییەکەی زۆر زیادی کرد. قسەو قسەلۆک ئەرکی ناسیاوی کەسی گرتە ئەستۆ. لەو کاتەشەوە بەدوا قسەو قسەلۆک دونیای گرتەوە. جاری داهاتوو کە هاوڕێیەکت بینی، کاتەکەت ڕابگرە: نەوەد لە سەدی کاتەکەت بە قسەکردن لە بارەی کەسانی دیکەوە بە زایە دەدەیت.

هەندێک هۆکارگەل کە لە بیردۆزی پەرەسەندنەوە هەڵقوڵاون و مایەی تێگەیشتنن هەن لە بارەی ئەوەی کە بۆچی ئێمە ئەوەندە کوڵ بە کەسانی دیکە هەڵدەگرین، بەڵام ئەوە بەو مانایە نایات کە هێشتا ئەوانە دەچنە ئەقڵەوە. بەپێچەوانەوە، بیر و بۆچونی ئەوانی دیکە زۆر لەوە بێبایەختره کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە. وەڵامدانەوەی سۆزداریت بۆ گۆڕانکارییەکان لە شکۆ و ناوبانگ و ڕووکەشی خۆتدا

بەشێوەیەکی زۆر و تا ئاستێکی باڵا ئاشنایە، یان ئەگەر بەشێوەیەکی دیکە دەریببڕین، ئەوا تۆ هێشتا لە چاخی بەردین-دایت. جا ئەگەر ئەوەنەت هەڵبفشێنن و ناوت بگەیەننە ئاسمان یاخود ناوت بە ناخی زەویدا ببەن، کاریگەرییە ڕاستییەکەی لەسەر ژیانت بە ڕوون و ئاشکرا بچووکترە لە شانازی و ئەو هەستی شەرمەزارییەی کە باوەڕت وایە هەیەتی. بۆیە خۆت ڕزگار بکە. لێرەدا سیانزە هۆکار هەیە کە واتلێدەکات بۆچی ئەمە بکەیت. یەکەم، لەو هەموو هەڵکشان و داکشانە سۆزدارییە دەتپارێزێت. بەشێوەیەکی ماوە درێژ، هەر چۆنێک بێت ناتوانیت بەتەواوی ناوبانگەکەت بەڕێوە ببەیت. وارن بەفێت وتەیەکی بەڕێوبەری پێشووی –فیات- بەکاردەهێنێت" کاتێک پیر دەبیت، ئەو ناوبانگەی شایستەتە دەستت دەکەوێت." دەتوانیت بۆ ماوەیەک خەڵکی هەڵبخەڵەتێنیت، بەڵام تا کۆتایی تەمەن ناتوانیت. دووەم، تەرکیز کردنە سەر ناوبانگ و شکۆ، تێڕوانینمان بۆ ئەو شتەی بەڕاستی ئێمە دڵخۆش دەکات دەشێوێنێت. سێیەمین، فشاری دەروونی زۆرمان دەخاتە سەر. زیان بە ژیانێکی باش دەگەیەنێت.

تەرکیزکردنە سەر خاڵ تۆمارکردنی دەرەکی هەرگیز وەک ئەمڕۆ باو نەبووە. دەیڤد برووک دەڵێت" تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کلتورێکیان دروست کردووە کە خەڵکی بوون بە بەڕێوەبەرێکی نوێی بچووک، فەیسبووک، تویتەر، ئینساگرام، نامە ناردن، بەکاردەهێنن بۆ ئەوەی وروژانێکی بەهەڵەبراو و خودێکی دەرەکی زیاد لە پێویستی پڕ لە وزە دروست بکات. بروک زاراوەیەکی زۆر نایاب بەکاردەهێنێت کە ئەویش " مەکینەی گەڕان بەدوای ڕازیبووندایە."

بۆ ئەوەی وەسفی خەڵکی بکات، ئەگەر ئاگادار نەبن دەبن بەچی. -لایک، Like- و -بەهادانان، Rating- و -شوێنکەوتووان، Followers- ئەوانە هەموویان دەگۆڕێن بۆ کاردانەوەیەکی کاریگەر و لە ڕادەبەدەر بۆ بڵاوکراوەکانت کە تەنانەت لە ڕاستیدا بڵاوکراوەی خۆت نین. هەر ئەوەندە جارێک لەم تۆڕە گیربوویت، ئاسان نییە خۆت ڕزگار بکەیت و بەرەو ژیانێکی باش بڕۆیت. سەرەنجام؟ دونیا خەریکی پۆست کردن و نوسین و تویت کردنە لە بارەی تۆوە، جا هەر شتێک بێت کە بە تەواوی بە ناخێریان بە دڵی خۆیانە. خەڵکی لە پشتتەوە هەر قسەو قسەڵۆک دەکەن. بە ستایشکردن هەڵتدەفشێن و دواتر پەلکێشی چەلەحانێت دەکەن. تۆ ناتوانیت کۆنترۆڵی ئەوە بکەیت. ، بەڵام، خۆشبەختانە، پێویستیش ناکات بیکەیت. ئەگەر سیاسەتمەدار یان کەسێکی ناودار نیت و لە ڕێگەی ڕیکلامەوە پارە بەدەست ناهێنیت ئەوا چی دیکە نیگەرانی ناوبانگت مەبە. چیتر واز لە لایککردنی خەڵک و لایککردنت بهێنە. لە ماڵپەڕی گوگڵ بۆ خۆت مەگەڕێ و زۆر بەدوای کاردانەوەی خەڵکیدا مەگەڕێ. لە جیاتی ئەوە شتێک تەواو بکە. بەشێوەیەک بژی کە بتوانیت لە ئاوێنەدا سەیری خۆت بکەیت. بەفێت دەڵێت" ئەگەر شتێک بکەم خەڵکی بەدڵیان نەبێت، بەڵام هەستێکی باشم پێببەخشێت، ئەوا دڵخۆشم. بەڵام ئەگەر خەڵکی ستایشی شتێک بکەن کە کردوومە، بەڵام ڕازی نەبم لێی، ئەوا هەست بە دڵتەنگی دەکەم." ئەوە خاڵ تۆمارکردنی ناوەکی تەواوە. بۆیە تەرکیز بخەرە سەر ئەوە و چارەسەری ستایشە دەرەکییەکان و ڕەخنە دۆستانەیە توندەکان و بەدڵنەبوونە هێواش و لەسەرخۆکانت بکە.

١٨

## وەهمی " کۆتایی مێژوو"

## تۆ دەتوانیت خۆت بگۆڕیت، بەڵام ناتوانین کەسانی دیکە بگۆڕیت.

هەموو جارێک کە بە فڕۆکەخانەی -زیوریخ- دا دەڕۆم، ئەوا سەرنجی چەند گۆڕانکارییەکی کەم دەدەم. دوکانێکی نوێ لێرەیە، قاوەخانەیەکی نوێ لەوێیە، تەختەیەکی ئاگاداری گەورە لەسەرەوەیە و ڕیزی ڕۆیشتن و هاتنی سەرنشینەکان کە وەک پۆلێک سەرباز ڕیزبوون تێیدا دەردەوشێتەوە. ئێستا ناو بە ناو کە ئۆتۆمۆبێلەکەم دەبەم بۆ گۆڕەپانێکی نوێی ئۆتۆمۆبێل پارککردن، هەندێک جار خۆم دەبینمەوە بێ ویستی خۆم سەیری بەشێکی لاوەکی ئەو گەراجە دەکەم تەنها پلاکێکی کارەبای تێدا گۆڕاوە. من بە نزیکەیی مانگی جارێک بە دەوری ئەم ڕێگا پێچاوپێچەی فڕۆکەخانەیەدا تێدەپەڕم، بەتێکڕاییش بۆ ماوەی سێ ساڵە بەردەوامم لەمە. هەموو جارێک مێشکم خۆنەویستانە هۆگری خزمەتگوزارییە بنچینەییە جیاوازەکان دەبێت، بۆیە جاری داهاتوو ڕێگای خۆم بەرەو دەروازەی دەرگای دەرەوە دەبینمەوە کە دەرگای دەرەوە

کارتی چوونە دەرەوەی لێنییە. ئێستا کاتێک بیر لە یەکەم سەردانم دەکەمەوە، هەرچەندە ئەو کاتە منداڵ بووم و دەستی دایکمم دەگرت تا بەخێرهاتنەوە باوکم بکەین، کە لە سەفەرێکی بازرگانی دەگەڕایەوە- چاوم لێی بوو بە پلیکانەکانی فڕۆکەکەدا دەهاتە خوارەوە و لەوبەری فڕگەی فڕۆکەخانەکەوە دەستی بۆ هەڵدەبڕین و سلاوی لێدەکردین- شتێک ڕایگرتم کە ئەو فڕۆکەخانەیە هیچی لەم فڕۆکەخانەیە ناچێت کە ئەمڕۆ هەیە. ئەو کات فڕۆکەخانەی زیوریخ کلۆتن یەک تاقە ڕاڕەوی سارد و سڕی هەبوو کە تێیدا یەک دەنگی دووبارە هەموو ڕۆیشتنەکانی ڕادەگەیاند و لە بلندگۆیەکەوە بانگی هەموو ئەو سەرنشینانەی دەکرد کە دواکەوتوون- بە ئەڵمانی و فەڕەنسی و ئینگلیزیش. ناو بە ناو گوێت لە خشەخشی هەڵدانەوەی کاغەز و ژمارەکان بوو کە لەسەر تەختەی ڕاگەیاندنەکان هەڵدەدرانەوە. ئەمڕۆ، فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی زیوریخ سەنتەرێکی کڕین و فرۆشتنی پڕ لە هەراو زەنایە بە سێ ڕاڕەووەوە بۆ خۆی. دڵنیام کە دەتوانیت بیر لەو شوێنانە- وەک بنکەکانی شەمەندەفەر، شارەکان، زانکۆکان- بکەیتەوە کە بە تەواوی لەو ماوە دوور و درێژانەدا هەر بێ ئەوەی لە کاتی سەردانەکانیشتدا سەرجیان بدەیت گۆڕاون.

بەڵام ئەی تۆ چی؟ بە تێپەڕبوونی ئەو کاتە تۆ چەند گۆڕاویت؟ هەوڵبدە وێنای ئەوە بکە کە بیست ساڵ لەمەو پێش کێ بوویت. بیر لە شتە دەرەکییەکان مەکەرەوە- پیشە، ماڵ، ڕووخسار- بەڵکو بیر لە کەسایەتی، کارەکتەر، سروشت، بەها و خولیاکانت بکەرەوە. ئەو کەسە لەگەڵ خودی هەنوکەییت دا بەراورد بکە. چەند گۆڕاویت، لەسەر هێلێک

ئاستەکەی دیاری بکە، لە ژمارە سفرەوە -. هیچ گۆڕانکارییەک- تا ژمارە دە -۱۰ گۆڕانکاری تەواو، من کەسێکی تەواو جیاوازم-؟

زۆربـەی ئـەو کەسانەی لێیان دەپرسم چەندین جیاوازی لە کەسایەتییان دا دەخەنە ڕوو لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردوو دا، هەم لە ڕووی بەها و ئەو شتانەی حەزیان لێبووە و ئەو شتانە حەزیان لێنەبووە. بەتێکڕایی دەگەنە ژمارەیەک کە لە نێوان ۲-٤ دایە. نەک وەک ئەو گۆڕانکارییە بنچینەیی و بونیادییەی لە فرۆکەخانەی زیوریخ دا هەیە، بەڵام هەر کەمێک گۆڕاون.

ئێستا بۆ پرسیاری دواترم: پێتوایە بۆ بیست ساڵی داهاتوو چەند دەگۆڕێیت؟ ئاستی تێکڕای وەڵامەکان ئێستا زۆر نزمترە بە نێوان ۰-۱ دایە. بە دەربڕینێکی تر زۆربەی خەڵکی باوەڕیان بەوە نییە کە لە داهاتوودا دەگۆڕێن، یان لە قولآیی ناخیاندا نییە ئەو بڕوایە، ئەگەر هەشبێت، ئەوا تەنها تۆزێکی کەم دەگۆڕێن. بەپێچەوانەی فرۆکەخانە و بنکەکانی شەمەندەفەر و شارەکانەوە. مایەی پێکەنینە، وانییە؟ کەواتە ناکرێت ئەوە ڕاست بێت ئەمرۆ ئەو ڕۆژەیە کە کەسایەتیمانی تێدا لە گەشەکردن دەوەستێت؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر. دەروونناسی زانکۆی هاڤارد دانیاڵ گیلبەرت بەمە دەڵێت وەهمی کۆتایی مێژوو. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بەو ڕادەیەی لە ڕابردوودا گۆڕاوین لە داهاتووشدا دەگۆڕێین. بەڵام بە چ ئاراستەیەکدا؟ بەڵێ، ئەوەیان ڕوون نییە، بەڵام مایەی مەترسی نییە گەر بڵێین کە کەسایەتییەکی جیاوازت بە چەند بەهایەکی جیاوازەوە دەبێت. لێکۆڵینەوەکە نارۆشن نییە.

بەڵام با تاوێک چەمکە گەورەکانی وەک "کەسایەتی" و "بەهاکان"

به کراوەیی بەجێبهێڵین. با تەنها ئەو شتانە وەربگرین کە حەزت لێیانە. بیر لە بیست ساڵ پێش ئێستا بکەرەوە. کامە فیلمی دڵخوازت بوو؟ ئەی ئەمڕۆ کامەیە؟ ئەوانەی لە ڕادەبەدەر خۆشتدەویستن کێ بوون؟ ئەی ئەمڕۆ کێن؟ گرنگترین هاوڕێکانت کێ بوون؟ ئەی ئەمڕۆ کێن؟ خولەکێک بوەستە تا وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەیتەوە.

گێلبەرت بیرۆکەیەکی گونجاوی بۆ پێوانی ئەم گۆڕانکارییانە لە حەز و ڕقی خەڵکیدا هەبوو. دوو پرسیاری لە خەڵک کرد: أ) دە ساڵ لەمەو پێش تیپی مۆسیقی دڵخوازت کامە بوو، ئەی ئەمڕۆ چەند پارە دەدەیت بۆ ئەوەی بلیتی کۆنسێرتێکیان بکڕیت؟ ب) ئەی ئەمڕۆ تیپی مۆسیقی دڵخوازت کامەیە و چەند پارە دەدەیت بۆ کڕینی بلیتێکیان بۆ بەشداریکردن لە یەکێک لە کۆنسێرتەکانیاندا کە لە دە ساڵی داهاتوودا دەکرێت؟ جیاوازییەکە بەرچاوە. خەڵکی حەزیان لەوەیە بەتێکڕای ٪٦١ زیاتر پارە بدەن بۆ ئەوەی گوێیان لە تیپی مۆسیقاکەی ئێستایان بێت لە دە ساڵی داهاتوودا وەک لەوەی پێشوویان. ئەمە سەلمێنەری -وەهمی کۆتایی مێژوو- و چەقنەبەستوویی حەز و خولیاکانمانە.

هەواڵێکی خۆش و هەواڵێکی ناخۆشیشم پێیە: دەتوانیت لێکۆڵینەوە لە کاریگەری هەندێک لەو گۆڕانکارییانە بکەیت کە لە کەسایەتیدا ڕوویان داوە. بەڵام زۆر نا- بەشێکی زۆری ئەو بەرەوپێشچوونانە بەگوێرەی کارلێکی نێوان پرۆگرامی جینی جەستەی مرۆڤ لەگەڵ ژینگەکەی دا دەردەکەون- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تۆ هەر دەبێت دەست بەسەر دەرفەتەکەتدا بگریت. باشترن ڕێگا بۆ ئەوەی دەست بەسەر ئاراستەی بەرەوپێشچوونەکانتدا بگریت ئەوەیە کە ئەو کەسانە بەکاربهێنیت کە لە

راده بەدەر خۆشتدەوێن. بۆیە وریابە لە هەڵبژاردنی ئەو کەسانەدا کە زۆر پەسەندن لات.

هەواڵە ناخۆشەکە: ناتوانی کەسانی دیکە بگۆڕین- ناتوانیت، تەنانەت نە هاوژینەکەت، نە منداڵەکانت- هاندان بۆ گۆڕانکاری کەسی دەبێت لە ناخەوە بێت. نە فشاری دەرەکی نە بەڵگەی ئەقڵانی سوودی نییە. هەر لەبەر ئەوەیە یەکێک لە یاسا زێڕینەکانم بۆ گەیشتن بە ژیانێکی باش ئەمەیە" خۆت لەو بارودۆخانە بپارێزە کە دەبێت کەسانی دیکە بگۆڕیت." ئەم ستراتیژییەتە ئاسانە تا ئێستا ڕزگاری کردووم لە بڕێکی باش خەم، نائومێدی، تێچوو. بە دەربڕینێکی کرداری، هەرگیز کەسانێک ناخەمە سەر کار کە کەسایەتییەکیان هەبێت ناچار بم بیانگۆڕم، چونکە دەزانم ناتوانم. کار لەگەڵ ئەو کەسانەدا ناکەم کە سروشتیان لەگەڵ مندا ناگونجێت- گرنگ نییە ڕەنگە چەند بەهێز بێت. هەرگیزیش بەڕێوبەرایەتی ڕێکخراوێک لە ئەستۆ ناگرم کە پێویست بکات بیرکردنەوەی خەڵکەکەی بگۆڕم.

بازرگانە زیرەکەکان هەمیشە ئەو ڕێچکەیەیان گرتووە. یەکێک لە پرەنسیپەکانی ڕێنمایی لە ساوز وێست ئێرلاین[15] هەر لە سەرەتاوە ئەمە بووە" پارەدان لەبەر هەڵوێست، یاخود ڕاهێنان پێکردن بۆ لێهاتوویی" هەڵوێستەکان ناتوانرێت بگۆڕدرێن، لانیکەم لە ماوەیەکی پێویستدا ئەوە ناکرێت، هەروەها بەدڵنیاییەوە لە ڕێگەی فشاری دەرەکییەوە ئەمە ناکرێت. بەلام لێهاتووییەکان دەتوانرێت بگۆڕدرێن.

---

۱۵- ساوز وێست ئێرلاین: هێڵی ئاسمانی باشوری ڕۆژئاوا.

من بەتەواوی شۆکم کە بۆچی کەسانێکی زۆر ئەم یاسا سادەیە بە هەند وەرناگرن. هاورێیەکم- کە ئاژەڵێکی ئاهەنگەکان و پەپولەیەکی کۆمەڵایەتییە-هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێک جوان و گۆشەگیردا کرد، وایدانا لای خۆی دەتوانێت ئەم ڕۆحە بێدەنگە بگۆڕێت بۆ ژنێکی سەر بەدەر و ئاشقی ئاهەنگەکان. بەدڵنیاییەوە شکستی هێنا و دەرەنجامەکەشی جیابوونەوەیەکی خێرا و قورس بوو.

یاسایەکی پەیوەندیدار بە ژیانەوە" تەنها ئیش لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکە کە بەدڵتن و متمانەیان پێدەکەیت." هەر وەک چارلی مەنگەر دەڵێت" ئەها، ئەوە هەر زۆر بەسوودە مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکەیت کە دەتوانیت مامەڵەیان لەگەڵ بکەیت و هەموو ئەو شتە نەفرەتیيانەی دیکە لە ژیانت بکەیتە دەرەوە...بـەڵام کەسانی ژیر دەیانەوێت خۆیان لەو کەسانە بپارێزن کە بەتەواوی وەک ژەهری جرج وان، ئەوانە زۆریشن." کەواتە چۆن خۆت لە کۆڵ ئەو کەسە ژەهراوییانە دەکەیتەوە؟ یەک پێشنیار: هەموو ساڵێک لە بەرواری ٣١ی دیسەمبەر دا من و خێزانەکەم یەک لاپەڕە دادەنێین بۆ ئەوەی ناوی ئەو کەسانەی لەسەر بنوسین کە بۆمان باش نین و چیتر نامانەوێت لە ژیانماندا هەبن. دواتر یەک بە یەک بە زەردەخەنەیەکەوە فڕێیان دەدەینە سەر ئاگرەکە. ئەوە نەریتێکی بەسوود و چارەسەرکەریشە.

١٩

# مانای بچووکتری ژیان

ئەو ئامانجانە کامانەن دەتوانیت بە دەستیان بهێنیت؟ ئەی ئەو ئامانجانە کامانەن ناتوانیت؟

کاتێک نوسەر تێری پێرس ویستی پەیوەندی بە هاوڕێکەیەوە- گاری- بکات، گوێی لەم نامەیە بوو" سڵاو، ئەمە -گاری-یە، ئەمەش ئامێرێکی وەڵامدانەوە نییە، ئەمە ئامێری پرسیارکردنە! دوو پرسیارەکەش ئەمانەن- تۆ کێیت؟-و -چیت دەوێت؟-؟" وەستانێک هەبوو، دواتر دەنگەکە بەردەوام بوو" ئەگەر پێتوایە ئەمانە پرسیارێکی بێمانان، ئەوا بزانە کە ٪٩٥ی خەڵکی ژیان دەکەن و بێ ئەوەی هیچ کام لەو پرسیارانە لە خۆیان بکەن!"

ئەی تۆچۆن وەڵامی پرسیاری "تۆ کێیت؟" دەدەیتەوە؟ زۆربەی خەڵکی ناوی خۆیان دەدەن و دەڵێن کە خەریکی چ کارێکن بۆ ئەوەی پێی بژین، هەندێک جار چەند زانیارییەکی کورت و خێرا لەبارەی خێزانەکەیانەوە بەدوادا دێت، بۆ نموونە" من دایکی دوو منداڵم." یان تایبەتمەندییەکی کەسی " خەڵکیم خۆشدەوێت." بەڵام وەڵامێکی لەو

جۆرە چ سوودێکی هەیە؟ هیچ. ناتوانیت بە وەڵامێکی ئاوا وەڵامی پرسیارێکی لەو جۆرە بدەیتەوە، چونکە هیچ تاکە ڕستەیەک نییە تا وەڵامی ناسنامەی خۆتی پێبدەیتەوە. تەنانەت بۆ ئەو بابەتە یەک تاکە پەڕەگرافیش نییە. تەنانەت دە لاپەڕەش. بێ گوێدان بەوەی کێیت، پێویستت بە ڕۆمانێکە بە ئەندازەی پرۆستییەکان قوڵ بێت تا بەرامبەر بوون و ژیانت دادپەرو بێت.

چونکە ژیانی ئێمە پێکدێت لە چەندین ڕووی ناکۆتا، هەر وەڵامێکی یەک دێڕیش بە مانای وشە ناتەواوە. کەچی هێشتا ئێمە بە بەردەوامی زۆر لە خۆمان دەکەین لەو ڕووەوە- نەک تەنها کاتێک پەیوەندی بە- گاری-یەوە دەکەین، لەوە سەرنجڕاکێشتر لەگەڵ خۆمان دا، وەک بەشێک لە تێگەیشتن لە خۆمان. ئێمە وێنەیەکی خۆمان دروست دەکەین کە وەک کتێبی ڕەنگاو ڕەنگی منداڵان وایە: گاڵتەجاڕانە زیاد لە پێویست سادە کراوەتەوە، بێ هیچ پێچەوانەیەتییەک- سەرتاپای زۆر ئەرێنییە. هەر وەک لە بەشی ٢٢ دا دەیبینیت، ئێمە هەموو ئەو چیرۆکانە دروست دەکەین لە بارەی ژیانمانەوە قسە بۆ خۆمان دەکەین، بەڵام لێرەدا تێڕوانینێکی لەخۆوە هەیە: وا باشترە وەڵامی ئەو پرسیارە نەدەیتەوە کە کێیت، چونکە تەنها کات بەفیرۆ دەدەیت.

لە بارەی پرسیاری دووەمەوە: چیت دەوێت؟ بەپێچەوانەی پرسیاری یەکەمەوە، ئەم پرسیارە بەتەواوی جێگای وەڵامی. لە ڕاستیدا، پێویستە و دەبێت وەڵامی بدەیتەوە. ئەوە پرسیاری مەبەستت لێدەکات لە ژیاندا، تەنانەت هەندێک جار وەک " مانای

ژیان" ئاماژەی بۆ دەکرێت. ئێستا، وشەی "مانا" بە جۆرێک لە جۆرەکان سەرلێشوێنە، بۆیە پێشنیاری ئەوە دەکەم بۆ ئەوەی وردتر بین دەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان" مانای گەورەتری ژیان" و "مانای بچووکتری ژیان" دا.

ئەگەر هەوڵ دەدەیت مانای گەورەتری ژیان بدۆزیتەوە، ئەوا تۆ دەگەڕێیت بۆ وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە: بۆچی ئێمە لەسەر زەوین؟ بۆچی گەردوون بوونی هەیە؟ ئەی هەموو ئەم شتانە مانای چییە؟ لە مێژە هەموو شارستانییەتێک بە میسۆلۆجی- ئەفسانە-ی خۆی وەڵامی ئەم پرسیارانەی داوەتەوە. ئەو بیرۆکەیەی لە هەموویان دیارتر و گەشترە ئەوەیە کە زەوی ئێسکی پشتی کیسەڵێکی زۆر گەورەیە- ئەمە ئەفسانەیەکە کە لە ئەفسانەی چینی و باشووری ئەمریکاشدا دەبینرێن. یان لە ئەفسانەی مەسیحییەت دا: خودا هەموو شتێکی لە شەش ڕۆژدا دروست کرد، لە ڕۆژی پەسلآنیش دا نامەی کردەوەکان سەرتاپا دەسڕێتەوە. بە پێچەوانەی نوسەرە ئەفسانەییەکانەوە، زانست هیچ وەڵامێکی بۆ پرسیاری" مانای گەورەتری ژیان" نەدۆزیوەتەوە. هەموو ئەوەی دەیزانن ئەوەیە کە ئەگەر ماددەی پێویست و بەشکردوو لەگەڵ وزەدا لەبەر دەست دا بن ئەوا ئەم بوونە بێئامانجانە لە گەشەکردن بەردەوام دەبێت. هیچ مەبەستێکی ئاشکرا و دیار بوونی نییە- نە بۆ مرۆڤ، نە بۆ ژیان، نە بۆ گەردوون. دونیا لە بنەڕەتەوە بێمانایە. کەواتە واز لە گەڕان بهێنە بەدوای وەڵامی" مانای گەورەی ژیان" دا. تەنها کات بەفیڕۆ دەدەیت.

پرسیاری "مانای بچووکتری ژیان" گرنگه. چونکه ئەوە سەبارەت بە ئامانج، بەرزیخوازی، ئەرکە کەسییەکانتە- ئەوە لە بارەی پرسیاری دووەمی ئامێری وەڵامدانەوەکەی – گاری-یەوەیە. بێ ئامانجی کەسی هیچ ژیانێکی باش بوونی نییە.

سێنیکا[١٦] دوو هەزار ساڵ لەمەو بەر ئەمەی بۆ دەرکەوتوو" با هەموو هەوڵەکانت ڕووەو یەک شت ئاراستە بکرێن. ئەوە تا کۆتا ئامانج لە مێشکتدا هەڵبگرە." هیچ گەرەنتییەک بۆ بەدەستهێنانی کۆتا ئامانج نییە، بەڵام ئەگەر ئامانجێکت نەبێت، ئەوا گەرەنتیت کراوە کە هیچ شتێک بەدەست ناهێنیت.

ئامانجەکانی ژیان تا ئەندازەیەکی زۆر گرنگن. نموونەیەک: لێکۆڵەرەوەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕاپرسییان بە حەقدە خوێندکاری تەمەن هەژدە ساڵ کرد لە بارەی گرنگی سەرکەوتنی داراییەوە، داوایان لێکردن تا لەسەر هێڵێک بەهاکەی بپێون ژمارە ١واتا گرنگ نییە، ٢ جۆرێک لە جۆرەکان گرنگ، ٣ زۆر گرنگ، ٤ زۆر بنچینەییە. چەند ساڵێک دواتر ڕاپرسییان لەگەڵ هەمان ئەو کەسانەدا لە بارەی داهاتی ڕاستەقینەیان و هەروەها بەگشتی چەند دڵخۆش بوون لە ژیاندا کرد. ئەنجامی یەکەم: تا ڕادەی بەرزخوازی دارایی ئەو کەسانە لە تەمەنی گەنجێتییاندا زیاتر بووایە، ئەوا لە تەمەنی ناوەڕاستی تەمەنیان دا پارەی زیاتریان بەدەستهێنابوو. سەرەنجام ئامانجەکان کاری خۆیان دەکەن! ئەمە

---

١٦- سێنیکا: ئەمریکا ڕەسەنەکانن کە هەندێکیان ئێستا لە شاری نیویۆرک و ئۆهیۆ دەژین.

هەر بووە مایەی سەرسامی بۆ دەروونناسەکان، کە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ باوەڕیان وابوو کە خەڵکی وەک سەگەکانی پاڤلۆڤ[١٧]، تەنها کاردانەوەیان بۆ هاندانە دەرەکییەکان دەبێت.

دەرەنجامی دووەم: هەموو ئەو خوێندکارانەی لە مێشکی خۆیاندا ئەوەیان دانابوو کە دوای تەواوکردنی خوێندنەکەیان پیشەیەک بە داهاتێکی بەرزەوە بەدەستدەهێنن- ئامانجەکەشیان بەدەستهێنابوو- بە لای ئەوەدا دەچوون لە ناخی دڵەوە لە ژیانیان ڕازی بن. بەپێچەوانەوە، ئەوانەی پارە بەلایەنەوە گرنگ بوو، بەڵام شکستیان هێنابوو لە بەدەستهێنانی ئامانجە داراییەکان دا، لە ناخی دڵیانەوە ناڕازی بوون. بەدڵنیاییەوە، ڕەنگە تۆش بیر بکەیتەوە. پارە دڵخۆشت دەکات. بەڵام هەر ئەوەندە نییە، چونکە داهاتێکی باڵاتر کاریگەری لەسەر قایلمەندی ئەو کەسانە نەبوو بە بەراورد بەو کەسانەی سامان ئامانجێکی ژیانیان نەبوو. ئەوە پارە نییە کە دڵخۆشت دەکات یان دڵتەنگ، بەڵکو ئەوە تۆیت کە درک بە بەرزیخوازییەکانت دەکەیت یان نا. هەمان شت بۆ ئامانجەکانی دیکەی ژیانیش هەر ڕاستە.

بۆچی ئامانجەکان کار دەکەن؟ چونکە، ئامانج خەڵکی ئاراستە دەکات تا هەوڵ بدەن لە تەواوکردنیان دا. لەبەر ئەوەشی ئامانج بڕیارەکان ئاسانتر دەکات. ژیان پێکدێت لە چەندین دوو ڕیانی بێکۆتا لە ڕێگاکەدا. دەتوانیت هەر بژاردەیەکیان بکەیت بە خۆزگەیەک- یان

---

١٧- سەگەکانی پاڤلۆڤ: زانایەکی ڕووسی هەبوو بە ناوی ئای پی پاڤلۆڤ کە تاقیکردنەوەیەکی لەسەر سەگ ئەنجام دا، بۆ ئەوەی پیشانی بدا کە سەگ دەتوانرێت ڕابهێنرێن بۆ ئەوەی کاردانەوەیان بۆ هاندانێکی دیاریکراو هەبێت.

ئاماژەیەک بکەیت بە ئامانجەکانت. ئینجا هیچ جێگەی پرسیار نییە کە ئەو کەسانەی سەرکەوتنی داراییان وەک " زۆر بنچینەیی" لە لێکۆڵینەوەکەدا وەسف کرد، پیشەیەکیان هەڵبژارد کە موچەیەکی باشی هەیە وەک (پزیشک، پارێزەر، ڕاوێژکار).

کەواتە ئامانجەکانی ژیان پێشنیار کراون. کەچی هێشتا دوو کێشەی شاراوە هەن" هەر وەک دانیاڵ کاهنمان خستویەتییە ڕوو" ڕێگایەک بۆ گەورەبوونێکی پڕ لە ناڕازییەتی ئەوەیە کە چەند ئامانجێک دابنێیت بەدەستهێنانیان زۆر قورس بێت." بە دەربڕینێکی تر، دەبێت دڵنیا ببیتەوە کە ئامانجەکانت واقعین. ئەگەر خڕ و کورتیت، خەونیش بەوەوە دەبینینت ببیت بە ئەستێرەیەکی یاری باسکە، ئەوا تۆ هەر لە ڕێوە ڕێگری لە خۆت دەکەیت بۆ بەدەستهێنانی. هەمان شتیش ڕاستە ئەگەر دەتەوێت یەکەم کەس بیت بچیتە سەر مانگ، یان ببیت بە سەرۆک. یان ملیاردێر. لە ڕاستیدا ناکرێت ئامانجی لەو شێوەیە دابنێیت، چونکە ٪۹۹ی ئەو شتە جیاوازانەی دەبێت هەموویان پێکەوە بگونجێن لە دەرەوەی کۆنترۆڵی تۆن. خەونە ناواقعییەکان خۆشیکوژن. پێشنیاری من چییە؟ ئامانجەکانت وا دابنێ با کەمێک ناڕۆشن بن – بۆ نموونە" موچەیەکی بەرز" لە جیاتی " ملیاردێر بوون" بەکاربهێنە- ئەگەر بەدەستتهێنان، نایابە. ئەگەر بەدەستت نەهێنان، ئەوا هەر دەتوانیت بارودۆخەکەت بەو شێوەیە لێک بدەیتەوە کە هێشتا – لانیکەم بەشێکت بەدەستهێناوە- تەنانەت هەر پێویست ناکات پرۆسەیەکی ئاگایانە بێت. مێشکت بۆ خۆی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بۆت دەکات.

ئەنجام؟ ئامانجەکان کاری خۆیان دەکەن. ئامانجەکان گرنگن. کەچی زۆرینەی خەڵک تەواو ڕوون لە بارەی "مانای بچووکتری ژیانەوە" بیر ناکەنەوە. یان هیچ ئامانجێکیان نییە، یان تەنها ئەو ئامانجانە قبوڵ دەکەن کە هەنووکە باون. هەرچەندە هەندێکجار، ڕێگای ژیانێکی باش واتا خۆت قنج و قیت بکەیتەوە و ئامانجە بەدەستهاتووەکانت دابنێیت. ئەوەی گرنگە بیزانیت ئەوەیە کە بەرەو کوێ دەچیت و بەخێرایی نەگەڕێیتەوە هیچ شوێنێکی کۆن.

٢٠

# دوو خودەکەت

بۆچی ژیانت ئەلبومێکی فۆتۆگرافەری نییە؟ حەز دەکەم دوو کەست پێبناسێنم، وەلێ بە ناو نا، بەڵام زۆر باش دەیانناسیت: خودی ئەزموونیت، خودی یادەوەریت.

خودی ئەزمونیت ئەو بەشەیە لە مێشکی خودئاگات کە ئەزموونی ئەم چرکەساتەی ئێستا دەکات. لە حاڵەتی تۆدا، ئێستاکە ئەم وشانە دەخوێنیتەوە. دوای تاوێکی دیکە ئەزمونی ئەوەت دەکات کە تۆ کتێبەکە دادەخەیت، دایدەنێیت، ڕەنگە هەڵبستیتە سەرپێ و کوپێک چا تێکوەربدەیت. خودی ئەزمونیت تەنها ئەزمونی ئەوە ناکات کە ئێستا دەیکەیت، بەڵکو لە کاتی کردنی ئەو کارەدا ئەزموونی ئەوەش دەکات کە بیری لێدەکەیتەوە و هەستی پێدەکەیت. هەست بە بارودۆخە جەستەییەکانیش دەکات وەک، ماندووبوون، ددانئێشە، گرژبوونی ماسولکە، هەموویان پێکەوە تێکەڵ دەکات و دەیان کات بە یەک چرکەساتی ئەزموونی هەنوکەیی.

ماوەیەک چەندی پێدەچێت؟ دەروونناسەکان بە دەست پێکردن

و تەواوبوونییەوە هەمووی بە سێ چرکە دەخەمڵێنن. ئەوە خولێکی کاتە کە ئێمە وەک چرکەساتی ئێستا هەستی پێدەکەین. لە بنەڕەتدا ئەوە هەموو ئەو شتە ئەزمونکراوانەیە کە ئێمە لە "ئێستا"دا چڕی دەکەینەوە. ماوە درێژترەکان وەک زنجیرەیەک لە چرکەساتی تاک بە تاک هەستیان پێدەکرێت. بۆ هەژمارکردنی ئەو کاتەی بە خەوتنەوە بەسەردەبرێن، ئەمە زیاد دەکات بۆ نزیکەی بیست هەزار ماوە لە ڕۆژێکدا- لە تەواوی ژیانیشدا یەک ملیار زیاتر ماوە دەکات.

چی بەسەر هەمووئەو کاریگەرییانەدا دێت کە هەموو چرکەیەک دەردەپەڕنە ناو مێشکتەوە؟ زۆرینەی زۆریان بێ ئەوەی بتوانیت بیانگێڕیتەوە وندەبن. خۆت تاقیبکەرەوە: دروست بیست و چوار کاتژمێر، دە خولەک، سێ چرکە لەمەو پێش ئەزموونی چیت کرد؟ ڕەنگە خەریکبووە بپژمیت. یان لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەت کردبێت. یان وردە نانێکت لە پانتۆڵەکانت تەکاندبێت. هەرچییەک بێت، ئێستا نەماوە. ئێمە کەمتر لە یەک لەسەر ملیۆنێکی ئەزموونەکانمان دەپارێزین. ئێمە ئامێرێکی زەبەلاحی سڕینەوەی ئەزموونەکانمانین.

ئەوە خودی ئەزموونی بوو. کەسی دووەم کە حەز دەکەم پێتبناسێنم -خودی یادەوەریت-ە. ئەو بەشەیە لە مێشکی خودئاگات کە ئەو شتە کەمانەی =خودی ئەزمونی-ت فڕێینەداون، کۆیان دەکاتەوە و دەیاننرخێنێت و دەیانناسێتەوە. ئەگەر بیست و چوار کاتژمێر و دە خولەک و سێ چرکە لەمەو پێش بە تامترین شیرینیت لە دەمتدا تام کردبێت، دواتر ڕەنگە -خودی یادەوەری-ت لە ڕاستیدا هێشتا ئەوە دەزانێت.

جیاوازی نێوان دوو خودەکەت دەکرێت بەشێوەیەکی زۆر لە ڕێگەی پرسیارێکی ئاسانەوە بخرێتە ڕوو. دڵخۆشیت؟ کەمێک کات وەربگرە تا وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە.

باشە. بە چی گەیشتیت؟ ئەگەر ڕاوێژت بە -خودی ئەزمونی-ت، کردبێت، ئەوە دروست بەگوێرەی بارودۆخ و حاڵەتی مێشکی ئەو وچانەی سێ چرکەکەی لەمەوبەر کە ئێستا ئەزموونت کردووە وەڵامت دەداتەوە. هەر وەک نوسەری ئەو وشانەی ئێستا دەیخوێنیتەوە، بە شێوەیەکی سروشتی هیوادارم وەڵامەکە ئەرێنی بووبێت. بەڵام ئەگەر پرسیارت لە -خودی یادەوەری-ت بکردایە، ئەوا خەمڵاندنێکی تەواوی هەموو میزاجت دەداتێ- بەنزیکەیی کە لەم دواییانەدا هەستت بە چی کردووە و بەشێوەیەکی گشتی چەند لە ژیانت ڕازی بوویت.

بەداخەوە بەدەگمەن هەر دوو خودەکەت هەمان وەڵام دەدەنەوە. لێکۆڵەرەوەکان لێکۆڵینەوەیەکیان لە بارەی بەختەوەری خوێندکاران لە ماوەی پشووەکاندا کرد. لەگەڵ هەندێکیاندا بەشێوەیەکی گۆترە ئەوان ڕاپرسیان لە بارەی بارودۆخی هەنووکەییان کرد و چەند جارێک لە ڕۆژێکدا پرسیارەکانیان بە نامە بۆ دەناردن. لەگەڵ هەندێکی دیکەیان دا، لە کۆتایی پشووەکەدا پرسیاریان لە خوێندکارەکان کرد. سەرەنجام؟ خودی ئەزموونی کەمتر لە خودی یادەوەری دڵخۆشتر بوو. لەڕاستیدا جێگەی سەرسامی نییە. دڵنیام لە بارەی گوڵەباخە شووشەکانەوە بیستووتە: زۆربەی شتەکان کاتێک بیر لە ڕابردوو دەکەیتەوە باشتر دەردەکەون. بەڵام ئەمە

هەروەها ئەو مانایە دەگەیەنێت کە ئێمە نابێت متمانە بە هێزی گێڕانەوەمان بکەین، چونکە ئەوان قوربانی هەڵە سیستماتیکییەکانن.

گەورەیی ئەم هەڵانە لە ڕێگەی ئەم تاقیکردنەوە زانستییەوە دەردەکەوێت. خوێندکارەکان دەستیان بۆ ماوەی خولەکێک لە ئاوێکی سارد کە پلەکەی -١٤ یە ڕادەگرن، ئەزمونێکی تەواو ناخۆشە. لە تاقیکردنەوەی دووەمدا، دەستیان بۆ ماوەی خولەکێک لە ئاوێکدا دەهێڵنەوە کە پلەکەی ١٤- یە، دواتر بۆ ماوەی سی چرکە لە ئاوێک دا دەستیان دەهێڵنەوە کە پلەکەی -١٥یـە. یەکسەر دوای ئەوە پرسیاریان لێکرا حەز دەکەن کام ئەزموونەیان دووبارە بکەنەوە. لە سەدا هەشتایان دووەمیان هەڵبژارد. ئەمە هیچ ناچێتە ئەقڵەوە، چونکە بەشێوەیەکی بابەتی ئەزموونی دووەم خراپتر بوو-هەموو ئازارەکەی ئەزموونی یەکەم بە هەندێک ناخۆشییەوە کۆدەبێتەوە لەگەڵ ناخۆشییەکی ڕێژەیی ئەزموونی دووەم.

لێرەدا چی دەگوزەرێت؟ دانیاڵ کاهنمان بەمە دەڵێت یاسای کۆتایی لوتکە کە لە بەشی یەکەمدا ڕووبەڕووی بووینەوە. ئەو درکی بەوە کردبوو کە زۆر بە ڕوونی کۆتایی زنجیرەکەمان بیردەمێنێت، بۆ نموونە چرکەساتی ناخۆشترین سەختی و کۆتاییەکەی. بە ئاستەم هیچ شتێکی دیکە بە ناو یادەوەرییەکانماندا تێدەپەڕێت. لە حاڵەتی تاقکیردنەوەی ئاوەکەدا، لوتکەی ئەزموونەکە لە هەر دوو بارەکەدا لوتکەی ئەزموونەکە وەک یەک بوون- ئاوە ساردەکەی پلە گەرمییەکەی ١٤ پلە بوو. هەرچەندە کۆتاییەکەیان جیاواز بوو. کۆتایی ئەزموونی یەکەم کە (-١٤ پلەی سەدی) بوو، ناخۆشتر بوو

له کۆتایی ئەزموونی دووەم کە (-١٥ پلەی سەدی) بوو، هەر لەبەر ئەوەیە کە بابەتی تاقیکردنەوە مێشکییەکە ئەزموونی دواینی وەک ناخۆشتر تۆمار کرد، هەرچەندە لە تێڕوانینی -خودی ئەزموونی-یەوە(کە قسەکردێنی بابەتییە) ئەوە کەمتر ناخۆشە.

تەنانەت ماوەش گرنگ نییە. خوێندکارەکان بە هیچ شێوەیەک درێژی ماوەی تاقیکردنەوە زانستییەکەیان لەبەر چاو نەگرت، کە ئاخۆ شەست چرکەیان پێچووە یاخود نەوەد چرکە. ئەمە بەشێوەیەکی گشتیتر هەر ڕاستە: گرنگ نییە کە ئاخۆ بۆ ماوەی هەفتەیەک یاخود سێ هەفتە لە پشوودایت ، بەنزیکەیی یادگارییەکەت هەر هەمان شت دەبێت. بە هەمان شێوە، بۆ ماوەی مانگێک لە زینداندا بیت یاخود ساڵێک، ئەوە هیچ جیاوازییەک دروست ناکات بۆ یادەوەریت- ئەو ماوەیەی لە پشت شیشەکانی زیندانەوە بەسەرت بردوون لەبیردەچنەوە. ئەم بێلایەنییە مێشکییە پێیدەگووترێت پشتگوێخستنی ماوە، ئەمە جگە لە یاسای کۆتایی لوتکە هەستیارترین هەڵەیە کە -خودی یادەوەریت- بیکات.

لە کاتێکدا -خودی ئەزموونی-ت دەستبڵاوە، (هەموو شتێک تۆڕ دەدات)، خودی ئەزموونی بەشێوەیەکی بەرچاو هەڵە بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت و ئێمەش بەرەو ئەوە دەبات بڕیاری هەڵە بدەین. بەهۆی خراپ هەژمارکردنی -خودی یادەوەری-مانەوە، ئێمە مەیلی ئەوە دەکەین خۆشییە کورت و خێراکان بەشێوەیەکی باڵا و بەبێدەنگی بەرز دەنرخێنین، خۆشییە هێمنەکان زۆر کەمەکان کۆتاییان دێت: خۆهەڵدان بە حەبل لە جیاتی هەڵگەڕانی دوور و درێژ بەسەر شاخدا،

مانەوەی یەک شەوی هەستبزوێن لە جیاتی سێکسی بەردەوام لەگەڵ هاوسەرەکەتدا، ڤیدیۆی سەرنجڕاکێش لە جیاتی خوێندنەوەی کتێبێکی باش.

ژانرایەکی تەواو هەیە سەرتاپا لە بارەی " ژیانی توندوتیژی"یەوەیە. نوسەرەکانیان زۆربەیان بە تایبەت پەیامنێری جەنگن، شاخگەڕی پەڕگر، فرۆشیاری تازە دەست بەکارکردوو، یان هونەرمەندی نمایشکار. ئەوان ئامۆژگاری ئێمە بەوە دەکەن کە ژیان لەوە کورتترە تا چێژی مامناوەندیت هەبێت. تەنها بە ئەندازەیەکی زۆر بەرز یاخود زۆر نزم لە ڕاستیدا دەتوانیت "هەست" بە هەر شتێک بکەیت. ژیانێکی ئاسایی و ئارام ژیانێکی شکستخواردووە. ئەم نوسەرانە و خوێنەرەکانیشیان کەوتونەتە داوی -خودی یادەوەری-یەوە. بە پێی پەتی ڕاکردن بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا یاخود بەسەر چیای ئەڤرێست دا بە ماوەیەک کە ڕیکۆرد بشکێنیت تەنها کاتێک سەیری ڕابردوو دەکەیتەوە دەتوانرێت وەک ئەزمونێکی ناوازە سەیر بکرێت. لە کاتی خۆیدا، ئەوانە ئەشکەنجەن. وەرزشە توند و پەڕگرەکان لەسەر حسابی بەختەوەری چرکە بە چرکە خۆراک بە یادەوەریمان دەدەن.

کەواتە کامیان گرنگە، -خودی ئەزمونیت- یاخود -خودی یادەوەری-ت؟ بەدڵنیاییەوە هەردووکیان. هیچ کەس نایەوێت یادەوەرییە مەزنەکان لە یادگەی خۆی وەدەربنێت. کەچی ئێمە هێشتا مەیلی ئەوە دەکەین زیاد لە پێویست خودی یادەوەری بنرخێنین، لە جیاتی ئەوەی تەرکیز بخەینە سەر ئەم چرکەساتەی ئێستامان،

چاوێکمان لەسەر ئەو هەموو یادەوەرییانەیە کە لە داهاتوودا دەمانێت.
ئاگاداری ئەم پاڵنەرە بە. بڕیاربدە کە چی گرنگە بۆت: ژیانێکی چرکە
بە چرکەی پڕ لە دڵخۆشی یاخود ئەلبومێکی فۆتۆگرافەری پڕ؟

## ٢١

## بانکی یادەوەری

## ئەزموونی یادەوەری یارییە کاغەزییەکان بکە

باشترین ئەزموونی کە ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان بیگەیتێ وێنای بکە و بیهێنەرە پێشچاوی خۆت- دە ساڵ دەریـاڕەوی کردن لە دەریای کاریبی دا، یان لەوانەیە گەشتکردن بە گەلە ئەستێرەیەکدا بێت، یان داوەتێک لەگەڵ خودی خودا خۆی دا بێت، یان -چیڤەل بلانک ڤاندەرمێولن-ێکی ساڵی ١٩٤٧. ئامادەیت چەند پارە بدەیت بۆ ئەوەی ئەم ئەزموونە نمونەییە بکەیت؟

قەدەرێک بوەستە بۆ ئەوەی چەند سەردێڕێکی گرنگ بنوسیت بۆ وەسفکردنی ناوازەترین کە بە خەیاڵتدا دێت، و ئەگەر بخرێتە مەزادەوە بەرزترین ڕێژەی پارەی تۆ چەند دەبێت.

ئەمە پرسیارێکی دیکە بە دوای خۆیدا ڕادەکێشێت: ئەگەر نەتتوانی دوای ئەوە بیرت بێتەوە مەیلت لێیە چەند پارە بدەیت بۆ بیرهاتنەوەت؟ ئەگەر تەنانەت هەر دوور و نزیک بیرت نەهاتەوە بەختە -کاریبی-یەکەت چۆن بوو. ئەگەر دوای گەڕانەوەت لە

جلوبەرگە سەرنشینییە ئاسمانەوانییەکەتەوە گەڕایتەوە بۆ سەر زەوی و بە هیچ شێوەیەک بیرت نەهاتەوە هەسارە دوورەکانی کۆمەڵەی خۆر سەوز بوون، شین یاخود سوور. ئەگەر نەتتوانی بیگێڕیتەوە کە ئاخۆ خودا ژن یاخود پیاو بوو، یان بە تەنها تامی گەشتەکەت کردووە. ئەگەر بە کامی دڵی خۆت بیرت لێبکردایەتەوە و بتهێنایە و بتبردایە، کەچی هیچ شتێکت بیر نەهاتایەتەوە، تەنانەت هیچ شوێنپێیەکیش. زۆربەی ئەو کەسانەی پرسیاریان لێدەکەم لە وەڵامدا دەڵێن کە ئەزموونێکی لەو جۆرە شایستەی بوون نییە.

ڕەنگە تۆش هەست بە هەمان شت بکەیت. بەڵام ئەگەر دوای ڕۆژێک، ساڵێک، دەیەیەک ئەزموونەکەت لەبیر بمێنێت ئامادەیت چەند بدەیت؟

بەداخەوە هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کە لە بنەڕەتدا لە لایەن -دانیال کاهنمان-ەوە، پشتڕاست کرابێتەوە بوونی نییە. ئەو وەڵامانەی من کۆمکردونەتەوە ئەفسانەیین، بەڵام ڕایە باوەکەی ئەوەیە کە ئەزموونەکان تەنها ئەو کاتانە هەژمار دەکرێن کە لەبیرت بن. با بەم دیاردەیە بڵێین بانکی زانیاری. تا زیاتر لەگەڵ یادگارییەک دا بژین، بەهاکەی گەورەتر دەبێت. ئەگەر یادگارییەکی -ئەرێنی- تا ئەو ڕۆژەی دەمریت لەو بانکەدا بمێنێتەوە، ئەوا کاتێک بیری لێدەکەیتەوە، ئەو یادگارییە بە شێوەیەکی باڵا بەهادار دەبێت. ئەگەر تەنها نیوەی کاتەکە بەردەوام بێت، ئەوا بەهاکەی نیوە دەبێت، ئینجا بەو شێوەیە، تا بەهاکەی دەکاتە خاڵی سفر. بێ یادەوەری، ئەزموونەکان بە تەواوی بێبەها سەیر دەکرێن. ئەمە

مایەی سەرسامییە و بە هیچ شێوەیەک مانا نابەخشێت. بەدڵنیاییەوە وا باشترە ئەزمونی شتێکی ناوازە بکەیت وەک لەوەی نەیکەیت، بێ گوێدانە ئەوەی ئاخۆ بیرت دەمێنێت یاخود نا. سەرەڕای هەموو شتێک، لە ماوەی ئەزموونەکەدا کاتێکی زۆر نایاب بەسەردەبەیت! ئینجا هەر ئەو کاتەشی مردین، منیش و تۆش هەموو شتێک لەبیردەکەین، چونکە چی دیکە "من" و "تۆ"یەک بوونی نامێنێت.[18] ئەگەر مەرگ بەنیاز بێت هەموو یادەوەرییەکان لەگەڵ خۆی بەرێت، کەواتە گرنگییەکەی لە چیدایە تا دوای هەناسەی ژیانمان هەڵتەک هەڵتەک ئەو یادەوەرییانە بدەین بە کۆڵماندا؟

شتێکی سەرنجڕاکێش دەبێت ئەگەر دونیای سۆزداری ئەو کەسانە بدۆزیتەوە کە نەخۆشی - دیمێنیشیا[19]-یان هەیە، چونکە ئەوەی دروست ئەوان ئەزموونی ئەوە دەکەن بریتییە لە: ئەزموونکردنی چرکە بە چرکەی زنجیرەیەک ڕووداوی کاتی بێ ئەوەی دواتر هیچ یادەوەرییەکیان لێ بەجێبمێنێت. ئەوەندەی ئێمە دەیزانین، ئەمە وەسفی ژیانی سۆزداری زۆربەی ئاژەڵەکانیش

---

[18]- خوێنەری هێژا، نوسەر لە چەندین شوێنی ئەم کتێبەدا ڕای کەسی خۆی بەڕاشکاوانە دەربڕیوە و بەندە وەک وەرگێڕێک کۆک نیم لەگەڵیدا و هاوبیری نیم, بۆیە ئێمەش وەک ئەرکێکی ئەخلاقی هەستاوین بە وەرگێڕانی. وەرگێڕ

[19] دیمێنیشیا: جۆرە نەخۆشییەکە کە نەخۆش بەهۆی بریندار بوونەوە یاخود زەبری قورس بەرکەوتن بەر سەری یان هەر جۆرە نەخۆشییەکی دیکەوە بێت، نەخۆش ناتوانێت بەشێوەیەکی ئاسایی بیربکاتەوە, شتی بیربێتەوە, یاخود مامەڵە بکات.

بەڵام یاخود هیچ یان بڕێک یادگاری زۆر کەمیان لەبیر دەمێنێت.
ڕەنگە هەندێک جار سەرنجی ئێشکگرەکانی خانەی بەساڵاچوانت
دابێت کە بەشێوەیەکی توند مامەڵە لەگەڵ نەخۆشە -دیمێنیشیا-
کانیان دا دەکەن، بیانووی ئەوە دەهێننەوە کە" هەرچۆنێک بێت
ئەوان بیریان نایەتەوە." ڕەنگە ئەمە ڕاست بێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە
نەخۆشەکان لەو کاتەدا ئەزموونی دەکەن. -خودی ئەزمونی-یان بە
ئاسایی وەریدەگرێت و هەمان شتیش بەسەر تۆدا جێبەجێ دەبێت.

لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەردەخەن کە خەڵکی کاتێکی ئەزمونێکی
ئەرێنییان بیر دەکەوێتەوە هەست بە دڵخۆشی زیاتر دەکەن، بە
تایبەتی کاتێک لە چاویلکەیەکی نۆستالیژیکی[٢٠] گەشبینانەوە
لێیدەڕوانن. بەشێکی زۆری دەروونناسەکان گەیشتوونەتە ئەو
خاڵەی کە دەبێت کات تەرخان بکەین بۆ ئەوەی بە مەبەست ساتە
خۆشەکانی ڕابردوو بیر خۆمان بهێنینەوە. پێشنیارێکی گوماناوییە.
بۆچی ئەم کاتە ئاراستە نەکەین لە دروستکردنی ئەزموونی
سەرنجڕاکێشدا بۆ خۆمان لە ئێرە و لە ئێستادا؟ هەوڵی خوئاگایانەی
ئەزموونکردنی ئەم چرکە ساتە هیچ مەزنتر نییە لە سڕینەوەی
یادگارییە کۆنەکان. بە پێچەوانەوە، ئەو شتانەی ئێمە لە ئێستادا
ئەزموونیان دەکەین، زۆر بەهێزتر و بەچێژتر و ڕەنگاڵەترن لەو
سەفتە یادگارییانەی کە تەپوتۆزیان لەسەر نیشتووە. پێویست ناکات
ئەزموونی خۆهەڵدان لە پەڕەشوتێکی بەرزەوە یاخود خۆرئاوابونێکی

٢٠٥- نۆستالیژیا: هەستێکی تێکەڵە لە دڵتەنگی و چێژ و سۆز کاتێک بیر لە کاتە خۆشەکانی ڕابردوو دەکەیتەوە.

نایاب بکەیت، بۆ ئەوەی چێژ لەم چرکەساتە وەربگریت. تەنانەت ئەگەر، هەر وەک ئێستا، کە لە سەر کورسییەک دانیشتوویت و ئەم بەشە دەخوێنیتەوە -هیوادارم- زنجیرەیەک کاتی چێژبەخش و نایاب ئەزموون بکەیت. بە خود ئاگاییەوە ئاگاداری ئەم چرکەساتانە بە، بە جەستە هەستیان پێبکە لە جیاتی ئەوەی مێشکی خۆت بنکۆڵ بکەیت بۆ یادگارییە کۆنەکان. هەر چۆنێک بێت زۆر قوڵ ناڕۆیت. بۆ نموونە لە گەشتێکی پشوودا تۆ تەنها خۆشترین و -ناخۆشترین- و دوایین بەشی گەشتەکەتت لە بیرە. هەر وەک لە بەشی ٢٠ دا بینیمان، ئەمە لە لایەن -کەهنمان-ەوە پێیدەگووترێت یاسای کۆتایی لوتکە. لەوانەیە دوو دیمەن یاخود سێ دیمەنمان بیر بکەوێتەوە، بەڵام ئەوە ئەوپەڕەکەیەتی. کەچی خەڵکی هێشتا وا دەزانن کە چۆن سەیری فیلمێک دەکەن بەو چەشنە یادگارییەکانیان لێبدەنەوە. نەخێر، یادگارییەکان، یەک ڕوانگە، تەنک، خەیاڵی، زۆربەی کات بەهەڵەدا بەرن و هەڵخەلەتێنەر و هەر لە بنەڕەتەوە بێبەرن. بە کورتی و بە پوختی، ئێمە زیاد لە پێویست قەدری یادگارییەکانمان دەگرین و بە کەم سەیری ئەزموونی ئەم چرکەساتەمان دەکەین.

لە کۆتاییدا، لە ساڵەکانی ١٩٦٠ دا، هۆشیاربوونەوە لە " ئێرە و ئێستا" دا، سەرنجی ڕای گشتی بە لای خۆیدا ڕاکێشا، گەنجەکان دەستیان بە تاقیکردنەوەیەکی زانستی لەسەر ئێل ئێس دی[٢١]، ئەویش سێکسی خۆڕایی و " ئاهەنگی جەماوەری هەوانتەیی بوو". لە ساڵی

---

٢١- ئێل ئێس دی: ماددەیەکی هۆشبەری نایاسایی بەهێزە کە وا لە کەسی بەکارهێنەر دەکات هەندێک شت ببیستێت و ببینێت کە لە ڕاستیدا بوونیان نییە.

١٩٧١ دا ڕیچارد ئەلپێرت مامۆستای بەناوبانگی زانکۆی هاڤارد – کە بە ناوە هیندییە ئایینییەکەی ناسراوە ئەوە " ڕام داس"ە، پڕفرۆشترین کتێبی بڵاوکردەوە بە ناوی " لە ئێستادا لێرە بە." لە ژیانتدا توشی دروشمێکی باشتر نابیت لەم بوارەدا. بەشێوەیەکی بنچینەیی ڕام داس لە شێوازی فێرکاری کۆنی –بوزی-یەکانەوە شتێکی نوێی بەرهەمهێنا و لە ڕۆژئاوادا بەکاریهێنا. ئەمڕۆ، بیرۆکەی " هەست بە بوون کردن لەم چرکەساتەدا"ی سالی شەستەکان، برەوی پەیدا کردۆتەوە، ئەمڕۆ بە "هۆشمەندی" وەسف دەکرێت. کۆمەڵەیەکی بژاردە کە پێکهاتوون لە شارنشینە مۆدێلخوازەکان، مامۆستایانی یۆگا، ڕاهێنەرانی شێوازی ژیان بەتەواوی خولیای ئەم بیرۆکەیەن.

ئەمە بە تەوای باش و بەسوودە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە " هۆشمەندی" لەگەڵ "بیرنەکردنەوە لە داهاتوو" تێکەڵ دەکرێت. ئەمە هەڵەیە. وەک پەندە خۆشەویستەکەی بەردەوام دەگووترێتەوە" هەموو ڕۆژێک وا بژی وەک ئەوەی دوایین ڕۆژت بێت."[٢٢] کە هەمیشە لەسەر ڕۆژمێرەکانمان ئەم وتەیە زۆر بەربڵاو بووە، ئامۆژگارییەکی گەمژانەیە کە یان فڕێتدەداتە سەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە، یان دەتنێرێت بۆ بەندینخانە، یان کاتەکەی دیار نییە کەی سەرت دەکات بە قوڕدا. بەشێکی ژیانێکی باش ئەوەیە کە ئامادەکاری بکەیت بۆ داهاتوو، مەترسییەکان زوو بناسیتەوە، بۆ

---

٢٢– وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد ئەمە تەنها ڕای خودی نوسەر خۆیەتی و ئێمە لەگەڵیدا هاوڕا نین، بۆیە وەک ئەرکێکی ئەخلاقی وەرمانگێڕاوەتەوە. وەرگێڕ

ئەوەی توخنیان نەکەویت.

پەیامی کۆتایی؟ مێشکی ئێمە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی مامەڵە لەگەڵ هەر سێ توێژاڵە کاتەکەدا دەکات، ڕابردوو، ئێستا، داهاتوو. کرۆکی بابەتەکە ئەوەیە کە تەرکیز دەخەینە سەر کامیان. پێشنیاری من ئەوە نییە کە خۆت لە پلانی دوور مەودا لابدەیت، بەڵکو ئەوەی شایستەی ئەوەیە هەموو تەرکیزتی بە تەواوەتی بخەیتە سەر، ئێستایە. زۆرترین کاتەکانت با ئەزموونکردنی ئەم چرکەساتەی ئێستات بێت، لەجیاتی نیگەران بوون بە یادگارییەکانی داهاتووەوە. لە جیاتی ئەوەی وێنەی بگریت چێژی تەواو لە خودی خۆرئاوابوونەکە خۆی وەربگرە. ژیانێکی پڕ لە یادگاری جوان، هەرچەندە یادگارییەکانیشی لەبیرچووبنەوە، هەر ژیانێکی جوانە، کەواتە واز لە بیرکردنەوە لە هەڵگرتنی ئەزموونەکان بۆ بانکی یادگاری-ت بهێنە.

۲۲

# چیرۆکەکانی ژیان درۆن

## بۆچی بە وێنەیەکی خودی هەڵەوە بە ژیاندا دەگەڕێین؟

چی لە بارەی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دەزانین؟ ڕاستییەکەی: لە ساڵی ۱۹۱٤ دا جەنگاوەرێکی ئاشتیخوازی سربی تەقەی لە سەرۆکی شوێنگرەوەی هەنگاری- نەمسایی لەسەر تەختەکەی خۆی لە سەرایڤۆ کرد، بەهۆی ئەمەوە هەنگاریا و نەمسا جەنگیان لە دژی سربیا ڕاگەیاند. لەبەر ئەوەی هەموو وڵاتە ئەوروپییەکان پەیماننانەی مۆرکراو لە نێوانیاندا هەبوو، لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا هەموویان لە جەنگەکەوە تێوە گلان. لەبەر ئەوەی هیچکام لە بەرەی هاوپەیمانەکان بەرەی زاڵ نەبوو، بۆیە هەر زوو بەرەکانی پێشەوەی جەنگ بوو بەستی و بوو بە شەختە و سەهۆڵبەندان. جەنگێکی بێ ئاکام بوو، کە دەرەنجام بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆری خەڵک بەکوشت بدرێن، -ڤێردەن-یش بوو بە سیمبوڵی سزادانی سەنگەرەکانی پێشەوەی جەنگ. دوای چوار

ساڵ و کوشتنی هەژدە ملیۆن کەس، هەموو شتێک کۆتایی هات.

ڕەنگە کەمتر یان زیاتر بەم شێوەیە جەنگی یەکەمی جیهانی پوخت بکەیتەوە. ئەگەر کەسێکی مێژووی نەبیت- چونکە لەو حاڵەتەدا بەدڵنیاییەوە دەزانیت کە بەو شێوەیە نەبوو. ڕووداوەکانی جەنگەکە زۆر زیاتر، ئاڵۆزتر، بنبەستتر و تێکچڕژاوتر بوون لەگەڵ ئەو چیرۆکانەی لە سەری ئێمەدا هەن و بڕوایان پێدەکەین. لە ڕاستیدا [٢٣]هێشتاش نازانین کە بۆچی جەنگی یەکەمی جیهانی بەتایبەتی لە سربیا دەستپێیکرد. ئەو ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر پیلانی کوشتن هەبوو(زۆر زیاتر لەوانەی ئەمڕۆ هەن). ئەڵمانیا هەر بە سانایی دەیتوانی جەنگ بەرامبەر فەڕەنسا ڕابگەیەنێت یاخود بە پێچەوانەوە. هێشتا نازانین کە بۆچی ئەو بەرانەی پێشەوەی جەنگ زیاد لە پێویست تولْیان کێشا. ئەو داهێنانە هەمەجۆرانەی لە بواری تەکنەلۆجیای چەکدا دەرکەوتبوون بەماوەیەکی کورت کەوتنە بەردەست (ئامێری چەکەکان، تانکەکان، گازی ژەهراوی، ژێردەریایی، دەرکەوتنی وردە وردەی هێزی ئاسمانی)، کاتێک سەیری ڕابردوو دەکەین وا دەردەکەون کە وەک ئەوەی دەبوو بەرەو هێڵیک جەنگی زۆر درێژەوەبوو تر بمانبەن.

زۆر جار مێشکی مرۆڤ بە کۆمپیوتەر بەراورد دەکرێت. ئەم بەراوردە بە کەڵک نایەت. گەنجینەی کۆمپیوتەرەکان بۆ هەڵگرتنی زانیاری داتای سەرەتایی –بیت Bit– بەکاردەهێنێت کە بچووکترین یەکەی زانیارییە لە کۆمپیوتەردا. مێشکی مرۆڤ داتای سەرەتایی نا، بەڵکو داتای بەردەوام خەزن دەکات. شێوازی دڵخوازیان بۆ

٢٣

هەڵگرتنی زانیاری –بیت- نییە، بەڵکو چیرۆکە. بۆچی؟ چونکە بۆشایی هەڵگرتنی زانیاریمان لە ناو کەللە سەرماندا سنووردارە. هەژدە ملیار خانە لە مێشکدا زۆر دەردەکەوێت، بەڵام ئەوە ئاسمان و ڕێسمانی جیاوازە لەگەڵ ئـەوەی ئێمە پێویستمانە بۆ ئەوەی هەرچی دەیبینین، دەیخوێنینەوە، دەیبیستین، بۆنی دەکەین، تامی دەکەین، بیری لێدەکەینەوە، هەستی پێدەکەین خەزنی بکەین لە یادگەماندا. بۆیە مێشک گەشەی بە فێڵێک بۆ پەستاندنی داتاکان داوە ئەویش: چیرۆکە.

لە ژیانی واقیعدا هیچ چیرۆکێک بوونی نییە. دەتوانیت بە کامی دڵی خۆت دە ساڵ هەر حەوت کیشوەرەکەی دونیا بە چاویلکەیەکی گەورەکەرەوە کونپشک بکەیت، بەرد بە بەرد هەڵیبدەیتەوە، یەک تاکە چیرۆک نادۆزیتەوە. بەرد، ئاژەڵ، ڕووەک، کەڕوو دەدۆزیتەوە... ئەگەر بە میکرۆسکۆبەوە بگەڕێیت تەنانەت خانە، گەردیلە، ئەتۆم، لە کۆتاییشدا پێکهێنەرە وردیلەکانی گەردیلەش دەدۆزیتەوە. بەڵام هیچ چیرۆکێک نادۆزیتەوە. تەنانەت ئەگەر لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیشدا زیندوو بوویتایە، با بەشێوەیەکی بابەتی قسە بکەین، ئەوا تۆ جەنگێکی جیهانیت نەدەبینی، بەڵکو ئەو سەنگەرانەت دەبینی کە پڕ بوون لەو کەسانەی خودەی ئاسنینی سەربازی نامۆیان لەسەردا بوو، دارستانەکان جگە لە بنکی درەخت هیچی دیکەیان لێنەمابوو، فیشەک بە ئاسماندا ویزەی دەهات، چەندین لاشەی لە هەژمار نەهاتووش لەسەر زەوی کەوتبوون، چ لاشەی مرۆڤ چ لاشەی ئەسپیش.

مێشک چۆن ئەم حەقیقەتانە دەچنێت و دەیانکات بە یادەوەرییەک؟ لە ڕێگەی پێکەوە بەستنیان و کردنیان بە چیرۆکێکی، پوخت، ڕێک، هۆکاری. پوخت: چیرۆکەکان کورت و ئاسان و خاڵین لە کون و کەلەبەر. ڕێک: خاڵین لە هەموو دژیەکییەک. پەیوەندییەکی ڕوونی هۆکارەکان بە دەرەنجامەکانەوە هەیە،- أ- دەگات بە -ب- ئەویش دەگات بە -ج- درێژەی ڕووداوەکانیش دەچنە ئەقڵەوە.

مێشکی ئێمە ئەمە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەکات. ئەمە تەنها پەیوەندی بە حەقیقەتەکانی جەنگەوە نییە، بەڵکو گۆڕانکاری لە پشکی کۆمپانیاکان و خواستی مۆدێل و هەروەها ژیانی خۆشمان دەگرێتەوە. بونیادنانی چیرۆک ئەرکی بنچینەیی -خودی یادەوەری- تە، کە دەتوانت لە بەشی پێشوودا بیخوێنیتەوە. چیرۆکی ژیانت پێتدەڵێت تۆ کێیت، لە کوێوە هاتوویت، بۆ کوێ دەچیت، چی بە لای تۆوە گرنگە. هەروەها پێشی دەگووترێت "خودی" تۆ یاخود " وێنەی خودی"ت. چیرۆکی ژیانت پوختە، ئەگەر کەسێک لێتبپرسێت کێیت، ئەوا تۆ وەڵامێکی کورت و پوخت و ئامادەکراوت پێیە. ڕێک: ئەو شتانەی ناگونجێن سووک و ئاسان لەبیر دەکرێن، ئەو بۆشاییانەشی لە یادەوەرییەکانتدا هەن بە بەهرەی داهێنەرانەی سەرسامکەر پڕیان دەکەیتەوە(بەهرەیەک کە تەنانەت خۆشت نازانیت هەتە). هۆکارییە: کردارەکانت دەچنە ئەقڵەوە- هۆکارێک لە پشت هەموو ئەو شتانەی لە ژیانتدا ڕوودەدەن هەیە. پوخت، ڕێک، هۆکاریی.

ئەی ئەو چیرۆکەی لە مێشکتدا هەر دەیهێنێت و دەیبەیت چەند واقعییە؟ هەر بەنزیکەیی هێندەی تابلۆی ئەو کوڕە سێ ساڵانەیەی

بە دەست کێشراوە لە ژووری دانیشتنەکەمدا هەڵواسراوە واقعیە. لەوانەیە ئێستا بڵێیت: ئێ، باشە، بەس ئەوە کێشەیە؟ هەر زۆریش کێشەیە! لێرەدا چوار هۆکار هەن بۆ ئەمە:

یەکەم: ئێمە زۆر خێراتر لەوەی بیری لێدەکەینەوە دەگۆڕێین. ئەمە ڕاستییەکە پەیوەندی بە حەز و ڕقی ئێمەوە نییە ( ئەو شتانەی خولیامانن، مۆسیقا دڵخوازەکەمان، خواردنە دڵخوازەکەمان)، بەڵکو ئەوە یەکێکە لەو شتە جێگرانە وەک تایبەتمەندی و بەهای کەسایەتیمان. ئەو کەسەی بیست، یاخود چلساڵی داهاتوو دەبێت بەو، لەبەر خاتری باشی داهاتووی ئەو، ئەمڕۆ تۆ ڕۆژ و شەو دەخەیتە سەر یەک- حەفتا کاتژمێر لە هەفتەیەکدا ڕەنج دەکێشیت، منداڵ بەخێو دەکەیت، ماڵێک بۆ ڕۆژە پشووەکانت دەکڕیت- ئەوا گرەنتی ئەوەت کراوە کە کەسێکی جیاواز دەبێت وەک لەوەی ئێمە وێنای دەکەین. ڕەنگە ئەو کەسە چیتر ماڵێکی بۆ پشووەکانی نەوێت، لەوانەشە بێ ئەوەی تێبگات ئاوڕێک بداتەوە و سەیرێکی سەکتەی دڵت و حەفتا کاتژمێر کارکردنەکەت لە هەفتەیەکدا بەهۆی کارکردن بێت بۆ خاوەن پشک و خاوەنکارە بێبەزەییەکانتەوە بوو بێت.

دووەم: ژیانمان وا دەردەکەوێت زیاتر لەوەی لە ڕاستیدا هەیە گوێ لە مشتی پلانەکان بێت. بەخت ڕۆڵێکی زۆر لەوە گەورەتر دەبینێت وەک لەوەی ئێمە حەزدەکەین وابێت. بیرۆکەی چارەنوس -فۆرتونا- خودای مێینەی بەخت- ئەوە ئامرازێکی ڕۆشنبیرەکانە کە زیاتر لە هەزار ساڵە تاقیکراوەتەوە- لە سەد ساڵی داهاتوودا هەر خەریک بوو بە تەواوەتی لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵبکەندرێت. هەر لەبەر

ئەمەیە کاتێک شتێکی خراپ و ناخۆش ڕوودەدات ئەوەندە توشی خەمۆکی دەبین. کارەسات، شێرپەنجە، جەنگ، مەرگ. تا سەدەی پێشووش ئەم کارەساتانە بە ئامادەباشییەکی زیاترەوە قبوڵ دەکران. خەڵکی لە ڕووی مێشکییەوە ئامادەی سەردانێکی -فۆرتونا- بوون. ئەمڕۆ چارەنووس دەرخەری "شکستی سیستەم"دەکەیە. بەشێک لە ژیانێکی باش گێڕانەوەی ئامێرێکی مێشکی وەک فۆرتونایە بۆ شوێنی ئەسڵی خۆی.

سێیەم: چیرۆکی هەڵبەستراوی ژیانمان وا دەکات سەخت بێت بە سانایی و بە تەنها بڕیار لە بارەی حەقیقەت و فاکتەکانەوە بدەین- بێ لێکدانەوە، بێ ژینگەو بارودۆخەکە، بێ بەهانە و بیانوو. بەهانەکان وەک ئیستۆپی ئۆتۆمۆبێل وان لە پەند وەرگرتن لە هەڵەکانمان دەمانوەستێنن.

چوارەم: ئێمە خۆمان بە باشتر- جوانتر، سەرکەوتووتر، ڕۆشنبیرتر- لەوەی لە ڕاستیدا هەین دەبینین. ئەم -لایەنگیری خود خزمەتکردنە- دەمانگەیەنێت و بە هەڵە و ڕیسکی زیاتر وەک لەوەی پێچەوانەی ئەوە بکەین. دەمانگەیەنێت بەوەی بەشێوەیەکی زۆر باڵا بیر لە خۆمان بکەینەوە.

ئەنجامی کۆتایی ئەوەیە کە ئێمە بە وێنەیەکی خودی هەڵەوە دەسوڕێینەوە، باوەڕمان وایە ئێمە کەمتر شێواوترین، بێکێشەترین، دووڕووین وەک لەوەی لە ڕاستیدا هەین. بۆیە سەرسام مەبە کاتێک کەسێک بەشێوەیەکی "ناڕاست" بڕیارت لە بارەوە دەدات. تۆ خۆشت هەمان شت دەکەیت. وێنەیەکی خودی ڕاستەقینەت

تەنها لە ڕێگەی کەسێکەوە دەچنرێتەوە کە ساڵانێکی زۆرە چاک چاک دەتناسێت و لە ڕاستگۆییش ناترسێت- ئەویش هاوسەرەکەت یان هاوڕێیەکی کۆنە. لەوەش باشتر، بەردەوام با یاداشتنامەیەکت هەبێت، زوو زوو دەری بهێنە و سەیرێکی بکە. سەرت دەسوڕمێت بەو شتانەی بە نوسینیان ڕاهاتبوویت. بەشێکی ژیانێکی باش چەند بە واقیعییانە دەگونجێت خۆت ببینیت- بە کەموکورتی و دژێتی و لایەنە تاریکەکان و هەموو شتەکانییەوە. ئەگەر بەشێوەیەکی واقعی سەیری خۆت بکەیت، ئەوا دەرفەتێکی زۆر زیاترت لەبەردەستدایە بۆ بوون بەو کەسەی دەتەوێت.

٢٣

## هەڵەی بیروباوەڕی "مەرگێکی باش"
## بۆچی دواین چرکەساتەکانت نابێت نیگەرانت بکەن؟

دڵنیام ئەم قسە پڕ لە سۆز و بەزەییە دەناسیتەوە" کاتێک لەسەر چرپای مەرگم و ئاوڕێک لە ژیانم دەدەمەوە..." بیرۆکەیەکی بەرز، بڵند، نایاب، بەڵام بێمانا لە ڕووی کردارییەوە. بۆ ئەوەی دەست بە بابەتەکەمان بکەین، بەنزیکەیی هیچ کەسێک کاتێک پێی لە لێواری قەبرە بەو ڕوونییە نادوێت. سێ دەرگای سەرەکی بۆ ژیانی دوای مردن، سەکتەی دڵ، سەکتەی دەماغ، شێرپەنجەن. لە دوو حاڵەتی یەکەمدا کاتت نییە فەلسەفە هەڵبڕێژیت. لە زۆربەی حاڵەتەکانی شێرپەنجەشدا، تا بینە قاقات ئازارشکێن دەکەن بە قوڕگتدا ئەمەش واتلێدەکات نەتوانیت بە ڕوون و ڕێکی بیربکەیتەوە. ئینجا ئەوانەی نەخۆشی -دێمینیشا- و -زەهایمەر-یان هەیە هیچ قسەیەکی ڕوون و ئاشکرایان لەسەر چرپای مەرگ لێنەبیستراوە. تەنانەت ئەگەر کاتیشت هەبێت و لەوێ لەدوا چرکەساتەکانتدا شتت

بیربکەویتەوە ئەوا یادەوەرییەکانت – وەک لە سێ بەشی پێشوودا باسمان کرد- بە تـەواوی کـاردانـەوەی بۆ واقیع نابێت. خودی یادەوەری-ت چەندین هەڵەی سیستماتیک بەرهەم دەهێنێت. چیرۆکی دوور و درێژ دەگێڕێتەوە.

لە بنەڕەتدا، خۆی قابیلی ئـەوە نییە سـەری خۆمان بئێشێنین بەم -هایپۆسیس-انەی، لە بارەی چرکەساتی مردن یاخود دوایین کاتژمێرەکانی ژیانتەوە هەن. بڕوام پێبکە، وەک ئەوە نابێت کە ئەمڕۆ وێنای دەکەیت. تەنانەت لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە ئەوەی لە دوایین چرکەساتەکانی ژیانتدا هەستی پێدەکەیت دوور و نزیک پەیوەندی بە هەلومەرج و بارودۆخی سەرتاپای ژیانتەوە نییە. بیرکردنەوە لە دوا چرکەساتی ژیانت بێبەروبوومە و تەنها لە ژیانێکی باش دوورت دەخاتەوە.

دانیاڵ کاهنمان بەشێوەیەکی سیستماتیک چەندین درز و کەلێنی لە یادەوەرییەکانماندا دەرخستووە. یەکێک لە پشتگوێخستنەکانی ماوە ئەوەیە: مـاوەی زنجیرەیەک هیچ کـاردانـەوەیـەک لە یادگەی ئێمەدا جێناهێڵێت. کاتێک بیر لە ڕابردوو دەکەیتەوە مێشکی تۆ گەشتێکی سێ هەفتەیی نە ئەرێنییانە نە نەرێنییانە لە هەفتەیەک زیاتر هەژمار ناکات. لە ڕووی تێکڕای خەملاندنتەوە، تەنها لوتکەی کۆتایی گەشتەکەت گرنگە ( یاسای کۆتایی لوتکە لە بەشی ٢٠ دا پێی ئاشنابووین) تۆ فیلمێکی پڕ لە جۆشوخرۆشت بیر دەمێنێت لە کات سەیرکردنیدا، بەڵام ئەگەر کۆتاییەکەی ناخۆش بوو ئەوا وەک فیلمێکی خراپ سەیر دەکرێت. هەمان شت بۆ، ئاهەنگ، کۆنسێرت، کتێب، وانـە، ماڵەوە، پەیوەندییە

سۆزدارییەکان ڕاستن.

ئایا هەمان شت بەسەر سەرتاپای ژیاندا جێبەجێ دەبێت؟ با بزانین. با ژیانی ئانا بنرخێنین" ئانا هەرگیز هاوسەرگیری نەکردبوو، منداڵیشی نەبوو. زۆر دڵخۆش بوو، چێژی لە کارەکەی دەبینی. هاوڕێ زۆرەکانی، گەشت، کاتە بەتاڵەکانی زۆر خۆشدەویست. لە تەمەنی سی ساڵیدا لە ناکاو و بێئازار لە ڕووداوێکی ئۆتۆمۆبێلدا گیانی لە دەست دا."

سەرنجڕاکێشی ژیانی ئانا لەسەر هێڵێک بنرخێنە کە لە ژمارە (١ واتە: ناخۆش) ەوە، بۆ ژمارە (٩ واتە: نایاب) و ژمارە (٥ واتە: نە باش و نە خراپ) یش، با لە ناوەڕاستدا بێت.

ئێستا با ژیانی بێرتا بنرخێنین" بێرتا هەرگیز هاوسەرگیری نەکردبوو، منداڵیشی نەبوو. زۆر دڵخۆش بوو، چێژی لە کارەکەی دەبینی. هاوڕێ زۆرەکانی، گەشت، کاتە بەتاڵەکانی زۆر خۆشدەویست. پێنج ساڵی کۆتایی ژیانی بە قەدەر پێنج ساڵی پێشووتر نایاب نەبوون، بەڵام هەر چێژبەخش بوو. لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا لە ناکاو و بێئازار لە ڕووداوێکی ئۆتۆمۆبێلدا گیانی لە دەست دا." ژیانی ئەمیش لەسەر هێڵێک بنرخێنە کە لە ژمارە(١) تا ژمارە (٩)ی لەسەر بێت.

لێکۆڵەرەوەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم جۆرە چیرۆکانەی لە ژیاندا هەن خستوویانەتە بەردەم خوێندکارەکانیان. سەرەنجام؟ ئەو ژیانانەی وەک ژیانی ئانا وابوون بەشێوەیەکی بەرچاو لە ژیانی بێرتا زیاتر بە باشتر پێوران. ئەمە شتێکی نالۆجیکییە، چونکە هەر دووکیان سی ساڵی سەرەتای ژیانیان بەوپەڕی دڵخۆشییەوە بەڕێکرد. بێرتا هەرچەندە دەبێت دان بەوەدا بنێین کە وەک پێشتر باش

نەبوو، بەڵام لە ئاستە گشتییەکەیدا خۆش بوو. ئەگەر بەشێوەیەکی ئەقڵانی لێیبڕوانین ئەوا دەبێت ژیانی بێرتا بەشێوەیەکی باڵاتر بنرخێنین. کەچی لە کۆتاییدا ژیانی ئانا بەشێوەیەکی باڵا پێوانەی بۆ کرا و ژیانی بێرتا بەشێوەیەکە ڕێژەیی نزم. لێرەدا یاسای کۆتایی لوتکە ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت، بەڵام وا دیارە کە پێنج ساڵە خۆشە زیادەکە هەژمار نەکراوە. لێکۆڵەرەکان ئەم زاراوەیەیان بە کاریگەری جەیمس دین ناساند. دین لە لوتکەی درەوشانەوەی پیشەکەیدا لەسەر شەقامێک بە ڕووداوێکی ئۆتۆمۆبێل گیانی لە دەست دا- لەوپەڕی تەمەنی گەنجیدا کە تەمەنی تەنها بیست و چوار ساڵ بوو. ئەگەر چەند ساڵێک یاخود چەند دەیەیەکی دیکە بەو هەمان تێکڕا کەسێکی سەرکەوتوو نمایشکارێکی دڵخۆش بووایە، ئەوا یەک و دووی تێدا نییە کە ئەوا ژیانی بە ئەندازەیەکی کەمتر سەرنجڕاکێش دەپێورا.

ئێستا حەز دەکەم تەنها یەک جاری دیکە تۆ ژیانی ئانا و بێرتا بپێویت، بەڵام ئەم جارە وایدابنێ کە ڕووداوی ئۆتۆمۆبێلەکان کاتێک ڕوویاندا کە ئانا شەست ساڵ بوو، بێرتا شەست و پێنج. هەموو شتەکانی دیکەش وەک خۆیان ماونەتەوە. ئێستا تۆ چەندیان بۆ دادەنێیت؟ پێش ئەوەی لە خوێندنەوە بەردەوام بیت تاوێک بوەستە.

بابەتی تاقیکردنەوەکانیش هەمان شت بوون کە لە لێکۆلینەوەکاندا لە خوێندکارەکانیان پرسی. دووبارە ژیانی ئانا بەشێوەیەکی بەرچاو باشتر لە ژیانی بێرتا پێورا (هەروەک لە -یاسای کۆتایی لوتکە-ەوە پێشبینیت دەکرد) ئەوەی جێگەی سەرسامییە ئەوەیە کە ئەو سی ساڵە زیادەیە پڕ لە دڵخۆشییەی کۆتایی کە ئانا ئەزموونی کردووە هیچ ڕۆڵێکی ئەوتۆی

لەسەر پێوانەکان نەبووە. هیچ جیاوازییەکی نەبوو ئانا لە سی ساڵیدا بمرێت یاخود شەست ساڵی. هەمان شتیش بۆ بێرتا ڕاستە. ئێستا ئەوە لەڕاستیدا نالۆژیکییە و نموونەیەکی کۆنی – پشتگوێخستنی ماوە-یە.

بە کورتی و بە پوختی، ئێمە کێشەی گەورەمان لە پێوانەکردنی سەرنجڕاکێشی بۆ ژیانی کەسانی دیکەدا هەیە. ئێمە هەڵەی سیستماتیک لە بیرکردنەوەدا دەکەین. ئەمە بۆ کەسە خەیاڵییەکانی وەک ئانا و بێرتا مایەی لێبووردنە، بەڵام نەوەک کاتێک دێتە سەر ژیانی حەقیقی خۆت. جوان بیخەرە مێشکتەوە تا ئەندازەیەکی تەواو دڵنایی تۆ وەک جەیمس دین لە هەرەتی لاوێتیدا نامریت، بەڵکو دوای ماوەیەکی درێژ و دابەزینێکی وردە وردەی توانای جەستەیی و مێشکیت. بەگوێرەی ناسۆر و ناخۆشییەکانت، بەتێکڕایی ئاستی خۆشبەختی چرکە بە چرکەت وەک لە پێشتر-ئەو سەردەمەی بێخەم و خەفەت بوویت- دادەبەزێت. کەواتە لە کۆتاییدا دەبێت بگەین بە چی؟ مەهێڵە ئەو ناسۆر و ناخۆشییانە دەست بەسەر بڕیاردانت، بەسەر تەواوی ژیانتدا بگرێت. باشترە ژیانێکی باش بژیت و چەند ڕۆژێکی کەمی بەئازار لەسەر چرپای مەرگ بیت، وەک لەوەی ژیانێکی خراپ بژیت و مەرگێکی باشت هەبێت. مەرگ و ژیان ئەو نرخانەن کە ئێمە لە بەرانبەر ژیانێکی باش دا دەیاندەین- وەک ئەوەی دوای نانخواردنێکی گران لە ڕیستۆرانتێکدا پارەکەی بدەیت. من بەنیاز نیم نرخێکی ئاوا بە خواردنێکی خێرای وەک هەمبەرگر بدەم. هەموو جارێک لەگەڵ هاوەڵێکی باشدا بە نایابترین جۆری شەرابەوە لە یەکێک لە ڕیستۆرانتەکان میکیلین بە شەش جۆر خواردنەوە داوەتم بکە.

٢٤

## سوڕانەوە لە دەوری بازنەی بەزەیی بەخۆدا هاتنەوەدا

## بۆچی هیچ ئەقڵانی نییە دەستە و ئەژنۆ بەدیار ڕابردووەوە دابنیشیت؟

کانیۆ، قۆشمەبازێکی شانۆیە بە ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی بۆ نمایش بچێتە سەر ستەیج بۆی دەرکەوت ژنە جوانەکەی کە لە هەموو کەسی زیاتر خۆشدەوێت، لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا پەیوەندی بەستووە و ناپاکی لێکردووە. لە پشت چادری سێرکەکەوە بە تەنیا دادەنیشێت، زۆر لە خۆی دەکات بۆ ئەوەی فرمێسک نەڕژێت و هەوڵدەدات ماکیاژەکەی بکات. لە ناوەوە ئامادەبووان بە تامەزرۆییەوە چاوەڕێین تا دەربکەوێت. چەند خولەکێکی کەم دواتر، دەبێت ڕۆڵی گەمژە بگێڕێت- سەرەڕای هەموو شتێک، دەبێت نمایشەکە بەردەوام بێت- بەڵام سەرەتا بە پارچە گۆرانییەکی جوانی تەنیا – لە جۆری ئۆپرا- کە گۆرانییەکە ناوی (Vesti la guibba- جلە شرەکانت بپۆشە) بەوپەڕی تراژیدیاوە خۆی بەسەر ستەیج دا

دەکات و لە هەمان کاتیشدا فرمێسکیش بە چاوەکانیدا جۆگەلەیان بەستووە.

بەم شێوەیە کۆتایی بە یەکەم بەشی نمایشی ئۆپێرای لیۆنکاڤالی کە بەناوی (پاگلیاکی) بوو، کە لە ساڵی ١٨٩٢ دا نمایشکرا هات. (Vesti la guibba- جلە شڕەکانت بپۆشە) یەکێکە لە هەستبزوێنترین پارچە مۆسیقای تاکەکەسی ئۆپێرایە تا ئێستا پێشکەش کرابێت. هەروەها مەزنترین گۆرانیبێژە نێرینە دەنگبلندەکان لە ڕێگەی ئەم گۆرانییەوە هاوار و ناڵەی خۆیان دەربڕیوە و ئەم گۆرانییەیان گووتۆتەوە- بە نموونە ئێنریکۆ کاروزۆ، پلاسیدۆ دۆمینگۆ، خۆزێ کارێراس. لە ماڵپەڕی یوتیوب بنوسە "Pavarotti" و " Vesti la guibba". مۆسیقاکە ئێش بە دڵت دەگەیەنێت، کاتێک پاڤارۆتی پارچە مۆسیقای کانیۆ، قەشمەرەکە دەژەنێت کە لە بەزەیی بەخۆ هاتنەوەدا ئەژنۆی لە باوەش گرتووە.

نمایشی دووەم –هەروەها کۆتاییش- چەقۆ بە ورگداکردنێکی نەریتییە و هەموو ئەوانەی تێوە گلاون دەمرن. کەچی دوای گەیشتنە لوتکەی ڕاستەقینەی کێشەکان لە نمایشەکەدا وا دەرناکەوێت هیچ کام لەمانە بەدیاریکراوی بینەران بخرۆشێنێت. هەر لە یەکەم نمایشییەوە، وێنەی قۆشمە چاو بە فرمێسکەکە لە یادەوەری کلتووری ئێمەدا نیشتووە، لە مێژە لەو کاتەوە ڕێگای خۆی دۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی ببێت بە کلتورێکی بەناوبانگ: بۆ نموونە ئەو گۆرانییەی بە -میرەیکڵ، پەرجوو- ناسراوە "فرمێسکەکانی قۆشمەبازێک" یەکێکە لە بەردەستترین گۆرانی ساڵانی ١٩٦٠- بە نزیکەیی یەک لە سەدی

مۆسیقا ئۆپرا ئەسڵییەکە بە هۆی ئالۆزییەکەی و نیوەی ئەوەش بەهۆی ئەو ڕاکێشانە سۆزدارانەییەوەیە.

ئەگەر لە کاتی گوێگرتن لە (Vesti la guibba- جلە شرەکانت بپۆشە) چاوەکانت تەڕ نەبوون، ئەوا من هیچم لە دەست نایە بۆت. وەلێ دەزانین کە مامەڵەکەی کانیۆ لە شێوەیەکی دوور مەودادا -زیانبەخش-ە. بەزەیی بە خۆدا هاتنەوە یەکێکە لە بێسوودترین وەڵام بۆ تاقیکردنەوەکانی ژیان. بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە هیچ شتێک ناگۆڕێت. لە ڕاستیدا پێچەوانەی دەکات، چونکە بەزەیی بە خۆدا هاتنەوە گێژاوێکی سۆزدارانەیە، خولانەوەیەکە تا زیاتر هەڵبەز و دابەزت بێت تێیدا قوڵتر هەڵتدەلوشێت. ئەو کەسانەی کەوتوونەتە داوییەوە بەخێرایی دەبنە قوربانی پارانۆیا[٢٤]. وا هەست دەکەن کۆمەڵە کەسێک، تەواوی مرۆڤایەتی، یان تەنانەت گەردوونیش دژی ئەوان وەستاوەتەوە. ئەوە بازنەیەکی مەترسیدارە بۆ ئەو کەسەی لەبەر دەم پرسیارەکەدایە، هەروەها بۆ ئەو کەسانەشی لە چواردەوری ئەون لە خاڵێکدا لەوە تێدەگەن کە ئیتر لەو کەسە دوور بکەونەوە. ئەو چرکەساتەی سەرەداوێک لە بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە لە خۆمدا دەبینم، ئەوپەڕی هەوڵی خۆم دەدەم تا بە مەلە خۆم لەو گێژاوە مەترسیدارە دوور بخەمەوە، ئەو پەندە بەڕاست وەردەگرم کە دەڵێت "ئەگەر خۆت لە چاڵێکدا دۆزییەوە، ئەوا لە هەڵکەندن بوەستە."

٢٤-پارانۆیا: جۆرە نەخۆشییەکی دەروونییە کە بە بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەک لەبەر دەستدا بێت کەسی تووش بوو پێیوایە کەسانی دیکە بەنیازن و پیلانی ئەوە دادەڕێژن ئازاری بدەن.

چارلی مەنگەر چیرۆکی هاورێیەک دەگێڕێتەوە کە هەمیشە سەفتەیەک کارتی چاپکراوی لەگەڵ خۆی پێبووە. کاتێک کەسێکی دەبینی تەنانەت ئەگەر تۆزێکیش شوێنەواری بەزەیی بەخۆدا هاتنەوەی پێوەبوایە، ئەوا کارتێکی سەرەوەی بەشێوازێکی جەستەی شانۆی دەردەهێنا و دەیدایە دەستی. لەسەر کارتەکە نوسرابوو" چیرۆکەکەت کاری لە دڵم کرد. هەرگیز کەسم نەبینیوە ئەوەندەی تۆ داماو بێت." ڕێگایەکی ژیرانە، دڵدەرەوانە، بەڵام لە هەمان کاتدا کەمێکیش ڕەق بۆ ئەو کەسانە تا ڕووبەڕووی بەزەیی بەخۆدا هاتنەوەکەیان ببنەوە. کەچی مەنگەر ڕاست دەکات: شێوازێکی بیرکردنەوەی بەدئەنجام و هەڵەیە.

ئەوەی زیاتر جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لەم چەند دەیەیەی دواییدا بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە برەوی پەیدا کردووە، بە تایبەتی لە شێوەی "ڕووبەڕووبوونەوەی دا" یاخود " کارکردن لەگەڵ" ئەو شتانەدا. هەروەها فۆڕم و شێوازە کۆمەڵایەتییەکەشی هەیە، کە تێیدا کۆمەڵەیەکی گەورە لە خەڵکی هەن هەست دەکەن ئەوان بوونەتە قوربانی ئەو ڕووداوانەی لەماوەی چەند سەدەی ڕابردوودا ڕوویانداوە. هەموو بەشەکانی زانکۆ تەرخانکراون بۆ ئەوەی هۆکارە مێژووییەکانی چەوساندنەوە دەربخەن و تا بچووکترین پڕیشکی لێکبدەنەوە. هەر هەمووی بە تەواوەتی پاکانەی بۆ کرا: تەنانەت ئەمڕۆش، ئەفریقییە ئەمریکییەکان هێشتا ئەزموونی کاریگەرییەکانی کۆیلایەتی و جیاوازی چینایەتی دەکەن و هێشتا داگیرکاری باڵێکی گەورەی بەسەر کیشوەری ئەفریقادا کێشاوە.

هەمان شتیت بەسەر ژنان، هاوڵاتییە ناوچەییەکان، جولەکەکان، ژن و پیاوە هاوڕەگەزبازەکان، پەنابەرەکان...هتد دا جێبەجێ دەبێت کە تێیدا خستنەڕوو، لێکدانەوەکان تەواو مایەی تێگەیشتن و پاساو بۆ هێنانەوەن.

کەچی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بێبەرهەم و تەنانەت ژەهراویشە. سەرەڕای ئەوەش، دەبێت بۆ چەند سەدە لەمەو پێش بگەڕێیتەوە تا "ڕووبەڕوو" ببیتەوە؟ سەد ساڵ، دوو سەد ساڵ، پێنج سەد ساڵ؟ پێنج سەد ساڵ لەمەو پێش یەک ملیۆن لە باوباپیرانت کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی خوێنی لە نێوانتاندا هەیە هێشتا زیندووبوون و لەسەر زەوی بوون. باپیری باپیری باپیرت...هتد. لقە سەرەکییەکانی میراتی درەختی خێزانەکاتن بێ ئەوەی هیچیان لە دەست بێت دڵڕەقانە چەوسێندراونەتەوە. دەتتوانی ڕووبەڕووی هەموو ئەوانە ببیتەوە، بەڵام لە پێناو چیدا؟ هەڵەکانی ڕابردوو قبوڵ بکە و هەوڵبدە لەگەڵ سەختییەکانی ئێستا هەڵ بکە یان بەرگەیان بگرە. بەزەیی بەخۆدا هاتنەوەی کۆمەڵی وەک بەزەیی بەخۆدا هاتنەوەی تاک بێبەرهەمە.

دووەم جۆری "ڕووبەڕووبوونەوەی شتەکان" لە خولگەیەکی تایبەتدا ڕوودەدات. لەسەر قەنەفەی پزیشکە دەرونییەکە، کەسی نەخۆش هەر شەن و کەوی منداڵی خۆی دەکات و دەیهێنێت و دەیبات، هەر خەریکی ئەو شتانەیە کە لە بیریشی چوون- کە سووک و ئاسان دەکرێت بەرپرس بن لە بارودۆخی، هەنوکەیی و لەوانەیە هۆکاری ئەوەی کەمێک لە خوار باشترین باری خۆیەوەیەتی. ئەمە لە دوو لایەنەوە کێشەیە. یەکەم: سەرزەنشتکردنی کەسانی دیکە،

بەتایبەتی دایک و باوکت، ماوەی بەسەرچووە. ئەگەر لە تەمەنی چل سالیدایت و هێشتا دایک و باوکت بە بەرپرس لە کێشەکانت دەزانیت، ئەوا هەموو کەسێک دەتوانێت پێتبلێت کە تۆ کەسێکی پێگەیشتوو نیت و هەر ئەوانت شایستەن.

دووەم: لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە تەنانەت ڕووداوە سەختە نکولێلێنەکراوەکانی منداڵیش (وەک مردنی دایک و باوکم، جیابوونەوە، پشتگوێخستن، دەستدرێژی سێکسی) بەشێوەیەکی زۆر کەم پەیوەندییان بە سەرکەوتن و دڵخۆش بوونەوە هەیە لە تەمەنی پێگەیشتندا. سەرۆکی پێشووی ڕێکخراوی دەروونی ئەمریکی، مارتن سێلیگمان سەدان لەم لێکۆڵینەوانەی لێکدایەوە و سەر ئەنجام گەیشت بەوەی" سەرەنجام گەیشتوون بەوەی قورسە بچووکترین کاریگەری ڕووداوەکانی منداڵی لەسەر کەسایەتی کەسێکی پێگەیشتوو بدۆزینەوە. بە هیچ شێوەیەکیش بەڵگەی لەسەر کاریگەری گەورە –یاخود هیچ شتێکی بڕیاردەر-یش بوونی نییە." لە مێژوومان زۆر یەکلاکەرەوەتر جینەکانمانن- بڵاوبوونەوەشیان تەنیا لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە بووە. بەدڵنیاییەوە دەتوانیت سەرزەنشتی جینەکانت بکەیت بۆ ئەو بارودۆخەی تێیکەوتوویت و گلەیی لە یانسیبی یەکگرتنی ئەو تۆو و هێلکۆکەیە بکەیت (سەیری بەشی ٧ بکە)، بەڵام چیت لەوە دەست دەکەوێت؟

نەچەقین لە بەزەیی بەخۆدا هاتنەوەدا یاسایەکی زێڕینە بۆ تەندروستی مێشکی. ئەو حەقیقەتە قبوڵ بکە کە ژیان بێ کەموکورتی نییە- نە هی تۆ نە هی هیچ کەس. هەر وەک فەیلەسوفی ڕۆمانی سێنیکا

دەڵێت" شتەکان لە تۆ دەگیرێن و بەرت دەکەون. ژیان میهرەبان و دادپەروەرانە نییە. کەواتە گرنگی چی لە " دڵتەنگبوون دا هەیە، تەنها لەبەر ئەوەی یەک جار دڵتەنگ بوویت؟" هەیە؟ ئەگەر بتوانیت شتێک بکەیت بۆ ئەوەی کێشە هەنوکەییەکانی ژیانت دابمرکێنیتەوە، کەواتە بیکە. ئەگەر ناتوانیت، ئەوا بارودۆخەکە قبوڵ بکە. گلەییکردن تەنها کات بەفیڕۆدانە، بەزەیی بەخۆدا هاتنەوەش دوو هێندە زیانبەخشە: یەکەم، تۆ هیچ شتێک ناکەیت بۆ ئەوەی بەسەر دڵتەنگییەکەتدا زاڵ بیت، دووەمیش، خەفەتی زیاتری خۆ وێرانکردنەکەت بۆ دڵتەنگییەکەت زیاد دەکەیت. یان با قسەکەی چارلی مەنگەر وەک خۆی دابنێینەوە کە (پێشنیارێکی –ئایرۆنی، تەوسە-) "هەر کاتێک پێتوایە بارودۆخێک یاخود کەسێک ژیانت وێران دەکات، ئەوە لە ڕاستیدا خۆتیت کە ژیانی خۆت وێران دەکەیت...هەستکردن وەک قوربانی بەتەواوی ڕێگایەکی کارەساتبارە بیگریتە بەر تا لە ژیاندا گوزەر بکەیت."

٢٥

# هیدۆنیزم[٢٥] و یودیمۆنیا

## مانا چەند دەتوانێت قەرەبووی چێژبەخشی بکاتە، یاخود بەپێچەوانەوە؟

ئەم چالاکییانەی دواتر چەند چێژبەخشن بەلاتەوە؟ لەسەر هێلێک ڕێژەکەیان بپێوە لە (-۰- هیچ چێژبەخش نییە، سەرنجتڕاناکێشێت)دوە، تا (۱۰ زۆر چێژبەخشە و ناتوانیت وێنای هیچ شتێکی باشتر بکەیت). خواردنی چۆکولاتە دڵخوازەکەت، شەڕکردن لە پێناو وڵاتەکەتدا لە جەنگدا، کات بەسەر بردن لە خولیاکانتدا، بەخێوکردنی منداڵ، پارەدان بە نەخۆشخانەکانی ئەفریقا، ڕێگرتن لە گەرمبوونی گۆی زەوی، سێکس، سەیرکردنی یارییەکانی جامی جیهانی، یارمەتیدانی خانمێکی بەتەمەن بۆ پەڕینەوە لە شەقامێک، چوون بۆ پشووە گەشتێک بۆ ئاوە کانزاییەکانی دەریای کاریبی. چەند چرکەیەک کات بە خۆت بدە.

---

٢٥- هیدۆنیزم: ئەو بیروباوەڕەیە کە پێیوایە چێژ و حەز گرنگترین شتن لە ژیاندا.

زۆربـــەی خـەڵـکی سـێکس، چـۆکولـێت، تـەلـەفزیۆن و پشووەگەشتەکان بۆ ئاوە کانزاییەکان لە خاڵی ٩ و ١٠ دا پۆلێن دەکەن، ئەمە لە کاتێکدا بەخێوکردنی منداڵ ٢ یان ٣ یە.

پرسیارێکی تر: ئەی ئەو چالاکییانەی پێشتر چەند مانادارن؟ لەسەرهێڵێک دایانبنێ لە ژمارە (٠ واتا بەتەواوی بێمانان) تا ژمارە (١٠ واتە بەقوڵی مانادارن). تاوێکی دیکە کات بە خۆت بدە بۆ ئەوەی بیری لێبکەیتەوە.

زۆرینەی خەڵک ڕووبەڕووی شێوازێکی تەواو جیاواز دەبنەوە. بەخێوکردنی منداڵان بەشێوەیەکی گرنگ و باڵا لە پشووەگەشتێک بۆ کەناری ئاوە کانزاییەکانی دەریای کاریبی پۆلێن دەکەن. یارمەتیدانی پیرەژنێک بۆ ئەوەی لە شەقامێک بپەڕێتەوە مانادارترە وەک لەوەی دەموچاوی خۆت لە چۆکولاتە هەڵبسویت.

هممم. کەواتە لە ڕاستیدا چی گرنگە؟ دەبێت تەرکیز بخەینە سەر چی؟ کام چالاکییانە یارمەتیدەرن بۆ ژیانێکی باش-چێژبەخشەکان- یاخود –مانادارەکان-؟"

هەر لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی پێش زایینەوە بیرمەندە یۆنانییەکان بیریان لـەم بابـەتانە کـردۆتـەوە. کەمینەیەک لە فەیلەسوفەکان، کە بە هیدۆنیستەکان ناسراون، باوەڕیان وابووە کە ژیانێکی باش پێکدێت لەوەی بەرزترین ئەو چێژ و حەزە بەردەستانە یەکسەر بماشیتەوە. وشەی هیدۆنیستیک بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ یۆنانییە کۆنەکان کە وشەی "Hedoné"یە دەگەڕێتەوە، واتە، خۆشی، چێژ، ڕابـواردن، تێرکردن، حەزی سێکسی. لە بنەڕەتدا،

بۆچی یامەتی خانمێکی پیر بدەین و لە شەقامێک بیپەڕێنینەوە ئەمە لە کاتێکدا بتوانین سەیری ڤیدیۆیەکی پێکەنیناوی بکەیت لە یوتیوب؟

زۆربـەی فەیلەسوفەکان بـاوەڕیـان وابـوو کە تێرکردنی هەنوکەیی حەزەکان، لە ڕووی ئەخلاقیەوە نزم و بەدئەخلاقی و تەنانەت ئاژەڵیشە. ژیانێکی باش بۆ "حەزە باڵاکان" دروست بووە. تێکۆشان لە پێناو ئەمانەدا پێیدەگووترا (یودیمۆنیا- Eudemonia) هەر ئەوەندەی زاراوەکە داهێنرا، خەڵکی دەستیان بە چەندوچوون لە بارەی ماناکەیەوە. زۆربەی فەیلەسوفەکان دەرەنجام بەوە گەیشتن کە "حەزە باڵاکان" واتـا: چاکەکاری. تەنها ژیانێکی ڕاستگۆیانە دەکرێت ژیانێکی باش بێت. لە بنەڕەتدا نەخۆشخانەکانی ئەفریقا لە جیاتی جامی جیهانی-مۆندیال. هەندێک لە چاکەکارییەکان بە تایبەتی وەک ڕێگاخۆشکەر بۆ بەختەوەری سەیر دەکران. ئەفلاتون و ئەرستۆ هەردووکیان باوەڕیان وابوو خەڵکی دەبێت تا بۆیان دەکرێت خۆڕاگر، نەبەرد، دادپـەروەر، وردبین بن. ئەم چواردروشمە خۆشبەختانە چەندین سەدە دواتر لە لایەن کەنیسەی کاسۆلیکییەوە بەکارهێنرایەوە و هەموارکرایەوە(ئێستا لە Version ٢,٠ دا بەردەستە) ئێستا بە چاکەکاریی -کاردینال[٢٦]-ەکان ناسراوە: خۆڕاگری، وردبینی، دادپـــەروەری، ئازایەتی. شوێنکەوتنی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە سەرەنجام دەتگەیەنێت بە کۆتاییەکی پووچ، دەتگەیەنێت بە شتگەلێک هەر وەک دان گیلبێرت دەروونناسی زانکۆی

---

[٢٦] کاردینال: قەشەیەکی باڵایە لە کەنیسەی کاسۆلیکی ڕۆمانی دا, کاردینال پاپا ئامۆژگاری دەکات و هەڵیدەبژێرێت.

هاڤارد بەکورتی ئاماژەی پێکردووە" تاوانبارێکی جەنگی سەر بە حزبی – نازی- کە لە کەناراوەکانی ئەرجەنتین خۆی داوەتە بەر خۆر لە ڕاستیدا دڵخۆش نییە، ئەمە لە کاتێکدا ئایینداریکی ئەرکپێسپێردراو کە بە زیندوویی مرۆڤخۆرەکان دەیخۆن دڵخۆشە."

کەواتە هەمووی هەر سەرلێشێوانە. پاوڵ دۆلان دەروونناس لە سکوڵی ئابووری لە لەندەن هەوڵیداوە ئەم ئالۆزییە لە یەک جودا بکاتەوە. هەر وەک هەموو تۆنێکی مۆسیقی دوو تایبەتمەندی هەیە – قەبارەی دەنگ و ئاستی دەنگ – هەموو چرکەساتێکی ئەزموونکراویش دوو پێکهاتەی بنچینەیی هەیە: پێکهاتەیەکی چێژبەخش –هیدۆنیستیک- و پێکهاتەیەکی مانادار. پێکهاتە هیدۆنیستیکییەکە تێرکردنی حەزە هەنوکەییەکانە. لە سەرێکی دیکەشەوە پێکهاتە مانادارەکە ئاماژە بۆ ئەو تێڕوانینە دەکات کە چرکەساتێک چەند مانادارە. بۆ نموونە خواردنی چوکولاتەیەک، پێکهاتەیەکی هیدۆنیستیکی گەورەتری هەیە، وەک لە پێکهاتە مانادارەکەی، لانیکەم ئەمە بە لای زۆربەی خەڵکەوە وایە. پەیوەندییەکە لە نێوان دوو پێکهاتەکەدا پێچەوانەیە، ئەگەر یارمەتی خانمێکی پیر بدەیت لە شەقامێک بیپەڕێنیتەوە.

ڕەتکردنەوەکەی پاوڵ دۆلان بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی وردتر لە کاتی نوسیندا پێناسەی "ماناداربوون" یان "مەبەستداربوون" بکات، واتا دەتوانێت تەواوی ئەو ٢٥٠٠ ساڵە "چاکەکارییانە" کە وەک ترە کەڵەک وان بەجێبهێڵێت لە دوایەوە خاپوور دەبن. کەواتە ئەو دروشمە ڕاستە کە دەڵێت"کە بینیم دەزانم." هەموو کەسێک لە کاتی

چرکەساتەکەدا دەزانێت چ ئەزموونێک ماناداره و چ ئەزموونێکیش بێمانایە. ڕێک ئێستا تۆ ئەم پەرەگرافە دەخوێنیتەوە. پێکهاتەی چێژبەخشی ڕەنگە لە هەڵقوڕاندنی شاتو پێتروسێک کەمتر بێت، بەڵام هیوادارم پێکهاتە ماناداریيەکەی گەورەتر بێت. ئەزموونی نوسەرەکەت هەر زۆر گەورەترە. نوسینی ئەم بەشە، دەبێت دانی پێدابنێم، کە زۆر بێچێژە، من هەوڵدەدەم و زۆر لە خۆم دەکەم، بەڵام هەوڵدان بۆ ئەوەی بیرۆکەکانم بەشێوەیەکی ئاسان بخەمە سەر کاغەزێک هەستدەکەم بەشێوەیەکی باڵا مانابەخشە. مەبەست و چێژ دوو بەردی بناغەی بەختەوەرین- هەر وەک دانیاڵ کاهنمان دەریخستووە" جوڵەیەکی ڕەسەن و ئازایانەیە."

هەموو ساڵێک هۆلیوود چوار سەد بۆ پێنج سەد فیلم بەرهەم دەهێنێت-یەک ملیار دۆلار دەکات لەو پیشەسازییەدا. ئەمە هیچ جێگای پرسیار نییە کە لێکۆڵەرەوەکان هەوڵدەدەن بۆیان دەربکەوێت کە بۆچی خەڵکی دەچێت بۆ سینەما، بەو هیوایەی ڕەچەتەیەک بۆ فیلمێکی زۆر سەرکەوتوو دروستبکەن. بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ تیۆریای فیلمە هیدۆنیستیکییەکان- نە زۆر بێزارکەر، نە زۆر فشاری دەروونی بۆ بینەر دروست بکات- بۆ ئەوەی لەو واقیعە بێبایەخەی خۆیان دووریان بخاتەوە. ئەکتەری جوانیان پێپیشان بدەن و چیرۆکی دڵخۆشکەر کە کۆتاییەکەیان شاد بێت. کەچی بەردەوام فیلمە سەرکەوتووەکان بەشێوەیەک بەرهەم دەهێندران کە سەرکەوتنەکەیان بەند نەبوو بە ڕەچەتەیەوە، ئەمەش ناتوانرێت بەشێوەیەکی هیدۆنیستیکی ڕوون بکرێتەوە- بۆ نموونە فیلمەکانی

وەک ژیان جوانە، مێشکێکی جوان. تەنها لەم دواییانەدا چەند فیلمێک دەرچوو کە لێکۆڵەرەوەکان جەختیان لەوە کردەوە کە دەرهێنەر و نوسەرە باشەکان لە سەرەتاوە زانیویانە: دەبێت پێکهاتەیەکی مانابەخشی تێدابێت، شتێک جگە لە تەنها تێرکردنێک زیاتر بێت. تەنانەت فیلمێکی خەمناک کە هیچی وا پارەی تێنەچووە دەکرێت فیلمێکی باش بێت- ئەگەر مانای تەواوەتی تێدابێت.

مانادارى هەروەها ڕۆڵێکی سەرەکی لە پیشەی بازاڕدا دەگێڕێت. کارمەندە گەنجەکان، بەتایبەت، ئارەزووی ئەوە دەکەن موچەیەک قبوڵ بکەن لە خوار ستانداردی بازاڕەوە بێت بۆ ئەوەی بەشداری لە پرۆژە "مانادار"ەکان دا، بکەن. ئەمە دەستپێکێکی نمونەیی باشە بۆ ئەو کەسانەی تازە دەستپێدەکەن و خراپە بۆ دامەزراوەکان- ئەوەی دواتریان دەبێت قەرەبووی ئەو کورتهێنانە بکەنەوە، ئەمە بەو واتایە دێت کە پێکهاتە هیدۆنیستیکییەکە بەرز بکەنەوە (خوێندنەوە: پارە). هونەرمەندەکان بەدڵنیاییەوە هەمیشە دەبێت ئەم باڵانس ڕاگرتنە بە هەند وەربگرن: ئایا وا باشترە لە کڵپەی شکۆ و سەربەرزییەکی هونەریدا بمریت یاخود هەموو بلیتەکانت لە لایەن ئامادەبووانە کڕدرابن بۆ ئەوەی پارەیەکی باشی کاشت چنگ بکەوێت؟

پێشنیاری ئەوەت بۆ دەکەم باڵانسێک لە نێوان چێژ و مانادا ڕابگریت. خۆت لە زیادەڕەوییەکان بە دوور بگرە. بۆ؟ چونکە تا زیاتر بگەڕێت و بەرەو پێشەوە بچیت سوود و قازانجە لاوەکییەکانت کەم دەبنەوە. بە لای زۆربەی خەڵکەوە بەم شێوەیەیە، دوای دووەم کیلۆ چۆکولاتە، بیست و چوار کاتژمێر خواردن بە دیار تەماشاکردنی

تەلەفزیۆنەوە، پێنجەم جار گەیشتنە حاڵەتی ئۆرگازم، ئیتر تەلەفزیۆن، سێکس، چۆکولاتە کاریگەرییان نامێنێت. پێچەوانەکەشی ڕاستە ئەگەر شەو و ڕۆژ خەریک بیت دونیا ڕزگار بکەیت و خۆت لە حەز و خۆشییە کەسییەکانت ببوێریت خۆشحاڵ نابیت. باشترین ڕێگا ئەوەیە کە باڵانسێک لە نێوان مانابەخشی و چێژدا ڕابگریت. کەواتە ئەگەر تۆزێک لە دونیات ڕزگار کردووە، ئەوا پێموایە شایستەی ئەوەیت پەرداخێک شەرابی سوور و تازە هەڵقوڕێنیت.

٢٦

# بازنەی کەرامەت – بەشی یەکەم
# بەڵام ئەگەر نا

لە ساڵی ١٩٣٩ دا بە ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی ئەڵمانیا پۆڵەندای داگیرکرد و جەنگی دووەمی جیهان خەریکبوو دەستپێدەکرد، بەریتانیا دەستیکرد بە ناردنی سەرباز لە کەنارەکانییەوە. ئەوان وا بەنیازبوون پاڵپشتی هێزی فەرەنسا بکەن لەو جەنگەی خەریکبوو لەگەڵ ئەڵمانییەکاندا دەستیان پێدەکرد. ساڵێک دواتر لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٤٠ دا ٣٠٠,٠٠٠ سەربازی بەریتانیا لەناو و دەوروبەری دەنکیرک-کە شارۆچکەیەکی بەندەری فەرەنسایە- جێگیرکران. هەر هەمان ساڵ هێزەکانی ئەڵمانیا پەلاماری بەلجیکا و هۆڵەندایان دا و بەشێوەی مارشی سەربازی چوونە ناو فەرەنسا. چەند ڕۆژێکی کەم دواتر، بەریتانییەکان سەیریان کرد چوار دەوریان دراوە. کوشتارگەکەیان لە لایەن ئەڵمانییەکانەوە تەنها درەنگ و زوو کەوتبوو. بارودۆخەکە ئومێدی لەبەر بڕابوو. ئەفسەرێکی بەریتانی لەڕێگەی تەلەگرافەوە سێ وشەی ناردەوە بۆ لەندەن" بەڵام ئەگەر

نا." پرسیار: تۆ چۆن ئەم سێ وشەیە لێکدەدەیتەوە؟

کەسێکی ئاشنا لەگەڵ ئینجیل دا- ئەو سەردەمە ئەو شتانە باو بوو- لە چاوتروکاندنێکدا درکیان بەوە کرد ئەو وشانە واتا چی. ئەو وشانە لە پەیماننامەی کۆنەوە هاتوون کە (دانیاڵ ۳:۱۸) کە پادشای بابلییەکان نەبوخەزنەسر بە سێ جولەکەی لە خوداترساو رادەگەیەنێت" ئەگەر ئێوە -وێنەی خوداکەی من- نەپەرستن، ئەوا هەمان ئەو کاتژمێرە دەتانخەینە ناو مەنجەنیقێکی ئاگردارەوە." پادشا کات دەدات بە هەر سێ پیاوەکە بۆ ئەوەی بیر لە بابەتەکە بکەنەوە. ئەوان بەم شێوەیە وەڵامیان دایەوە" ئەی نەبوخەزنەسر، ئێمە هیچ خەمی ئەوەمان نییە لەم بابەتەدا بە دەم داواکارییەکەی تۆوە بێین. ئەگەر ئەوەی تۆش دەیڵێیت وا بکەیت، ئەو خودایەی ئێمە دەیپەرستین توانای ئەوەی هەیە لەو کورە گەرمە گڕدارەی تۆ ڕزگارمان بکات، ئەی پادشا هەر ئەویش لە دەستی تۆ ڕزگارمان دەکات. بەڵام ئەگەر وانەبێت ئەوە بۆ تۆ دەردەکەوێت، ئەی پادشا ئێمە نە ئەو خودایانەی تۆ دەپەرستین نە ئەو وێنە زێڕینانەی تۆ بۆت دروست کردوون."

ئەو پەیامەی کە لە مانگی ئایاری ساڵی ۱۹٤۰ دا گەیشتە لەندەن گووتی: بارودۆخ لێرە لە دەنکیرک هیچ هیوایەکی لێهەڵناکرێت. ئەگەر موعجیزەیەک بخولقێت لێرە ڕزگارمان ببێت، بەڵام ئێمە خۆمان یەکلاکردۆتەوە بۆ ئەوەی خۆمان تەسلیم نەکەین- ئەوەی لە دەستدان دێت بیهێنین. هەموو ئەو شتانە تەنها لە سێ وشەدا بوو بەڵام ئەگەر نا. ئەوە دەربڕینی ئەوپەڕی بەرپرسیارێتی بوو.

چەند ڕۆژێکی کەم دواتر، بەریتانییەکان ۳۳۸,۰۰۰ سەربازی فەرەنسییان دەرپەڕاند، هێزە سەربازییەکانی بەریتانیا لە ئۆپەراسیۆنێکی شڵەژاودا کە هەشت سەد هەزار سەبازی وێرانکەر، بەلەمی ڕاوەماسی، کەشتی بازرگانی، کەسانی بلیمەت و دەستڕەنگین ئاسنگەری تەیمس. تەنانەت ئەمڕۆش خەڵکی باسی موعجیزەی دەنکیرک دەکەن.

چونکە ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر کەمی خەڵکی ئاگاداری ئینجیلن، بە ئاستەم کەسێک هەیە لە گرنگی بەڵام ئەگەر نا تێبگات. هاوواتایەکی مۆدێرنی هەیە کە ڕەنگە ئەویش " ئەگەر بەسەر لاشەی مندا بڕۆن." بێت.

ئەم هەڵوێستە ناوچەیەکی زۆر ڕەق و توندی ژیانمی کێشاوە کە ئاڕاستەی هەموو ئەو شتانە دەکات کە جێگای قسە لەسەر کردن نین. ئەوە لە چەند پەسەندکردن و پرەنسیپێک پێکدێت کە پێویستی بە هیچ پشتڕاستکردنەوەیەک نییە. بۆ نموونە، من هەرگیز شتێک ناکەم کە بۆ یەک لەسەر دەی ئەو پارەیەی بە کاش دەخرێتە بەردەستم، بە دەربڕینێکی تر، من هەرگیز ڕێگا نادەم پارە ببێتە هۆکارێکی بڕیاردەر. من هەرگیز وێنەی منداڵەکانم ناخەمە سەر ئینتەرنێت. تەنانەت ئەگەر هۆکارێکیشم هەبێت هەرگیز قسەیەکی خراپ نە لە بارەی خێزانەکەمەوە، نە لە بارەی هاوڕێکانمەوە لای هیچ کەس باس ناکەم- هەرگیز نەمگووتووە. هاوشێوەی بازنەی پێشبڕکێ، بەمەیان دەڵێم بازنەی کەرامەت. بیرۆکەی ئەمە پەیوەندی بە بەشی سێیەمەوە هەیە کە ڕووبەڕووی نەزر بووینەوە. بازنەی

کەرامەت -نەزر-ە کەسییەکانت پێکەوە دەبەستێتەوە و لە سێ جۆر پەلامار دەیانپارێزێت أ): بەڵگەی باشتر. ب): مەترسی کوشندە. ج): مامەڵەکردن لەگەڵ ئەهریمەن دا. ئەمە دەمگەیەنێتە یەکەم بەش لە سێینەکەم لە بارەی -بازنەی کەرامەت-ەوە: هەڕەشەی بەڵگە باشترەکان. لە بەشەکانی دواتـردا لەنزیکترەوە سەیرێکی مەترسییەکانی دووەم و سێیەم دەکەین.

هەر وەک لە -بازنەی پێشبڕکێ-دا باسمان کرد، لە ڕاستیدا قەبارەی -بازنەی کەرامەت-ەکەت گرنگ نییە. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە بزانیت دروست سنورەکانی دەکەونە کوێوە.

دامەزراندنی بازنەی کەرامەت پەیوەندییەکی کەمی بە ڕۆحی -ڕێنیسانس-ەوە هەیە. ئـەوە لەگەڵ هەموو شتێکدا دەکەوێتە تەنگژەوە کە بە پێچەوانەوە من بە پیرۆز دامناون- بیرکردنەوەیەکی ڕوون، ئەقڵانییەت، باڵایی "بەڵگە باشترەکان" ئایا ئەوە ڕێگەپێدراوە؟ ئایا بەردەوامبوون لەسەر ئەوە بونیادنەنراوە کە بەردەوام هەموو شتێک بانگ بکەیت بۆ ئەوەی بیخەیتە بەر پرسیار؟ وەڵام: بەڵێ، بەلام، -بازنەیەکی کەرامەت-ی بچووک، پارێزراو، سنورەکانی بە ڕوونی دیاریکرابن بنچینەی -ژیانێکی باش-ە. لە ڕاستیدا، من زۆر زیاتر دەڕۆم ئەگەر بڵێم، پێویستە شتەکانی ناو بازنەکەت پێویست ناکات بەشێوەیەکی ئەقڵانی پاساویان بۆ بهێندرێتەوە. ئەگەر وابوون، ئەوا بە هیچ شێوەیەک ئارام ناگریت. ئەوا ژیانت هیچ بنچینەیەکی بەهێزی نابێت. دەبێت هەمیشە خۆت بۆ بەڵگەیەکی باشتر ئامادە بکەیت کە لە ڕێگاتدایە و هەموو شتە پەسەندەکانت، پرەنسیپەکانت،

بەرپرسیارییەکانت، تور بدەیتە ناو ئاوەوە.

چۆن بازنەی کەرامەت دروست دەکەیت؟ لە ڕێگەی زۆر هێنان و بردنەوە نا. چونکە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا ڕوون دەبێتەوە- بە لای زۆربەی خەڵکییەوە لە تەمەنی ناوەڕاستیاندا. ئەم پرۆسەی ڕوونبوونەوەیە هەنگاوێکی زۆر پێویستە بۆ بوون بە کەسێکی پێگەیشتووی کامڵ. تۆ دەبێت ئەزموونی هەندێک شتی دیاریکراو بکەیت- بڕیاری هەڵە، نائومێدی، شکست، قەیران. دەبێت تەواویش ئاگاداری خۆت بیت بۆ ئەوەی بزانیت ئامادەیت بەرگری لە کام پرەنسیپە دەکەیت و ئامادەیت دەست بەرداری کام پرەنسیپ بیت. هەندێک کەس هەرگیز -بازنەی کەرامەت-ەکەیان بەرەو پێش نابەن. ئەم جۆرە کەسانە لە بناغەیان کەمە، بۆیە ئەوانە هەمیشە بەرامبەر بەڵگە فێڵبازییەکان لاوازن.

-بازنەی کەرامەت-ەکەت توند بپارێزە. بازنەیەکی بچووک لە بازنەیەکی گەورە بەهێزترە، لەبەر دوو هۆکار. تا شتی زیاتر لە بازنەکەتدا کەڵەکە بکەیت، ئەوا شتی زیاترت لە تەنگژە و قەیراندایە. ناتوانیت یەک دەرزەن پێداویستی بنچینەیی قایل بکەیت. دووەم، تا کەمتر لە بازنەکەتدا کەڵەکە بکەیت، جیددیتر دەتوانیت بەرپرس بیت لە بیر و باوەڕەکانت و باشتر بەرگرییان لێبکەیت. وارن بەفێت ئاگادارمان دەکاتەوە"پەیمانەکان زۆر پیرۆزن، بۆیە بە سروشتی خۆیان دەگمەنن."

ئەوە ڕاستە نەک تەنها بۆ ئەو بەڵێنانەی بە خەڵکی دەدەیت، بەڵکو بۆ ئەو بەڵێنانەشی بە خودی خۆتی دەدەیت. کەواتە بەشێوەیەکی

باڵا وریابە لە هەڵبژاردنی ئەو بژاردانەتدا کە هیچ جێگای مشتومڕ نین- ئەو پرەنسیپانەی وازلێهێنانیان بەلاتەوە جێگای قبوڵ نین.

تا ئێستا زۆر ڕوونە. بەڵام خۆت بۆ شتێک ئامادە بکە: تۆ بە بەرگریکردن لە پرەنسیپەکانت هەندێک کەس نائومێد دەکەیت- بەتایبەتی ئەو کەسانەی گرنگییان پێدەدەیت. خەڵکی ئازار دەدەیت. سووکایەتی بە خەڵکی دەکەیت. لە بەرامبەریشدا، سوکایەتیت پێدەکرێت، ئازاردەدرێیت، نائومێد دەکرێیت. گرنگە خۆت ئامادە بکەیت بۆ ئەوەی دەست و پەنجە لەگەڵ ئەو جۆرە هەستانەدا نەرم بکەیت، چونکە ئەوە ئەو نرخەیە تۆ بۆ بەدەستهێنانی بازنەی کەرامەت دەیدەیت. تەنها بووکەشووشەکان ژیانێکی دوور لە تەنگژە دەژین. بازنەی پێشبڕکێ دە هەزار کاتژمێرە، بەڵام بازنەی کەرامەت دە هەزار برینە.

ئایا شایستەی ئەو نرخەیە؟ ئەوە پرسیارێکی هەڵەیە. هەر لە بنەڕەتدا ئەو شتانەی نرخیان قابیلی پێوان نییە، هیچ نرخێکیان لەسەر دانانرێت، هەر وەک مارتن لوسەر کینگ دەڵێت" ئەگەر کەسێک شتێکی نەدۆزیبێتەوە بۆی بمرێت، ئەوا شایەنی ژیان نییە."

٢٧

## بازنەی کەرامەت - بەشی دووەم
## ئەگەر لە دیوی دەرەوە تێکشکایت

لە ٩ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٥ دا، شۆفێری گەنجی فڕۆکەیەکی ئەمریکی کە ناوی جەیمس ستۆکدەیڵ بوو، بە فڕۆکە شەڕکەرەکەی لەسەر کەشتیگەلی ئەمریکی لە -ئۆریسکانی-ییەوە دەستی بە فڕین کرد بۆ ئەوەی بە گەرموگوڕییەکی زۆرەوە خۆی بگەیەنێتە باکوری ڤێتنام. دوای ئەوەی لە گەشتێکی سەرکەوتووی ڕۆتینی لە بۆمبارانکردنی بارەگای کۆمۆنیستەکان گەڕابووەوە، بێ هیچ پلانێکی پێش وەختە چوو بۆ هێرشکردنە سەر فڕۆکەشکێنەکان. کورسی فڕێدەری شۆفێری فڕۆکەکە فڕێیدایە دەرەوی فڕۆکەکە، هەر وەک ستۆکدەیڵ خۆی دەیگێڕێتەوە" هەزار پێ کەمترم مابوو، بەر زەوی بکەوم، هەروەها نزیکەی بیست چرکەشم مابوو لە پەڕەشوتەکەمدا، سەیری خوارەوەم کرد، خەریکبوو ڕێک بەسەر شەقامێکی سەرەکی شارۆچکەیەکی بچووکدا بەر دەبوومەوە. ئەوانیش تەقەیان لێدەکردم و مستەکۆڵەیان بەرز کردبووەوە." بێ

دواخستن ستۆکدەیل دەستگیرکرا و فڕێدرایە زیندانێکی نەناسراوەوە بە ناوی هانۆی هیلتۆن کە ئەو ئەمریکییانەی دیکەی لە جەنگدا دەست بەسەر کرابوون پێش ئەم لەوێ خنرابوون. لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرا، لێیدرا، ئەشکەنجە درا. ستۆکدەیل حەوت ساڵ و نیوی لە زینداندا بەسەر برد، چوار ساڵیان لە زیندانی تاکە کەسیدا بوو- تا کۆتایی جەنگی ڤێتنام.

ستۆکدەیل بە جۆرێک لە جۆرەکان دەیتوانی لە ڕێگەی مەرایی و چۆکدادانەوە بۆ ئەشکەنجەدەرەکانی هەندێک لەو ئازارانە لە خۆی دوور بخاتەوە. لەگەڵ بەیاننامە ناوبەناوە دژ بە ئەمریکاییەکاندا، هەر وەک بەندیکراوێکی ئاسایی مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکرد. هیچ ئەشکەنجەیەک لە ئارادا نەبوو. بەڵام هەرگیز ئەوە بە خەیاڵیدا نەهات، نیازی ئەوەی هەبێت بەرامبەر ئەشکەنجەدەرەکانی کۆڵ بدات. هەر وەک دواتر ڕوونیکردەوە، ئەوە تاکە ڕێگا بوو کە دەیتوانی ڕێزی خودی خۆی بپارێزێت. لەبەر خۆشەویستی وڵاتەکەی ئەوەی نەکرد. نە لەبەر خاتری ئەو جەنگەی چیتر بڕوای پێی نەمابوو. تەنها و تەنها لەبەر ئەوەبوو لە ناخەوە تێکنەشکێت. تەنها لەبەر خۆی ئەوەی کرد.

لە خاڵێکدا نیازی ئەوەیان هەبوو بۆ زیندانێکی دیکەی بگوازنەوە. دەبوو لەبەر چاوی خەڵکی شارەکەدا بە شێوەی مارشی سەبازی ڕێبکات، لە پێش میدیا نێودەوڵەتییەکانەوە بە پاکی و تەندروستییەکی تەواوە بڕوات. پێش ئەوەی زیندان بەجێبهێڵێت، ستۆکدەیل پڕی دایە تەپڵەکێک و توند کێشای بە دەموچاوی خۆیدا تا خوێن بە جەستەیدا جۆگەلەی بەست و چاوەکانی ئەوەندە ئاوسابوون قەپات

بووبوون. مەحاڵ بوو بتوانن بەو شێوەیە پیشانی دونیای بدەن" ئەو شەوە ڕێک لەسەر زەوییەکە لێیڕاکشام و گریام. زۆر دڵخۆشبووم کە هەموویانم کۆکردەوە و واملێکردن ئەوەی بەنیازبوون هەوڵی کردنی بدەن بیکەم بە مەحاڵ بۆیان."

ئەگەر لە ڕووکاری دەرەوە سەیر بکەین، پووچ و بێبایەخ دیارە. لە بارودۆخی ستۆکدەیڵ دا، ئەوە شتێکی هەستیار بوو کردنی وەک ئەوەی ئەشکەنجەدەرەکە ڕێنمایی کردبوو. فرمان دەربکە. لەگەڵ شەپۆلەکەدا برۆ. خۆت دەرمەخە. پرسیار لە ئەمریکاییە داگیرکەرەکان بکە. دوای ڕزگاربوونی ڕەنگە بە بڕوابوونەوە بیگووتایە کە ئەگەر ئەوەی نەکردایە ڕەنگە تا ئاستی مردن ئەشکەنجەیان بدایە. هەموو کەسێک لەوە تێگەیشت بۆچی ئەوەی کرد کە کردی، هیچ کەسێکیش سەرزەنشتی نەکرد. بەڵام ئایا ستۆکدەیڵ وزەی ئەوەی دەبوو بەرگەی ئەو حەوت ساڵ و نیوە بگرێت؟ ئەگەر وایە، بە چاوخشاندنەوەیەکمان بەو کاتەدا، ئایا هەر وەسفی ئەو کاتەی کە لە زینداندا بوو وەک "بە گوێرەی هەموو پێوەرێک بێنرخ" دەکرد؟

ئەگەر ئەوەی لە قوڵایی ناختدا باوەڕت پێیەتی لە ڕووکاری دەرەوەت دا بە ڕوونی ڕەنگ نەداتەوە، ئیتر وردە وردە دەبێت بە بوکەڵەیەک. یان خەڵکی بۆ مەبەستەکانی خۆت بەکارت دەهێنن، یاخود درەنگ یان زوو کۆڵ دەدەیت. چیتر ناجەنگیت. بەرگەی فشارەکان ناگریت. هێزی ئیرادەت دەپوکێتەوە. ئەگەر لە ڕووکاری دەرەوەت دا تێکبشکێیت، ئەوا دەگەیتە شوێنێک لە ناوەوەش

تێکبشکێنێت.

ژانرێکی تەواو سەبارەت بە ئەدەبییاتی زیندان هەیە، هەر لە ڕۆمانی دوورگە دەورەدراوەکانی گولاگ لە نوسینی سۆلژینتسین، گۆرانی مردووەکە لە نوسینی ئیلی وایسڵ، ئەگەر ئەمە مرۆڤ بێت لە نوسینی پریمۆ لیڤی، گەڕانی مرۆڤ بە دوای واتادا لە نوسینی ڤیکتور فرانکڵ. ئەم کتێبانە زۆربەی کات بەهەڵە دەخوێندرێنەوە. خەڵکی بنکۆڵیان دەکات و دەگەڕێت بۆ سەرەداوێکی ڕزگارکەر لە بارودۆخە ترسناکەکاندا. هەرچەندە ڕزگاربوون تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەندی بە بەختەوە هەیە. لە کتێبەکانی ئۆشویتز دا هیچ ستراتیژییەتێکی ڕزگاربوون بوونی نییە. ئەگەر بە هۆکاری سیاسی تا کۆتایی جەنگ لە کونجی زیندان خنرایت، ئەوا تۆ ئەگەرێکی زیاترت هەیە بۆ ئەوەی قوتارت ببێت وەک لەوەی لە ساڵی ١٩٤٢ دا ببرایتایە بۆ ئەوێ. بەو شێوەیە ئاسانە. کەواتە لێرەدا حەقیقەتێک هەیە کە تەنها ڕزگاربووەکان دەتوانن لە بارەی دیلبوونی جەنگەوە بنوسن. مردووەکان کتێب نانوسن. ستۆکدەیڵ بەختدار بوو کە لە کاتی ئەملاو ئەملاکردن و بەربوونەوەیدا بۆ ناو گوندێکی دوژمن لە ناو پەڕەشوتەکەیدا گوللەیەکی بەر نەکەوت. کەچی هێشتاش زیندووە!

کەچی هێشتا یەک پرەنسیپی بنچینەیی لەناو ئەم هەموو ئەدەبیاتی زیندانەدا دەردەکەوێت. ئەوانەی خۆیان بۆ بارودۆخە سەختەکان ئامادە دەکەن تا ڕۆژگارێک ڕزگاریان ببێت- دواتر و دواتر- هەنگاو و بە هەنگاو دەرفەتی ڕزگاربوونی خۆیان زیاد

دەکەن. سەرەنجام ئۆشویتز ئازادکرا. بە جۆرێک لە جۆرەکان هەموو لە زیندان خزاندنێک کۆتایی دێت. تۆ تەنها دەبێت درێژە بەوە بدەیت و پێتوابێت ئەوە هەر ڕوودەدات. تەنها ئەو کەسەش قبوڵ ناکات چ لە ناوەوە چ لە دەرەوە تێکبشکێت دەتوانێت ئەوە بکات. کەسێک کە هەرگیز کۆڵنادات، ئیرادە و بیروباوەڕی خۆی خۆشدەوێت، جا گرنگ نییە ڕێژەی ئازادییەکەیان چەند کەم بێت.

هەر وەک لە سەرەوە گووتم، هەموو ئەمانە، تەنها دەتوانرێت وەک بابەتی دەرفەت لێیان تێبگەین. چیرۆکە کەسییەکانی نێو بارودۆخە سەختەکان تەنانەت پەیوەندی بە هاوڵاتییە ئاساییەکانی وەک ئێمەشەوە هەیە. ئێمە ئەگەری ئەشکەنجەدانمان کەمە، ئەمەش جێگەی سوپاسگوزارییە، ناچاریش نین بەرگەی زیندانی تاکەکەسی بگرین، یان لە بەستەڵەکەکانی سیبریا ڕەق ببینەوە. بەڵام هەموو ڕۆژێک، بەهۆی هێرشی ویست و پرەنسیپ، خواستەکانمانەوە هێرشی توند دەکرێتە سەر -بازنەی کەرامەت-مان. هەرچەندە ئەم هێرشانە هێندەی ئەشکەنجە ئاشکرا نین. بەپێچەوانەوە ئەوەندە بچووکن، زۆرجار تەنانەت هەر سەرنجیشیان نادەین: ڕیکلامەکان، فشارە کۆمەڵایەتییەکان، ئامۆژگارییە نەخوازراوەکان لە هەموو لایەکەوە، پڕوپاگەندە هێواشەکان، خواستە باوەکان، ڕیکلامی میدیا و یاسا. ئەوانە وەک تیر وان هەموو ڕۆژێک لە -بازنەی کەرامەت- دەگیرێن. تیری تیژ و ژەهراوین- هیچیان کوشندە نین، بەڵام هەر یەکێکیان ئەوەندە بڕندەن ڕێزی خودیت بریندار بکەن و سیستەمی بەرگری سۆزداریت لاواز بکەن.

بۆچی کۆمەڵگا تۆ بەم تیرانە بۆمباران دەکات؟ چونکە نیگەرانییەکانی ئەوان نیگەرانی تۆ نییە. کۆمەڵگا گونجانی لا گرنگە، نەک حەزە تایبەتەکانی یەک تاکە ئەندام. تاکەکان گرنگ نین، هەر زووش وەک هەڕەشەیەک بۆ کۆمەڵ سەرنجیان دەدرێت- بەتایبەتی ئەگەر کاتێک دەست بە پرەنسیپە جیاوازەکانەوە بگرن. کۆمەڵگا تەنها کاتێک خەڵکی لە ئارامیدا جێدەهێڵێت ئەگەر ئەوان ملکەچ بن. کەواتە خۆت ئامادە بکە بۆ ئەو تیرانە و -بازنەی کەرامەت-ەکەت، توندوتۆڵ بکە.

بازنەی کەرامەت-ت ئەو دیوارە پارێزەرەی کە چواردەوری -ئەزر-ەکانتی داوە، تەنها دەتوانرێت لەژێر ئاگردا تاقیبکرێتەوە. لەوانەیە بانگەشەی نموونەیی و باڵا، باشترین پرەنسیپ، خواستی دیار دابنێیت، بەڵام دەرناکەون تا ئەو کاتەی بەرگرییان لێبکەیت کە تۆ "لەگەڵ بەختەوەریدا بگریت" بۆ ئەوەی شرۆڤەی بارودۆخەکەی ستۆکدەیل بکەیت.

خراپترین هێرشەکان- ئەمەت لە ئەزموونەوە بۆ دەردەکەوێت- زۆربەی کات جەستەیی نین، بەڵکو زارەکین. کەواتە بهێڵە با تاکتیکێکی بەرگریکەرانەت پێبڵێم. وا دابنێ لە دانیشتنێک دایت و کەسێک خەریکە دەست دەکات بە هێرش کردنە سەرت، هەر بەڕاستی خەریکە قسەکانی ڕەق و ناخۆش دەبن. داوایان لێبکە ئەوەی گووتوویانە وشە بە وشە بیڵێنەوە. هەر زوو بۆت دەردەکەوێت، زۆربەی کات، ئەو کەسەی هێرشی کردوویەتە سەر لە تەریقیدا بابەتەکە دادەخات. سەرۆکی سربیا ئەلێکساندە ڤوچیچ

جاریکیان داوای لە ڕۆژنامەنوسێک کرد کە لە ویبسایتەکەی خۆی سوکایەتی پێکردبوو، ئەو قسانەی خۆی کە نوسیبوونی لە کاتی چاوپێکەوتنێکدا بە دەنگی بەرز بیانخوێنێتەوە- ڕۆژنامەنوسەکە تەریقبووەوە و چاوپێکەوتنەکەی لە کورتی بڕاندەوە.

ئەو کەسانەی –بازنەی کەرامەت-یان ڕوونە، لە ئەدەبیات دا زیاتر سەرنجمان ڕادەکێشن وەک لە فیلم دا – تۆد ئەندیرسۆن لە کۆمەڵگای شاعیرە مردووەکان دا، کە لەسەر مێزەکەی هەستایە سەر پێ بۆ ئـەوەی بەرگری لە مامۆستاکەی بکات. یان بیر لە سوقرات بکەرەوە کە ڕەتیکردەوە بە ئاشکرا دان بە فێرکارییەکانیدا بنێت. سزای مەرگی بۆ دەرکـرا، پەرداخە ژەهـرەکەی بەوپەڕی ئارامییەوە خواردەوە.

بە لای زۆربەی کەسەوە، -بازنەی کەرامەت- بابەتی مەرگ و ژیان نییە، بەڵکو جەنگێکە بۆ ئەوەی لە لای سەرەوە بمێنیتەوە. تا بۆت دەکرێت ئەگەری ئەو هێرشانەی دەکرێنە سەرت قورس بکە. کاتێک دێتە سەر ئەو بابەتانەی بەلاتەوە پیرۆزن، با تا مەودای چەند درێژ دەکرێت جڵەو هەر لە دەستی تۆدا بێت. ئەگەر ناچاربوویت دەست هەڵبگریت، بە شێوەیەک دەستهەڵبگرە کە نەیارەکەت بەرزترین نرخ لە بواری کرداری بۆ خۆبەدەستەوەدانت بدات. هێزێکی گەورە لەم ڕاسپاردەیەدا هەیە. یەکێکە لە کلیلەکان بەرەو ژیانێکی باش.

# ٢٨
# بازنەی کەرامەت – بەشی سێیەم
# سەوداگەری ئەهریمەن

لە زنجیرە شاخەکانی ئالپ، کە بەربەستێکی گەورەن لە ناوەڕاستی ئەوروپادا، بۆ ماوەی چەندین سەدە بوونەتە لەمپەر لەبەر گواستنەوەی خەڵکی و کەلوپەل لە نێوان باکور و باشور دا، ئەو ڕۆحە سەرکێشانەش چەندەها جار هەوڵیانداوە لێیان بپەڕنەوە. سەرکەوتووترین ڕێگاش ڕێگای گۆتتارد بووە- کە ناوەڕاستی زنجیرە چیاکانی ئالپ دەبڕێت لە نێوان کانتۆنەکانی سویسرادا وەک ئوری و تیسینۆ. کەچی لە ناوەڕاستی دا -جۆرج شۆلێنین- دوورە دەست و کەژنشین هەبوو کە لە باکوورەوە ڕێنمویی ڕێگاکەی دەکرد. چۆن لەم کەلێنە گەورەیە بپەڕینەوە؟ وەڵامەکەی لە سەدەی سیانزەیەمدا ئەوەبوو پردێک بونیاد بنرێت- پردی ئەهریمەن.

کەسانی ناوچەکە چەند لە بونیادنانی پردێکدا هەوڵیاندابوو شکستیان هێنابوو. لە کۆتاییدا سەرۆکی لیژنە ناوچەییەکە – لاندامان- لە نائومێدیدا هاواری کردبوو"ئێ بهێڵن ئەهریمەن خۆی

پردێک لەوێ دروست بکات!" ئەمە ئەو وشە زۆرکەمانەن پێش ئـەوەی ئەهریمەنی لای ئـەو کەسە سەرسوڕماوانەی ئەو ناوە دەربکەوێت و ڕێککەوتنێکیان بخاتە بەردەست گووترابوون. ئەو خۆشحاڵ دەبێت بـەوەی پردێک لەوێدا دروست بکات، بەڵام بە یەک مـەرج: ڕۆحی یەکەم ڕۆحلەبەر کە بەو پردە تەواوکراوەدە دەپەڕێتەوە بۆ ئەو بێت- واتە بۆ ئەهریمەن.

خەڵکە فێڵبازەکەش قبوڵیانکرد و بەنهێنی وەڵامی پلانەکەیان دایـەوە. دوای ئـەوەی ئەهریمەن پردەکەی دروستکرد، بزنێکیان نارد بۆ ئەوەی یەکەمجار پێیدا بپەڕێتەوە. ئەهریمەنەکەش لە فێڵەکە تێگەیشت و توڕەبوو، بەردێکی هەڵگرت بە قەبارەی خانوێک دەبوو خەریکبوو پردەکە پانوپلیش بکاتەوە. هەر ئەو کات ژنێکی خوداناس بەرەنگاری بووەوە و زەربێکی بە بەردەکەدا هێنا. ئەهریمەنەکەش خەیاڵی ڕۆیشت و بەردەکەی لێکەوتە خوارەوە. زرمەی لە ئەرزەکە هەستاند، بە شێوە تەسک و تروسکەکەدا ڕۆیشتە خوارەوە و بەر پردەکە نەکەوت. نەشوەستا تا بە لای گوندی -گۆشینان-دا تێنەپەڕی. تەنانەت ئەمڕۆش دەتوانیت بچیت بیبینیت هەر لەوێیەو چەند مەترێک لە -ئۆتۆبان-ەوە دوورە- لەو کاتەش بە دواوە پێیگووتراوە "بەردی ئەهریمەن".

خەڵکی یوری ئەوەی لە دەستیان هات کردیان، تەنها لە پێناو ئـەوەی بێ بچووکترین زیـان وازبهێنن- دوای ئـەوەش هاتن و شۆڕشێکیان لە دروستکردنی پردی گواستنەوەدا کرد. ئەم جۆرە چیرۆکانە لە هەموو کلتورەکاندا چنگ دەکەوێت، هەرچەندە زۆربەیان

کەمتر بەم شێوەیە بەهێزن. لە ڕۆمانەکەی ئۆسکار وایلد دا بە ناوی "وێنەکەی دۆریان گرەی" پاڵەوانی ڕۆمانەکە ڕۆحی خۆی بە ئەهریمەن دەفرۆشێت بۆ ئەوەی لە بەرامبەردا تا ئەبەد بە گەنج و جوانی بمێنێتەوە، لەجیاتی ئەوە وێنەکەی پیربێت. کاتێک وێنەکەی بەرە بەرە لە هەموو کات زیاتر ناشرین دەبێت، گرەی لە کاری خراپ و داوێنپیسییەوە دەگلێت، سەرەنجام چیتر ناتوانێت بەرگەی بگرێت و وردوخاشی دەکات، لە ئەنجامدا خۆی دەکوژێت. تەنانەت ئەوەی لەویش بەناوبانگترە ڕێککەوتنە ئەفسانەییەکەی -فاوستن-ە، کە تێیدا کیمیاگەر جۆهان جۆرج فاوست ڕۆحی خۆی دەفرۆشێت بۆ ئەوەی هەموو زانیاری جیهان بەدەستبهێنێت و چێژ لە هەموو خۆشییە مەحاڵ و بەردەستەکانی دونیا ببینێت. گیۆس -نوسەری کتێبەکە- چیرۆکەکە دەکات بە چیرۆکێکی کلاسیکی و ئێستا لە خوێندنگاکانی ئەڵمانیادا خوێندکاران ناچار بەخوێندنەوەی دەکرێن.

فرۆشتنی ڕۆحت واتای چی؟ بێچەند و چوون، هەندێک مامەڵەی ئابووری و بابەتی دیاریکراو لە هەموو سەردەم و نەتەوەکاندا وەک تابو سەیردەکرێن. نە هیچ مامەڵەیەک، نە هیچ بازرگانییەک، نە هیچ دەستاودەستکردنێکی پارە، ئەم شتانە پیرۆز سەیر دەکرێن- نرخیان نایپێورێت. بە لای ئابووریناسێکەوە، بەدڵنیاییەوە هیچ شتێک لەو ئاستەدا نییە نرخی نەپێورێت. شتە پیرۆزەکان تەنها "زیاد لە پێویست نرخێندراون" ئابوریناسەکە دەڵێت- پارەی تەواوی بۆ هەڵبرێژە و خاوەنەکەشی شل دەبێت. هەر ئەمە وا لە گێڕانەوەکانی وەک گەشت لە نوسینی فرەدریک دورینمارت دەکات زۆر سەرنجڕاکێش بن. لە

شانۆگەرییەکەی دورینمارت دا کلێر زاکاناسیان یەک ملیار فرانکی سویسری دەخاتە بەردەم یەکێک لە دانیشتووەکانی شارۆچکەیەکی زۆر هەژاری ئەو وڵاتەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسە خۆشەویستەکەی پێشووی بکوژێت- ئەو ژنەش ئەوەی دەیەوێت بەدەستی دەهێنێت.

ئەم پرسیارە لە خۆت بکە: ئایا شتگەلێک هەیە هێندە پیرۆز بن لات کە بە هیچ نرخێک نەیانفرۆشیت، تەنانەت یەک ملیار دۆلاریش؟ وەڵامەکەت لە چوارچێوەی لاپەڕەکەدا بنوسە.

چی لە لیستەکەدا هەیە؟ ئەگەرە دیارەکان، ژیانت، ژیانی خێزانی بچووک و گەورە و هاوڕێکانت و ڕەنگە ژیانی هەر مرۆڤێک بێت. ئەی تەندروستیت چی؟ قبوڵی دەکەیت نەخۆش بیت، با بڵێن توشی لیۆکیمیا[٢٧] یاخود خەمۆکی ببیت، لە بەرامبەرد یەک ملیار پاوەندت بدەنێ؟ ئەی بیروڕاکانت چی؟ ئایا بیروڕاکانت نرخێکیان هەیە؟ هەندێک سیاسەتمەدار ئامادەیی ئەوەیان تێدایە دەنگی خۆیان بە هەر کۆمپانیایەک بفرۆشن کە بەرزترین بودجەی هەیە. ئایا ئەگەری هەیە تۆش هەمان شت بکەیت؟ ئایا ئەگەر تۆش لەسەر هێڵی هەژاری بژیت بیر لە هەمان شت دەکەیتەوە؟ ئەی کاتەکەت چی؟ ئەی سەرنجەکانت چی؟ پرەنسیپەکانت؟ هەندێکت هەیە تەنانەت ئەگەر ببی بە ملیاردێریش توڕیان نادەیت؟

هەندێکی کەم لەم بڕیارانە ڕەنگە وەک ڕەش و سپی وابن؛ بەڵام ئەوانی دیکە وانین. ئێستە ئەوەی من دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە کە

---

٢٧- لیۆکیمیا: جۆرە نەخۆشییەکە کە جەستەی مرۆڤ ژمارەیەکی زۆر خڕۆکەی سپی بەرهەم دەهێنێت کە دەبێتە هۆی لاوازی و هەندێک جاریش مردن.

بەشێک لە ژیانێکی باش ئەوەیە کە -بازنەیەکی کەرامەت-ی بچووک، بەلام ڕوون و تێروتەسەلت هەبێت، کە ئێستا دەمگەیەنێتە بەشی سێیەمی سێینەکەم. دەبێت بازنەکەمان لە سێ جۆر پەلامار بپارێزین: أ): بەلگەی باشتر. ب): مەترسی کوشندە. ج): مامەلەکردن لەگەل ئەهریمەن دا. ئێستا باسی جۆری سێیەم دەکەم. ئەگەر هێلێکی تەواو ڕوون بە دەوری -بازنەی کەرامەت-ەکەت، دا نەکێشیت، ئەوا هەر جارێک کە مامەڵەیەکی نوێ یاخود پێشنیارێکی نوێ خرایە بەردەستت دەبێت دووبارە بیری لێبکەیتەوە. ئەمە تەنها لەدەستدانێکی گەورەی کات نییە، بەڵکو وردە وردە ڕێزی خودی و ناوبانگت دەسوتێنێت، واتلێدەکات زیاتر لاواز بیت بەرامبەر ئەو پێشنیارانەی لە داهاتوودا دەخرێنە بەردەستت. ئەوە بازنەیەکی مەترسیدرە.

دڵنیام تۆش لە ژیانتدا پێشنیارت خراوەتە بەردەست و لێی بەدەر نیت. مایکڵ ساندڵس مامۆستای زانکۆی هاڤارد لە کتێبەکەیدا بە ناوی "ئەوەی پارە ناتوانێت بیکڕێت" ئەوە دەردەخات کە چۆن لە ماوەی پەنجا ساڵی ڕابردوودا "مامەڵەکان" چۆن دزەیان کردۆتە ناو کایەکانی ژیانەوە. ئەو شتانەی پێشتر جێگەی قسە لەسەرکردن نەبوون، ئێستا بۆ موناقەشەکردن کراوەن. بۆ نموونە ژنێک لە ئەمریکا قبوڵی کرد کە ١٠,٠٠٠ دۆلاری قبوڵ کرد بۆ ئەوەی ناوی کازینۆیەکی ئۆنلاین لەسەر تەختی نێوچاوانی بە تاتۆ بکێشێت، تەنها بۆ ئەوەی پارەی خوێندنی کوڕەکەی پەیدا بکات. بەدڵنیاییەوە ئەمە مامەڵەیەکی خۆبەخشییە، بەلام ئەمە شتێک لە خۆیەوە دەگلێنێت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان پیرۆز و جێگەی قسە لەسەر کردن نەبووە، ئەویش:

جەستەی مرۆڤە، کە تا ئاستێک بێبەها کراوە بخرێتە سەر تەختەی نمایشکردن. ئەمە لە کاتێکدا بانکەکان بەشێوەیەکی ڕۆتینی وەبەرهێنان لە داهاتی ژیانی کەسە بەساڵاچووە خانەنشینکراوەکاندا[٢٨]. تا زووتر ئەو کەسانە بمرن، بانکەکان پارەی زیاتریان دەست دەکەوێت. سەدان لە هاوشێوەی ئەو نموونانە ئەوە دەردەخات کە ئابووری پارەپەرست هێرشەکانی بۆ سەر ئەو بابەتانەی پێشتر پیرۆز سەیر دەکران چڕ کردۆتەوە. تۆ ناتوانیت پێشبینی ئەوە بکەیت یاسادەرکەرەکان ڕێگری لە خراپ بەکارهێنانی لۆژیکی ئابووری بکەن. ئەمە پەیوەندی بەخۆتەوەیە کە بەرەنگاری ئەو هێرشانە ببیتەوە کە لەسەر -بازنەی کەرامەت-ت هەیە.

ئەنجام؟ پێناسەی -بازنەی کەرامەت-ت بە ڕێک و ڕوونی بکە. کاتێک ڤایرۆسە داراییەکان هەوڵدەدەن سیستەمی بەرگری بەهاکانت ببڕن ڕێگە بە خۆت مەدە بکەویتە ژێر کاریگەرییانەوە. ئەو شتانەی لە ناو -بازنەی کەرامەت-تدان، هەمیشە، بابەتی مشتومڕ نین، گرنگیش نییە چەند پارەی کاش دەخرێتە بەردەستت. هەموو شتێکی تر دەبێت بە سەودارگەی لەگەڵ ئەهریمەندا، تۆش وەک خەڵکی ئوری بۆ ئەوەی شوختێکیان بەربکەوێت هەڵنایەیت.

---

٢٨- لە هەندێک وڵاتدا فەڕەنسا بە نموونە, ئەو کەسانەی دەچنە تەمەنەوە حکومەت موچەیەکی کەم و شوێنێکی مانەوە-هۆتێل بە نموونە-یان دەداتێ.

٢٩

## کتێبی نیگەرانییەکان

## چۆن ئەو بڵندگۆیەی ناو سەرت بکوژێنیتەوە؟

وای دابنێ تۆ خودایت و چەشنێک بونەوەری نوێ دروست دەکەیت- پێشوەختە ماددە ڕەقەکانت دیاریکردوە- ئەو ئاژەڵە نوێیە لە شەمپازی دەچێت. ئێستاش لەلای خۆت بەرنامەی کارپێخەری ئەم بونەوەرە دەهێنیت و دەبەیت: پێویستە چەند بە بەهێزی، خێرایی، هەستیاری کاردانەوەی بۆ مەترسییەکان هەبێت، بە تایبەتی بۆ جۆرە نادیار و تەواو گۆترەییەکان؟

ئەگەر بەشی "هەستەوەری مەترسی" زۆر نزم دابنێیت، ئەوا ئەو چەشنە بونەوەرە هەر زوو لەسەر بەردەڵانێک بەر دەبێتەوە و یان لە لایەن دوژمنە سروشتییەکانییەوە دەخورێت. ئەوا هەر لە ماوەی دوو چرکەدا دەمرێت و هەناسەی لەبەر دەبڕێت. بەڵام ئەگەر "هەستەوەری مەترسی"یەکەی زۆر بەرز دابنێیت، ئەوا بوونەوەرەکەت تاهەتایە لە ترسدا لە شوێنی خۆی جوڵە ناکات. پێش ئەوەی دەرفەتی ئەوەی هەبێت خۆی بەرهەم بهێنێتەوە لە

ترسدا دەمرێت، هەمان دەرئەنجامت دەداتێ: لەناوچوون.

کەواتە تۆ پێویستت بە ڕێژەیەکی دروست لە نیگەرانییە- بارێکی لەبار بۆ "پشکنەری نیگەرانی". ئەی کەواتە چی "لەبار"ە؟ بەدروستی لە نێوان دوو توندڕەوی کوشندەدا؟ نەخێر. تۆ بە جۆرێک بەرنامەی ئەو چەشنە بوونەوەرەت دادەنێیت بە ڕادەیەکی زۆر ورد بۆ ئەوەی دوتر پەنجەی پەشیمانی نەگەزیت. وا باشترە جارێک لە سێبەرێکی جوڵاو هەڵبێیت وەک لە پێچەوانەکەی. کەواتە ژەمێکی بەهێزی دژی، شڵەژاوی، نیگەرانی، ترس دەدەیت بە بوونەوەرەکەت- بەڵام ئەوەندە زۆر نەبێت لە ترسدا نەگەڕێت بۆ خواردن.

بیردۆزی پەرەسەندن دروست ئەمەی لەگەڵ هەموو بوونەوەرەکانی سەر زەویدا کردووە. بەئێمەشەوە. هەر لەبەر ئەمەیە ڕۆژ تا ئێوارە خەفەت و نیگەرانی دایگرتووین. ئەم سەختگیرییە بەرنامەیەکی تەواو ئاساییە بۆ مێشکی ئێمە، لە ڕووی بایەلۆجییەوە کەرەستە مادییەکانەوە دامەزراوە و لە ڕووی ڕەوشتیشەوە کوژاندنەوەی مەحاڵە. بە بێ ئەم ئەرکی نیگەرانییە نە تۆ، خوێنەری ئازیز، نە من نە هیچ مرۆڤێکی دیکە بوونی نابێت. زیاتر لە ملیۆنان ساڵە، نیگەرانی وەک ستراتیژییەتێکی نایابی مانەوە خۆی سەلماندووە.

با خۆشحاڵ بین بە بوونی! بەڵام لێرەدا داوێک هەیە: ئاستی نیگەرانیمان چیتر هاوڕێژەیی نییە لەگەڵ مەترسییە ڕاستەقینەکانی ژیانکردن. تۆ چیتر لە ناوچەی ساڤانا نیت، کە پڵنگی کەڵبەدار لە تەنیشت هەموو کونە ئاوێکدا خۆی مات دەدات. لە ڕاستیدا سەدا

ئەوەدی نیگەرانییەکانت لە پێویست زیاترن- یان لەبەر ئەوەی ئەو کێشانەی لە مێشکتدا هەر دەیانهێنیت و دەیانبەیت لە ڕاستیدا مەترسیدار نین یاخود چونکە ناتوانیت چیتر هیچیان بەرامبەر بکەیت. لەسەر قەرەوێڵەکەت ڕابکشێیت و هەر گەرمبوونی گۆی زەوی، ویژدانی بازاڕ، ژیانی دوای مەرگ بهێنیت و ببەیت هیچی لێ شین نابێت. تەنها هەر خەو لە چاوانت دەڕژێنێت.

نیگەرانی هەمیشەیی سەری بە فشاری دەروونی درێژخایەن دەگات، کە دەتوانێت چەندین ساڵی ژیانت لەگەڵ خۆی ببات. نمونەیەکی لە یادنەچوو لە شانشینی ئاژەڵەکانەوە وێنەی کێشەکە دەخاتە ڕوو. چۆلەکەکان چەندین ڕاوکەری سروشتییان هەیە- کونەپەپو، هەڵۆ، ڕاکۆن[29]-. لێکۆڵەرە کەنەدییەکان بڕیاریاندا ناوچەیەکی تەواو دارستانێک بە تۆڕ دابیڕن، بەر بە دوژمنە سروشتییەکانی چۆلەکە بگرن. هەرگیز چۆلەکەکان پێشتر بەو شێوەیە سەلامەت نەبوون. دواتر لێکۆڵەرەوەکان لە چەندین خاڵی شاراوە و جیاوازدا دارستانەکەیان بە بڵندگۆ تەنی. لە ناوچەیەکی دارستانەکەدا دەنگی ژاوەژاوی باڵندە ڕاوکەرەکانیان ئیش پێکرد، لە سەرێکی دیکەشەوە دەنگێکی سروشتی سەلامەتیان خستە سەر. چۆلەکەکان ئەوەیان دەرخست کە لە لای ژاوەژاوە "خراپ"ەکەوە، سەدا چل کەمتر هێلکەیان دانابوو، ئەو هێلکانەشی دایاننابوو بچووکتربوون، کەمتریشیان تروکان. زۆربەی جوجکەکان لەبرسا

[29] ڕاکۆن: باڵندەیەکی ئەمریکای باکوورە پەڕێکی قاوەیی سەوزباوی هەیە، خاڵی ڕەش لەسەر دەموچاویەتی، کلکێکی ئەستووریشی هەیە.

مردن، چونکە دایک و باوکیان لەترسدا نەیاندەوێرا بۆ خواردن بگەڕێن، ئەوانەشی مابوونەوە لاوازتر بوون. لێکۆڵینەوە زانستییەکی ئەوەی خستەڕوو کە تەنانەت پێویست بە مەترسییەکی ڕاستەقینەش ناکات بۆ ئەوەی کاریگەری لەسەر تەواوی ژینگە سروشتییەکەیان هەبێت- تەنها ترس بەسە.

ئەوەی بەسەر چۆلەکەکاندا جێبەجێ دەبێت بۆ مرۆڤەکانیش هەمان شتە. بگرە خراپتریشە، ئێمە تەنها لە باڵدارە ڕاوچییەکان ناترسین، بەڵکو لە هەموو جۆرە شتێکی جیاواز دەترسین. لەوەش زیاتر، نیگەرانی بووە بە تاکتیکێکی سەرنجبەر چونکە ئاسانترە مامەڵە پرسیارە خەیاڵییەکان بکەیت وەک لە کێشە ڕاستەقینەکان. ئەمە ئەو شوێنەیە کە نیگەرانی تێیدا دەبێت بە دواخستن. دەرەنجامی نیگەرانی درێژخایەن سەری دەگات بە بڕیاری خراپ و دەشتوانێت نەخۆشت بخات- تەنانەت ئەگەر لە گۆشەنیگایەکی بابەتییانەوە سەیری بکەین، کە تۆ لە هیچ مەترسییەکدا نیت.

لەم خاڵەدا شتێکی جوان دەبێت ئەگەر ئاماژەت بۆ بکەم بۆ ئەوەی ئەو بڵندگۆیەی ناو سەرت بکوژێنیتەوە. بەداخەوە کە هەرچەندە تێشیدا نییە.

فەیلەسووفە یۆنانی و ڕۆمانییەکان کە بە ستۆیکس[30]-ەکان ناسراون پێشنیاری ئەم فێڵەی دواتر دەکەن بۆ سڕینەوەی نیگەرانی: ئەوە دیاری بکە کە دەتوانێت کاریگەریت لەسەرت هەبێت و ئەوەش

٣٠- ستۆیکس: کەسێکە کە توانای بەرەنگاربوونەوەی سەختی و ئازاری هەبێ بێ ئەوەی بۆڵەبۆڵ بکات و وای پیشانبدات کە هەست بە شتێکی لەو چەشنە دەکات.

کە ناتوانیت. بیر لەوەی پێشوو بکەرەوە. مەهێڵەو ئەوەی دواتریش تەواوی مێشکت دابگرێت و نیگەرانت بکات. دوو هەزار ساڵ دواتر کەسایەتی ئایینی ئەمریکی ڕینهۆڵد نیبوهر بەم شێوەیە خستییە ڕوو" خوای گەورە ئەو صەبرەی پێبەخشیم ئەو شتانە قبوڵ بکەم کە ناتوانم بیانگۆڕم، ئازایەتی ئەوەشی پێبەخشیم ئەو شتانە بگۆڕم کە توانام هەیە، دانایی ئەوەشی پێبەخشیم جیاوازییەکەیان بزانم." ئەمە بە دەستنان بە دوگمەیەکدا بەدەستنایات.

لەم دواییانەدا، خەڵوەت وەک چارەسەرێک بۆ هەموو دەردەسەرییەکانی مرۆڤ پەسەند کراوە- بەتاییەتی بۆ دڵتەنگی و نیگەرانی درێژەکێشکردوو. حەقیقەتەکەی چی؟ خەڵوەتکردن بە کەڵک دێت، بەڵام تەنها لەو کاتەدا کە خەریکی خەڵوەتکردنیت. هەر ئەوەندەی سەرت لەو بارەی تێیدابوویت دەرهێنایەوە بیرکردنەوە و هەستەکان دروست وەک پێشوو دەگەڕێنەوە.

لەگەڵ هەموو ڕێزێکمدا بۆ خەڵوەت و فەلسەفە ستراتیژییەتێکی یارمەتیدەر زۆر بەسوودترە. لێرەدا سێ شت هەن کە بە ئەزموونی خۆم کەڵکم لێوەرگرتوون.

یەکەم: دەفتەرێک بهێنە و ناوی لێبنێ کتێبی گەورەی نیگەرانییەکانم. کاتێکی دیاریکراو بخەرە لاوە بۆ ئەوەی تەرخانی بکەیت بۆ نیگەرانییەکانت. بە دەربڕینێکی کرداری، ڕۆژی دە خولەک تەرخان بکەیت بۆ نوسینی هەموو ئەو شتانەی نیگەرانت دەکەن- گرنگ نییە چەند پشتڕاست کراونەتەوە، گەمژانەن، یاخود نارۆشنن. هەر ئەوەت کرد، تەواوی ڕۆژەکەت بەشێوەیەکی ڕێژەیی خاڵی

دەبێت لەنیگەرانی. مێشکت دەزانێت کە نیگەرانییەکانی تۆمارکراون، نەک ئەوەی سووک و ئاسان پشتگوێخرابن. هەموو ڕۆژێک ئەمە بکە، هەموو جارێک لاپەڕەیەکی تازە هەڵبدەرەوە. درک بەوە دەکەیت، لەلاوە، هەمیشە هەمان دەستە شتن یاخود کەواتە نیگەرانییەکان ئەشکەنجەت دەدەن. لە کۆتایی هەفتەکەدا، تێبینییەکانی تەواوی هەفتەکە بخوێنەرەوە و دوای ئامۆژگارییەکانی براتند ڕەسیل بکەوە" هەر کاتێک خۆتت بینییەوە مەیلی ئەوەت هەبوو مەراقی شتێک بخۆیت، جا گرنگ نییە چییە، باشترین پلان ئەوەیە بەشێوەیەک بیری لێبکەرەوە تەنانەت لە کاتی ئاساییش زیاتر، تا لە کۆتاییدا، تا ئەو سەرنجڕاکێشانە پیسەی نامێنێت."بە دەربڕینێکی کرداری، ئەمە واتا وێناکردنی خراپترین ئەگەری دەرەنجامەکەی و زۆر لە خۆت بکە بیر لە ئەودیو ئەویش بکەیتەوە. بۆت دەردەکەوێت کە زۆربەی نیگەرانییەکان زیادەڕەوییان تێداکراوە. ئەوەی دەمێنێتەوە مەترسی ئەسڵین و ئەوانەن کە دەبێت بەرەنگاریان ببیتەوە.

دووەم: بیمە[٣١] بەدەستبهێنە. سیاسەتی بیمە داهێنانێکی ناوازەیە. یەکێکە لە سەرنجڕاکێشترین نیگەرانی کوژەکان. بەها ڕاستەقینەکەیان تەنها ئەو برە پارەیە نییە کە لە کاتی توشبوونی کێشەیەکدا وەریدەگریت، بەڵکو کەمکردنەوەی ئەو نیگەرانییەیە کە توشت بووە بە تووشییەوە.

سێیەم: تەرکیزکردنە سەر ئیش باشترین چارەسەری

---

[٣١] بیمە: لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی دونیادا "بیمە" هەیە واتا حکومەت برێک پارەت لێدەبڕێت و دواتر لە کاتی نەخۆشکەوتن یاخود مردن، کارەساتدا، هاوکاریت پێشکەش دەکات.

دەروونییە دژ بە مەراقخواردن. تەرکیزکردن و تەواوکردنی ئیش لە خەڵوەتکردن باشترە. ئەوە دابڕینەرێکە لە مەراقەکەت کە هیچ شتێکی تر بەو باشتر نییە.

ئەگەر ئەم سێ ستراتیژییەتە بەکاربهێنیت، دەرفەتێکی ڕاستەقینەت دەبێت بۆ ئەوەی ژیانێکی دوور لە نیگەرانی -ژیانێکی باش- بژیت. دواتر ڕەنگە هەر لە تەمەنی گەنجێتیدا یاخود لە تەمەنی ناوەندیدا بتوانیت بەو تێڕوانینەی مارک توەین کە لە درەنگانێکی ژیانیدا پێیگەیشت بەهێواشی پێبکەنیت" من پیاوێکی پیرم، چەندین کارەساتی گەورەم زانیوە، بەڵام زۆربەیان هەرگیز ڕوویاننەدا."

## ٣٠

# بورکانی بیرورِا
# بۆچی وا باشترە بێ بیرورِا بیت؟

ئایا پێویستە کەمترین موچەی کارمەندان بەرز بکرێتەوە؟ ئایا دوکانەکان دەبێت رێگایان پێبدرێت بۆ ئەوەی خواردنی لەقوتونراو بفرۆشن؟ ئایا ئەوە راستە کە گەرمبوونی گۆی زەوی بە هۆی چالاکییەکانی مرۆڤەوەیە یاخود خەیاڵێکی شێتگرتووی سیاسەتمەدارانی ژینگەپارێزە؟ ئایا پێویستە پاڵپشتیکەرانی -شەریعەت- لە ئەوروپا دەربکرێن؟ دڵنیام وەڵامێکی ئامادەت بۆ هەموو ئەم پرسیارانە هەیە. وەک ئەو کەسانەی حەزیان لە سیاسەتە، یەک چرکە زیاترت پێویست نییە بۆ بریاردان. لە راستیدا ئەم پرسیارانە لەوە زۆر ئاڵۆزترن تا لە چاوتروکاندنێکدا یەکلایی بکرێنەوە. هەر یەکێکیان بۆئەوەی بگەیت بە دەرەنجامێکی گونجاو لانیکەم پێویستی بە یەک کاتژمێر مشتومرِی ورد و گرد هەیە.

مێشکی مرۆڤ بورکانێکە لە بیرورِا. بە بێوەستان بۆچوون و بیرورِا هەڵدەرِێژێت. جا گرنگ نییە کە ئاخۆ پرسیارەکە پەیوەندی بە

باتەوە هەیە یاخود نا، وەڵامیان هەیە یاخود نا، ئاڵۆزن یاخود سادە، مێشک وەک بەفری شادی وەڵام فڕێ دەدات.

لە کردنی ئەمەدا سێ هەڵە دەکات. یەکەم: ئێمە بیروڕای خۆمان لە بارەی ئەو بابەتانەوە دەرەبڕین کە هیچ حەزێکمان لێیان نییە. لە مشتومڕێکی ئەم دواییانەدا لەگەڵ هاوڕێیەکمدا، سەیری خۆمم کرد زۆر بە توندی پاڵپشتیم لە بابەتێکی گەرمی ڕۆژ دەکرد کە ئەویش مشتومڕی وەرزشی بوو. هەرچەندە دوور و نزیک هیچ حەزم لە وەرزشە پیشەگەرییەکان نییە. دەتوانیت هەر ڕۆژنامەیەکی بەناوبانگ بکەیتەوە و بورکانی بیروڕاکانت دەست بە هەڵچوون دەکات. بەردێکی بخەرە سەر- هەر وەک ئەوەی من دەبووایە بمکردایە.

هەڵەی دووەم: ئێمە یەک لێشاو بیرواڕا لە بارەی پرسیارە بێوەڵامەکانەوە دەردەبڕین. کەی دەتوانین پێشبینی دارمانی دواتری بازاڕی پشکەکان بکەین؟ ئایا لە گەردونێک زیاتر هەیە؟ ئایا هاوینی داهاتوو کەشوهەوا چۆن دەبێت؟ هیچ کەسێک ناتوانێت ئەوە بەدڵنیاییەوە بڵێت، تەنانەت کەسە خاوەن ئەزموونەکانیش. کەواتە لێرەشدا، وریای دەرپەڕاندنی بۆچوونەکانت بە.

هەڵەی سێیەم: ئێمە مەیلی ئەوەمان هەیە وەڵامگەلێکی زۆر خێرا بۆ پرسیارە ئاڵۆزەکان بدەینەوە- وەک ئەو پرسیارانەی لە سەرەتای ئەم بەشەدا هەبوون. ئەم هەڵەیە لە نێو هەرسێکیاندا مەترسیدارترینیانە. دەروونناسی ئەمریکی جۆناسان هەیدت لێکۆڵینەوەی گەورەی کردووە لە بارەی ئەوەی کە کاتێک ئێمە ئەمە

دەکەین چی لە مێشکماندا ڕوودەدات، ئەوەی ئاشکرا کرد کە -بەتایبەتی لە پرسیارە قورسەکاندا- حەزی ئەوەمان هەیە یەکسەر بەرەیەک بگرین. تەنها ئەوکات ڕاوێژ بەلایەنی ئەقڵیمان دەکەین و بۆ پاساو هێنانەوە دەگەڕێین بۆ ئەوەی پاڵپشتی بیرۆکەکەمانی پێبکەین. ئەمە سەروکاری لەگەڵ -کاریگەری هۆوریستیک[٣٢]- یدا، هەیە. کاریگەرییەکی هەنوکەییە و سۆزێکی یەک ڕەهەندییە. شتێکی سەرپێیە و تەنها دوو کەشوهەوای هەیە: ئەرێنی و نەرێنی، "بەدڵمە" یاخود "بەدڵم نییە". ڕوخسارێک دەبینیت "بەدڵمە." لە بارەی تاوانێکی کوشتنەوە دەبیستیت " بەدڵم نییە". کاریگەرییەکان تەواو دروستن، بەڵام نەک لە وەڵامدانەوەی پرسیارە قورسەکاندا، کاتێک بە وەڵامە دروستەکەی خۆمان زیاتر ئاڵۆز و شێواوی دەکەین. کاریگەرییەکە بە خێرایی ڕووناکی دەردەکەوێت، بەخێرایی مێشکمان بۆ هۆکار، نموونە، چیرۆکێکی کەسی دەگەڕێین بۆ ئەوەی پاڵپشتی بیرۆکەکەمانی پێبکەین- ئینجا لەوێدا بیرۆکەی خۆمانمان دەبێت. کاتێک دێتە سەر مەسەلەی بابەتە ئاڵۆزەکان پڕۆسەیەکی تەواو ناکامڵە.

ئەو بڕیارە لاوازانەی لەبەر مەبنای بیرۆکە نیوەناچڵەکانەوە دەدرێن دەکرێت کارەساتهێن بن، بەڵام هۆکارێکی دیکەی باش هەیە بۆ ئەوەی ڕێگری لە هەڵڕشتنی بیرۆکەکان بگرین. هەستنەکردن بەوەی هەمیشە پێویست ناکات تۆ بۆچوونێکت لە بارەی بابەتێکەوە

---

٣٢- هۆوریستیک: جۆرە پەروەردەو فێرکردنێکە کە هانتدەدات لە ڕێگەی دۆزینەوەی خودی خۆتەوە فێری شتەکان ببیت.

هەبێت ئەمە وا دەکات مێشکت ئارام بکاتەوە و پشووی زیاترت پێدەدات- پێکهاتەیەکی گرنگە بۆ ژیانێکی باش.

پێشنیاری من چی؟ سەبەتەیەکی "زۆر ئاڵۆز" بۆ خۆت پەیدا بکە. هەموو ئەو پرسیارانەی تێفڕێبدە کە سەرنجڕاکێش نین بەلاتەوە، یان بێوەلامن یاخود ئەگەر هەشیان بێت هەوڵێکی زۆریان دەوێت. نیگەران مەبە، هێشتا یەک کۆمەڵ بابەتت بۆ بەجێماوە کە دەتوانیت یاخود دەبێت بۆچوونێک لە بارەیەوە بخەیتە ڕوو.

لەم دواییانەدا ڕۆژنامەنوسێک پرسیاری بیروباوەڕی سیاسیمی لێکردم. هەر بە ئاشکرا بوون بە نوسەر وا پیشانت دەدات وەلامی هەموو پرسیارە سەرەکییەکانی دونیا بدەیتەوە. ئایا تۆ کەم تا زۆر پاڵپشتی بارودۆخی دەستێوەردان دەکەیت یاخود نا؟ ئایا من پێموایە باجی سەر شمەک لە باجی سەر داهات دادەپەروەرانەترە؟

سەیرێکی چاوەکانیم کرد و گووتم "نازانم". قەڵەمەکەی دانەواند. دەربڕینی ڕووخساری گۆڕا بۆ زەردەخەنەیەکی پڕ لە ئازار، وەک ئەوەی لە مانای ئەم ڕستە سادەیە تێنەگەیشتبێت، گووتی "مەبەستت چییە نازانیت؟"

"بیرم لێنەکردۆتەوە."

"بەلام دەبێت بۆچوونێکت لە بارەیەوە هەبێت!"

"نا، نیمە. ئەو بابەتە لە سەبەتە -زۆر ئاڵۆزە-کەمدایە."

زۆر پشووبەخشە هیچ بۆچوونێکت لە بارەی هەموو بابەتێکەوە نەبێت. هیچ پێویستیش ناکات نیگەرانی ئەوە ببیت کە بێ بۆچوونی هێمایەکە بۆ لاوازی باری ڕۆشنبیری. وانییە. ئەوە

نیشانەیەکی ڕۆشنبیرییە. بێ بۆچوونی سەرمایەیەکی گەورەیە. ئەوە سیخناخکردنی زانیاری نییە ئەم سەردەمەی ئێمەی شێواندووە، بەڵکو سیخناخکردنی بۆچوونە.

ئەو بابەتانەی سەرنجت ڕادەکێشن زۆر بەوردی هەڵیانبژێرە. بۆچی دەبێت ڕێگە بدەیت ڕۆژنامەنوسەکان، بەکارهێنەرانی ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت، بەکارهێنەرانی تویتەر کۆنتڕۆڵی ئەوە بکەن کە لە مێشکتدا هەیە. خۆ ئەوان بەڕێوبەرت نین! زۆر وریابە لە هەڵبژاردندا. هەموو شتێکی دیکە فڕێبدەرە سەبەتە "زۆر ئاڵۆز"ەکەتەوە. کاتێک داوات لێدەکرێت بڕیاری خۆت لە بارەی ئەم شت و ئەو شتەوە بدەیت، خۆت دوورەپەرێز بگرە. بەسەرسامییەوە بۆت دەردەکەوێت کە دونیا بێ بیر و بۆچوونەکانی تۆش هەر لە سوڕانەوەی خۆی بەردەوامە.

بەڵام چ کات دەتەوێت بۆچوونێک بونیاد بنێیت و دەبێت چۆن ئەوە بکەیت؟ کاتێک بخەرە لاوە بۆ ئەوەی بە ئارامی لە بارەیەوە بنوسیت. نوسین ڕێگایەکی نمونەییە بۆ ئەوەی بیرکردنەوەکانت ڕێکبخەیت. بیرۆکەیەکی نارۆشن کاتێک هەڵیدەڕێژیت و دەیخەیتە سەر شێوازی ڕستە بۆ خۆی ئۆتۆماتیکی ڕوونتر دەبێتەوە. لەکۆتاییدا، بەتایبەتی تێڕوانینی ئەو کەسە دەرەکییانە کە جیاواز لە تۆ بیر دەکەنەوە. کاتێک دڵنیایت لە بۆچوونەکەت، بیخەرە بەر نەشتەری پرسیار. هەوڵبدە بەڵگەکانت کونپشت بکەیت، ئەوە تاکە ڕێگایە بۆ ئەوەی بۆت دەربکەوێت دەستی پێوە بگریت یاخود نا.

بە کورتی و بە پوختی، تا بیر و بۆچوونی خێرا کەمتر

هەڵبگریت، ژیانت باشتر دەبێت. پڕکێشی ئەوە دەکەم بڵێم نەوەد و نۆ لە سەدی بۆچوونەکانت سووک و ئاسان پێویست نین. تەنها یەک لە سەدیان پەیوەندییان بە تۆوە هەیە- بە ژیانی کەسایەتی و ژیانی کارکردنتەوە. تەنانەت کاتێک دێتە سەر ئەم کۆمەڵە بچووکە لە بابەت، یەکسەر پڕ مەدەرە ئەو بۆچوونەی بورکانی بیرۆکەکانت فڕێیدەدات. بیهێنەرە بەرچاوی خۆت کە لەگەڵ پێنج میوانی دیکەدا بانگهێشتی مشتومڕێکی تەلەفزیۆنی کراویت، هەمووشیان بەتوندی پاڵپشتی تێڕوانینەکەی دژ بەوەی تۆ دەکەن. تەنها ئەو کاتە دەتوانیت مشتومڕی بیروبۆچوونەکانیان بکەیت، لانیکەم بە جۆرێک ڕەوانبێژی کە وەک ئەوەی میراتی خۆت بێت، ئەو بۆچوونەی خۆتت بەدەستهێناوە.

## ٣١
# قەڵای مێشکیت
# چەرخەی بەخت

ساڵی ٥٢٣.ز بەیانییەک لە دەرگـای پـەرژینی پێشەوەی بۆیسیۆس درا. بۆیسیۆس تەمەنی چل ساڵ بوو، کەسێکی بەناوبانگ و سـەرکـەوتـوو بـوو، بـە جـۆرێـک لـە جۆرەکانیش ڕۆشنبیرێک بوو متمانەیەکی زۆر بە خۆی بـوو. لە خێزانێکی دەوڵەمەند - ئەرستۆکرات-دا لەدایکبووبوو، لە باشترین خوێندنگا خوێندبووی. لە ژێر دەسەڵاتی پادشا سیۆدۆریک باڵاترین ئۆفیسەکانی وڵاتی لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمادا لەژێر دەستدا بوو. باشترین هاوسەرگیری کـرد و بووبە خاوەنی چەند منداڵێکی نایاب. شـەو و ڕۆژێشی تەرخانکردبوو بۆ گەورەترین خولیای کە ئەویش وەرگێڕانی کتێب بوو لە یۆنانییەوە بۆ لاتینی (لەو ڕۆژگارانەدا بە ئاستەم کەسێک دەدۆزییەوە بتوانێت نوسخەی ئەسڵی کتێبە یۆنانییەکان بخوێنێتەوە) بۆیسیۆس، لە لوتکەی سامان، ناوبانگ، پێگەی کۆمەڵایەتی، وزەی داهێنەرانەدا بوو، کە ئەو لە دەرگادانەی لەوەوپێش ئامازەی پێدرا

هات، یەکسەریش دەستگیر کرا. تۆمەتبارکرابوو بە پاڵپشتیکردنی پیلانگێرییەک دژی دەسەڵاتی سیۆدۆریک، لە غیابی خۆشیدا سزای مەرگی بۆ دەرکرا. سەرمایەکەی، پارەکەی، ئازادییەکەی، خانووەکانی، وێنەکانی و پۆشاکە جوانەکانی- هەموویان دەستیان بەسەرداگیرا. دواین کتێبی لە زینداندا بە ناوی -دڵنەواییەکانی فەلسەفە-وە نوسی. ساڵێک دوای دەستگیرکردنی هەر وەک باو بوو لە ڕێگەی شمشێرەوە سەری پەڕێندرا. ئەمڕۆ گۆڕەکەی بۆیسیۆس دەتوانیت لای کلێسای سان پیترۆ لە سیل دۆرا لە پاڤیا سەردانی بکەیت (نزیکەی سی میل لە باشوری ڕۆژئاوای شاری میلان لە ئیتاڵیا).

دڵنەواییەکانی فەلسەفە بووبە یەکێک لە خوێندراوەترین کتێبی چاخەکانی ناوەڕاست، هەرچەندە بەپێچەوانەی نزیکەی هەموو کتێبە سەرکەوتووەکانی چاخەکانی ناوەڕاستەوە، دوور و نزیک پەیوەندی بە بیروباوەڕی کریستیانییەتییەوە نییە. ئەم کتێبە لە بارەی چییەوەیە؟ کاتێک بۆیسیۆس لەزینداندا دادەنیشێت- ترساو، نائومێد، چاوەڕوانی سێدارەیە- لەناکاو، شێوەی خانمێکی بەتەمەنتر دەرکەوت: "فەلسەفە". ئەو خانمە دونیای بۆ ڕووندەکاتەوە کە هەندێک ئامێری مێشکی بۆ دابینکردووە (لەم ڕوانگەیەوە ئەمە پێچەوانەی خواست و خولیاکانی ئەم کتێبە نییە) بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لەگەڵ ئەم بارودۆخە قوتارنەبووە، نوێیەی دەست و پەنجە نەرم بکات. ئەمانەی خوارەوە پوختەیەکە لە پێشنیارەکانی فەلسەفە، کە بەدڵنیایەوە هی -بۆیسیۆس-یشن.

یەکەم: بوونی چارەنووس قبوڵ بکە. لە ڕۆژگاری بۆیسیۆس دا خەڵکی حەزیان دەکرد چارەنووس بە کەسی بکەن و ناوی بنێن –فۆرتونا: ئەو خودا مێینەیەیە کە چەرخی بەخت هەڵدەسوڕێنێت کە لە کۆتاییدا لایە بەرز و نزمەکان هەر هەڵدەگێڕدرێنەوە-. ئەوانەی بەڕووکەش وایان دەردەخست کە ڕازین پێی، هیوای ئەوەیان دەخواست کە لە کاتی بەرزبوونەوەیدا ئەو چەرخە چنگ بخەن، دەبوو ئەوەش قبووڵ بکەن سەرەنجام جارێکی دیکەش نەوی دەبنەوە. کەواتە زۆر نیگەرانی ئەوە مەبە کە بەرزکراویتەوە یاخود نزمکراویتەتەوە. دەکرێت هەمووی ژێراوژوور و بەسەر سەردا قلْپ بکرێتەوە.

دووەم: هەموو ئەو شتانەی هەتن بەها، خۆشەویستی، هاوسەرەکەت، منداڵەکانت، هاوڕێکانت، خانووەکەت، مارەکەت، نیشتیمانت، ناوبانگ و پێگەت هەموویان کورتخایەنن. زۆر دڵت وابەستەی ئەو شتانە مەکە. ئاسوودە بە، ئەگەر چارەنوس ئەوانەی پێبەخشیت خۆشحاڵ بە، بەڵام هەمیشە ئاگادار بە کە ئەو شتانە کاتی و کورتخایەن و شکستەن. باشترین هەڵوێست لێرەدا ئەوەیە کە هەموویان قەرزن بەسەرتەوە، ڕەنگە لە هەر کاتێکدا لێتوەربگیرێنەوە، ئەگەر بە هیچ شتێکی دیکەش نەبێت، ئەوا مەرگ لێتوەردەگرێتەوە.

سێیەم: ئەگەر تۆ وەک بۆیسیۆس هەندێک شت یاخود تەنانەت هەموو شتێکت لەدەستداوە، ئەوەت بیربێت لە ژیانتدا لایەنی ئەرێنی لە لایەنی نەرێنی قورس و سەنگینتربووە (یاخود بۆڵەبۆڵ و گلەیێت

نەکردووە) هەموو ئەو شتە شیرینانەش تامی تاڵییان گرتووە. کرۆزانەوە کارێکی دروست نییە.

چوارەم: ئەوەی ناتوانرێت لێتوەربگیرێتەوە بیرکردنەوە و کەلوپەلە زیهنی، شێوازی لێکدانەوەتە بۆ بەختی خراپ، لەدەستدان و بەربەستەکان. دەتوانیت بەمە بڵێیت بۆشایی قەڵای مێشکیت- ئەمە برێک ئازادییە کە هەرگیز ناتواندرێت پەلاماربدرێت.

دڵنیام پێشتر هەموو ئەمانەت خوێندۆتەوە و بیستووتن، تەنانەت بە لای - بۆیسیۆس -یشەوە، بیرۆکەی نوێ نەبوون. ئەوانە بناغەی ستۆیزیسم بوون، فەلسەفەیەکی کۆنی باڵای پراکتیکییە بۆ ژیان، کە بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چوار سەدەر پ.ز، هەزار ساڵ پێش بۆیسیۆس لە ئەسینا بوونی هەبووە. لە دوو سەدەی سەرەتای زایینیدا لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دا بە نوێبوونەوەیەکدا تێپەڕی. — ستۆیکس-ە یەناوبانگەکان پێکدێن لە سێنیکا (کەسێکی ملیۆنێر بوو)، ئێپیکتێتس (کۆیلە بوو) مارکۆس ئۆریلییەس (ئیمپراتۆرێکی ڕۆمانی بوو). بەشێوەیەکی بەرچاو تاکە لقی فەلسەفەیە کە وەڵامی کرداری بۆ پرسیاری ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ دەخاتە ڕوو. لق و پۆپەکانی دیکەی فەلسەفە لە ڕووی فکرییەوە فەلسەفە بەرەوپێش دەبەن، بەڵام یارمەتییەکی کەم بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ژیاندا دەخەنە ڕوو.

بۆیسیۆس یەکێک بوو لە دوایین -ستۆیکس-ەکان، پێش ئەوەی مەسیحییەت بەتەوای مێشکی خەڵکی بە تەم بپۆشێت، بەرپرسیارێتی ژیانی مرۆڤێکیش بداتە دەست وەهمێک کە ئەویش (خودایە). بۆ هەزار ساڵی تر ئەم تەمە بەرزنەبووەوە. کەچی تەنانەت دوای

هەڵهاتنی شکۆمەندانەی خۆری ڕۆشنکەری، ستۆیسیزم تاڕادەیەکی زۆر پشتگوێ خرا- بەشێوەیەکی بنچینەیی تائەمڕۆش وەک مەعریفەیەکی کەسانی ئەو بوارە ماوە. تروسکەی بیرکردنەوەی -ستۆیک-ی لێرە و لەوێ دەرکەوتووە، هەر وەک ئەو کاتەی ڕزگاربووی هۆلۆکۆست، ڤیکتۆر فرانکل نووسیویەتی" دواین ئازادی مرۆڤ ئەوەیە هەڵوێستی کەسێک بەرامبەر شتەکان هەڵبژێرێت." بەتەواوی وەسفی قەلای مێشکی دەکات. ئەگەر ڕۆمانی "ئەگەر ئەمە مرۆڤ بێت"ی پریمۆ لیڤی بخوێنیتەوە سەرتدەسوڕمێنێت لەوەی چۆن ئەزموونی خۆی بەشێوەیەکی -ستۆیک-ی لە ئۆردوگای دەستبەسەرگرتندا دەگێڕێتەوە. هەر وەک لە بەشی ٢٧ دا -ستۆیک جەیمس ستۆکدەیڵ-مان بینی کە حەوت ساڵی وەک زیندانی جەنگ بەسەر برد، کە حەوت ساڵیانی لە زیندانی تاکە کەسیدا بەسەر برد. بەشێوەیەکی گشتی، بۆچوونی -ستۆیکس-ەکان، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا نامۆیە پێمان. ئەگەر وشەی "چارەنوس" بەکاربهێنیت، ڕەنگە مەبەستت لە شکستێکی سیستماتیک بێت وەک لە چەرخەی بەخت. بێکاری، برسێتی، جەنگ، نەخۆشی، تەنانەت خودی مەرگیش- لەمانەدا ئێمە لۆمەی سیستەمی هەموو شتێک دەکەین. ئێمە وابیردەکەینەوە کە کەوتووینەتە نێو درزەکانەوە.

بەڵام ئەمە ڕێگایەکی هەڵەیە بۆ بیرکردنەوە لەوە. بەتایبەتی، چونکە چارەنووس زۆر دەگمەنتر دەمانگرێت- لانیکەم لە بوار و ناوچەکانی ئێمەدا- بەڵام لە ڕووی سۆزدارییەوە بەهێزتر بەرمان دەکەوێت. لەوەش زیاتر، تا دونیا ئاڵۆزتر و پەیوەستتر

بێت بەیەکەوە، ئەوا ئەگەری زرمە لێهەستانی چارەنووس توندی نوێ و تەواو پێشبینینەکراو زیاتر دەبێت. بەکورتی و بە پوختی، لە هەموو شتێک گرنگتر ئەوەیە وەبەرهێنان لە سندوقی کەلوپەلە ڕۆشنبیرییەکانتدا بکەیت کە لە ڕووی سۆزدارییەوە بۆ لەداستدان و شکست ئامادەت دەکات.

تۆ پێویست ناکات ببیت بە بۆیسیۆس، یاخود جولەکەکانی ژێردەستی حیزبی نازی ئەڵمانیا لە نێوان سالانی ۱۹۳۳ بۆ ۱۹٤٥، یاخود ببیت بە هاوڵاتی ئاسایی سوریا کە بەهۆی جەنگی ناوخۆیی ولاتەکەیانەوە گیریان خواردووە بۆ ئەوەی بەهۆی چارەنووسەوە گیر بخۆیت. چەلەحانێیەکی سەر تۆڕی ئینتەرنێت دەتوانێت بە تەواوی لە پەل و پۆت بخات. قەیرانێکی ئابووری جیهانی دەتوانێت هەموو پارە هەڵگیراوەکانت لەناو ببات. خێزانەکەت عاشقی هاوڕێیەکی فەیسبووک دەبێت و لە ماڵەکە دەتکەنە دەرەوە. هەموو ئەوانە خراپن، بەڵام کوشندە نین. پێشتر بەسەر هەموو تاقیکردنەوەکانی چارەنووسدا سەرکەوتوویت. بیر لە مەحالی تێگەیشتن و بۆچوونەکانت بکەرەوە، بیر لەو هەزاران منداڵبوونە بە ئێش و ئازارەی دایکت، نەنکت، نەنکی نەنکت و تا کۆتایی بکەرەوە کە ناچاربوون بەرگەی بگرن( هەندێکیان تا ئەندازەی مردن خوێنیان لەبەر ڕۆیشتووە)، تەنها بۆ ئەوەی تۆ بهێننە ئەم دونیایەوە. کەچی تۆش ئێستا بۆڵەبۆڵی ئەوە دەکەیت سندوقی کەلوپەلەکانت بەهایان تا نیوە کەمیکردووە؟

با بە ئاسانی بیلێین، دونیا پڕە لە بەخت و نائارامی، هەر ناوە ناوەیەکیش ژیانت ژێراو ژوور دەبێت. بەختەوەری لە پۆست و پێگە، ئۆتۆمۆبێلی گرانبەها، هەژماری بانکیت، سەرکەوتنی کۆمەڵایەتیدا نادۆزیتەوە. دەکرێت هەموویت لە چرکەیەکدا لێوەربگیرێتەوە- هەر وەک ئەوەی لە بۆیسیۆس وەرگیرایەوە. بەختەوەری تەنها دەتوانرێت لە قەڵای مێشکیت دا بدۆزرێتەوە. بۆیە وەبەرهێنان لەوەدا بکە، نەک لە پارە کۆکردنەوەدا بۆ کڕینی ئۆتۆمۆبێلێکی -پۆڕش-.

٣٢

## ئیرەیی

## ئاوێنە، ئاوێنەی سەر دیوارەکە

نوسەری قسەڕەقی ئەمریکی گۆری ڤیدال لە چاوپێکەوتنێکیدا دانی بەوەدا نا" هەر جارێک هاوڕێیەک سەرکەوتنێک بە دەست دەهێنێت شتێکی بچووک لە مندا دەمرێت." لەمەدا ئەو هەستێکی دەربڕی کە هیچ حەز ناکات دانیپیدابنێت، هەرچەندە ماوە ماوە هەموومانی گرتۆتەوە. ناپێویستترین، بێکەڵکترین، ژەهراویترینی هەموو هەستەکان ئیرەییبردنە.

نەک ئەوەی ناپێویستبوونی ئیرەیی بۆچوونێکی نوێ بێت، تەنانەت فەیلەسوفە یۆنانییەکانیش ئێمەیان لێ ئاگادار کردۆتەوە. ئینجیل لە دەیان چیرۆکدا هێزە وێرانکەرەکەی دەخاتە ڕوو، لەسەرو هەمووشیانەوە لە کورتەچیرۆکی هابیل و قابیل دا. بەفری سپی چیرۆکێکی تاواناسی ئەفسانەییە کە نموونەیە بۆ ئیرەیی.

بە هەمان شێوە براوەی خەڵاتی نۆبڵ براتند ڕەسێڵ ئیرەیی وەک یەکێک لە گرنگترین سەرچاوەکانی بەدبەختی سەیر دەکات. ئیرەیی

کاریگەرییەکی گەورەتری هەیە لەسەر ڕازیبوونت لە ژیان وەک ئێش و ئازاری جەستەیی، دارمانی ئابووری، یان توانای بەڕێوەبردنی ئەوانە کە بناغەن بۆ ژیانێکی باش. ئەگەر بتوانیت ئەوە لە بن و ڕەگەوە دەربهێنیت، ئەوا پێشکەوتنێکی سەرەکیت بەخۆتەوە بینیوە. بەداخەوە ئێمە مامەڵە لەگەڵ پرۆگرامێکی پەرەسەندوودا دەکەین کە بەزاندنی سەختە.

ئیرەیی تەنها هەستێکی مرۆیی نییە، بەڵکو لەڕاستیدا نەژادێکی ئاژەڵییە. هەر دوو لێکۆڵەری بواری بوونەوەرە مەمکدارەکان فرانک دی واڵ و سارا برۆسنان دوو کاپوچینەیان وەک خەڵات بۆ ئەرکێکی سادە دانا کە ئەویش ئەرکێکی ئاسان بوو بۆ هەر یەکێکیان پارچەیەک خەیار دانرابوو. وادەردەکەوتن قایلمەند بن، مەیمونەکان بە سووپاسگوزارییەوە پارچە خەیارەکەی خۆیان قبوڵ کرد. بۆ جاری داهاتوو، لێکۆڵەرەوەکان یەک کوپ کەپوچینەیان بۆ خەڵاتی خواردنی پارچەیەک خەیار دانا، بەڵام یەکێکیان ترێیەکی شیرین بخوات. کاتێک یەکەم مەیمون ئەوەی بینی، پارچە خەیارەکەی خۆی لە قەفەزەکەوە فڕێدایە دەرەوە و ڕەتیکردەوە هاوکارییان بکات.

ئەمە شتێکی سەرنجڕاکێشە لە بارەی ئیرەییبردنەوە: تا زیاتر خۆمان بە کەسانی دیکە بەراورد بکەین، مەترسییەکانی چاوچنۆکی گەورەتر دەبن. لە سەرو هەمووشییەوە، ئێمە ئیرەیی بەو کەسانە دەبەین کە لە ڕووی تەمەن، پیشە، ژینگە و شێوازی ژیانەوە وەک یەکین. یاریزانە پیشەگەرەکانی تێنس خۆیان بە یاریزانە پیشەگەرەکانی تێنس بەراورد دەکەن، بەڕێوبەرە گشتییەکان بە بەڕێوبەرە گشتییەکان،

نوسەرەکان بە نوسەرەکان. تۆ خۆت بە پاپای ڤاتیکان بەراورد ناکەیت، بۆیە ئیرەیی بەو نابەیت. هەمان شتیش بۆ ئەلیکساندەری گەورە یاخود کەسێکی زۆر سەرکەوتووی سەردەمی چاخی بەردین کە لەو بەشەی تیی لیدەژیت لەسەر زەوی هەر ڕاستە. هەمان شت بۆ کەسێک کە لەسەر هەسارەیەکی دیکە دەژی، قرژێکی سپی گەورە، درەختێکی سوورەداری زەبەلاح هەر ڕاستە. هیچکام لەوانە- هەرچەندە ڕەنگە بوونەوەری نایاب بن- بابەتێکی لەبار نین بۆ ئیرەیی پێبردن.

لێرەشدا چارەسەرمان بۆ کێشەکە هەیە. واز لە خۆ بەراوردکردن بە کەسانی دیکە بهێنە و چێژ لە بوونێکی دوور لە ئیرەیی دەبینیت. خۆت لە هەموو جۆرە بەراوردکردنێک بە دوور بگرە. ئەوە یاسایەکی ئاڵتونییە. قسە فەقیرە هەموو کەس پێیدەوێرێت. هەندێکجار بەراوردەکان لە مەیدانی کردارید بە قورقوراگەتدا ڕۆچوونەتە خوارەوە. زانکۆی کالیفۆرنیا بە نموونە بە یاسا ناچارکراون بۆ ئەوەی یاسای لێکۆڵەرەکانیان بە شێوەیەکی گشتی بەیان بکەن. وێبسایتێک هەیە کە تێیدا لێکۆڵەرەکان دەتوانن بزانن کە هاوپیشەکانیان چەند پەیدا دەکەن. ئەگەر تۆ لە نیوەی خوارەوەدا بیت، ئەوا کەمتر ڕازی دەبیت لە ئیشەکەت وەک لە پێش ئەوەی ئەو زانیارییە بزانیت. بە دەربڕینێکی تر، ڕۆشنی بەختەوەری وێرانکردووە.

تاقیکردنەوەیەکی لەڕوو زۆر گەورەترە لە بەراوردکردندا لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان. ئێستا زانیارییەکی باوە کە فەیسبووک زۆر کەس بە تۆڕەیی و ماندوویی جێدەهێڵێت. لە لێکۆڵینەوەیەکدا لە زانکۆی هەمبۆڵت، لێکۆڵەرەکان بڕیاریاندا هۆکارەکەی بدۆزنەوە. لە بەشی سەری سەرەوەی

شوێنێک، شارێک، دراوس یەک هەڵبژێرە بۆ ئەوەی لێیبژیت کە تۆ لە نێوانیاندا "هەڵبژاردەی ئەو ناوچەیە بیت". هەمان شت بۆ گروپە هاوئاستەکەت ڕاستە. ئەگەر کەسێکی ساماندار نیت، ئەوا بەشداری ئەو گروپە خێرخوازییانە مەکە کە پڕن لە ملیۆنێر. تۆ واباشترە ببیت بە خۆبەخشێکی خزمەتی ئاگرکوژێنەوە- بەو شێوەیەش هەر شتێکی مانادار دەکەیت. لەسەرو هەمووشیانەوە ئاگاداری وەهمی تەرکیز بە کە لە بەشی یانزەمدا مشتومڕمان لە بارەوە کرد. با بڵێین کە تۆ ئیرەیی بە دراوسێکەت دەبەیت، چونکە ئۆتۆمۆبێلێکی -پۆرش ۹۱۱ تۆربۆ-ی سیلڤەری بریقەداری بە میرات بۆ بەجێماوە. کاتێک دراوسێکەت بە میهرەبانییەوە بۆ لای ئۆتۆمۆبێلەکەی دەچێت کە بەجوانی پارککراوە و لە پەنجەرەی ژووری نوستنەکەتەوە دیارە، تۆ لە داخدا "بەچکە پشیلەیەکی سیلڤەر" دەبینیت. هەموو جارێک کە مەکینەی ئۆتۆمۆبێلەکەی بەگەڕ دەخات وەک ئەوە وایە چەقۆیەکی بچووک بە دڵتدا بکەن. کەچی ئەمە تەنها بەهۆی ئەوەوەیە کە تۆ تەرکیز دەخەیتە سەر شتێکی هەڵە. لە بەراوردکردنی ژیانی دراوسێکەت لەگەڵ ژیانی خۆتدا، تۆ بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی جەخت دەخەیتە سەر ئەو لایەنانەی جیاوازن- پۆرشە ۹۱۱کەی بە ئۆتۆمۆبێلە (VW GOLG- ڤی دەبلیو گۆڵف) ەکەی خۆت بەراورد دەکەیت. لەمەدا تۆ زیاد لە پێویست گرنگی ئەو شتەی ئەوان لەسەر ڕازیبوونت لە ژیان مەزەندە دەکەیت. تۆ باوەڕت وایە کە دراوسێکەت بەشێوەیەکی زۆر زیاتر لە تۆ خۆشحاڵترە، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی سەیری بکەین ئۆتۆمۆبێل هاوبەشییەکی زۆر کەم دەکات (وەک هەرشتێکی تر) لە سەرتاپای باشبوونی تۆ وەک لە

بەشی ١٢ دا بینیمان. ئەگەر ئاگاداری وەهمی تەرکیز بیت، ئەوە دەتوانیت گەستنی ئیرەیی کەم بکەیتەوە. ئەوەت بیر بێت، ئەو شتانەی تۆ ئیرەییان پێدەبەیت گرنگییان زۆر لەوە کەمترە کە وەک تۆ بیری لێدەکەیتەوە.

ئەگەر هیچ لەمانە بەکەڵک نەهاتن، هێشتا لە چاوچنۆکیدا دەکولێیت، ئەوا کاتی ئەوەیە چەکە قورسەکان دەربهێنیت: بەمەبەست خراپترین بوارەکانی ژیانی کەسەکە دەستنیشان بکە و بیهێنەرە بەرچاوی خۆت کە حەلوەلایانە بەدەست ئەو کێشانەوە. ئەوە یەکسەری واتلێدەکات هەست بە باشتر بوون بکەیت. لە ڕاستیدا دەبێت دانی پێدا بنێین کە ئەوە چارەسەرێکی زۆر باش نییە، بەڵام شتێکە لە کاتی پێویستدا هانای بۆ ببەین.

ئەگەر وا ڕوویدا ژیانت بە تایبەتی شایستەی ئەوە بوو ئیرەیی پێببرێت، ئەوا بە خاکەڕایی و سادەیی بمێنەرەوە. بەو ڕێگایە یارمەتییەکی بچووکی کەسانی دیکە دەدەیت بۆ ئەوەی لە خراپترین ئازاری چاوچنۆکی بیانپارێزیت. سادەییبوونی تۆ هاوکاریکردنی تۆیە بۆ باشبوونێکی گەورەتر. گەورەترین سەختی بەردەم سەرکەوتن وەک دەڵێن ئەوەیە بێدەنگبیت لە بارەیەوە. ئەگەر بەنیازیت شانازی بە هەر شتێکەوە بکەیت، شانازی بەوەوە بکە.

کەواتە دەبێت چی لەم هەموو شتە وەربگریت؟ دەبێت ئەوە وەربگریت کە هەمیشە کەسێک دەبێت لە دراوسێکەتدا، لە بازنە کۆمەڵایەتییەکەتدا، لە بواری کارکردنەکەتدا کە لە تۆ باشتر کار دەکات. ئەوە قبوڵ بکە. تا زووتر ئیرەیی لەسەر سەکۆی هەستەکانت لا ببەیت باشترە.

٣٣

## خۆلادانەکان

## پێش ئەوەی ناچار بیت چارەسەری کێشەکان بکەیت خۆتیان لێ لابدە.

پێش ئەوەی ئەم بەشە بخوێنیتەوە، تاوێک بوەستە بۆ ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە: دانایی چییە؟

ڕەنگە یەکسەری وێنەی خانمێک یاخود پیاوێکی پیری دانا لە مێشکتدا قوت ببێتەوە- وێنەی ئەو کەسانەی ئەزموونێکی زۆر زیادیان هەیە. ڕەنگە بیر لە پڕۆفیسۆرێک بکەیتەوە کە کتێبەکانی کتێبخانەیەکی بچووک پڕ دەکەن. یان ڕەنگە وێنای شوانێکی ڕاستگۆی کۆن کە لە ناوچە سروشتییەکانی شاخەکانی ئالْپ لە سویسرا دەژی یاخود ماسیگرێک کە ماسیگرێکی سادە کە لە دەلتای ئەمازۆن دەژی. یان ڕەنگە وێنای ڕەبەنێک بکەیت کە لەسەر لوتکەی شاخێک قاچی خستۆتە سەر قاچ.

واز لە خەیاڵکردن بهێنە: با بگەڕێینەوە بۆ پرسیارەکە. دانایی چییە؟ کەسێک لە بەرنامەیەکی پرسیاری تەلەفزیۆنیدا دەتوانێت

لیستێک ناو دابنێت و ئەستێرەیەک وەک ئاماژە بدات لەو براوەی ئەو ناوانەی لە پێشبڕکێی یۆرۆڤیشن دا براوە دەبن ڕەنگە کەسێکی دانا بن، بەڵام ڕەنگیشە وانەبن، ڕەنگە مێشکییان بە کۆمەڵێک شتی پڕوپووچ و بێکەڵک نەئاخنیبێت. تەنانەت ئەگەر لە چەقی بازنەی پێشبڕکێدا بیت (سەیری بەشی ١٤ بکە)-کە کە ڕەنگە پێویستی بە زانیارییەکی تایبەت هەبێت- هیچ گەرەنتییەک نییە بۆ دانایی. کەواتە دانایی لەگەڵ کەڵەکەکردنی زانیاریدا کۆک نییە.

دانایی توانایەکی -کرداری-یە. پێوانەیەکی ئەو بەهرانەیە کە ئێمە ژیانی پێ ئاراستە دەکەین. هەر ئەوەندەی گەیشتیت بەوەی درک بەوە بکەیت کە لە ڕووی کردارییەوە هەموو سەختییەکان خۆ لێلادانیان باشترە وەک لە چارەسەرکردن، ئەوا ئەم پێناسە سادەیەی دواتر دەبێت بە بەڵگە لەسەر خۆی"دانایی خۆلادانە".

ڕاستییەک هەیە ئەویش ئەوەیە کە ژیـان سەختە. کێشەکان وەک باران لە هەموو لایەکەوە دادەبـارن. چارەنوس لەژێر پێتەوە مەترسییەکی شـاراوەت بۆ هەڵدەتۆقێنێت و چەند بەربەستێکت بۆ قـووت دەکاتـەوە بۆ ئـەوەی ڕێگاکەت دابخـات. تۆ ناتوانیت ئەوە بگۆڕیت. بەڵام ئەگەر بزانیت مەترسییەکە لەکوێوە خۆی مات داوە، ئەوا دەتوانیت خۆتی لێبپارێزیت. دەتوانیت خۆت لە هەموو جۆرە بەربەستەکان لابدەیت. ئەنشتیان بەم شێوەیە دەریدەبڕێت" کەسی زیرەک کێشە چارەسەر دەکات. کەسی دانا خۆی لێلادەدات."

کێشەکە ئەوەیە خۆلێلادان خۆش نییە. وێنەی چیرۆکی دوو فیلم بهێنەرە بەر چاوی خۆت ئەوانیش، أ و ب. لە فیلمی أ دا کەشتییەک

خۆی بە شاخێکی سەهۆڵیندا دەدات. کەشتییەکە نوقم دەبێت. کاپتنە خانەدانەکە بە لەخۆبوردوویی و نارەحەتییەوە هەموو سەرنشینەکان لە نوقمبوون ڕزگار دەکات. خۆی دوایین کەس دەبێت لە کەشتییەکە بەجێدەهێڵێت و هەڵدەگەڕێتە سەر بەلەمێکی ڕزگارکردن- تەنها چەند چرکەساتێکی کەم پێش ئەوەی کەشتییەکە تاهەتایە لە ناو دەرچەیەکی پڕ لە کەفدا ونببێت. لە فیلمی ب دا کاپتنەکە کەشتییەکە بە دەوری شاخە سەهۆڵینەکەدا دەسوڕێنێتەوە، تا ئەندازەیەکی دوور خۆی لێدەپارێزێت. پارە بە سەیرکردنی کام فیلمەیان دەدەیت؟ بەدڵنیاییەوە أ. بەڵام وەک سەرنشینێکی ڕاستەقینەی سەر کەشتییەکە کام بارودۆخەیانت لا پەسەندە؟ بەڕوونی دیارە: ب.

بابڵێین کە نموونەکان ڕاستەقینەن. دواتر چی ڕوودەدات؟ کاپتی أ بانگهێشتدەکرێت بۆ وتاردان. ڕێککەوتننامەی کتێبێکی شەش بەرگی لەگەڵ دەکرێت. کڵاوی کاپتنییەکەی تا هەتایە هەڵدەگرێت و ژیانی لەسەر بوون بە قسەکەرێکی هاندەر پەیدا دەکەت و لە بۆنە و یەکتربینینە بە کۆمەڵییەکاندا وەک کەسێکی خاوەن ئەزموون بۆ هەماهەنگییەکی سەرەکی قسە دەکات. شارۆچکەکەی شەقامێک بە ناوییەوە دەکەن و منداڵەکانی بۆ یەکەمجار تا ئێستا هەست بە شتێک وەک شانازی بە باوکییانەوە دەکەن. لە سەرێکی ترەوە کاپتنی ب بەردەوام دەبێت لە خۆلادان لە بەربەستەکان تا چەندین ساڵی دواتر خانەنشین دەکرێت، با بیبەستینەوە بەو ڕاستییە گشتییەوەی کە چارلی مەنگەر باسی دەکات" من یاسایەکم هەیە لە ژیاندا، ئەگەر کێژاوێکی گەورە هەبوو تۆش نەتویست بە بیست پێ لە کۆڵ خۆتی

بکەیتەوە- ئەوا بە [illegible] پێی ب [illegible] بسوڕێرەوە." هەرچەندە ئەوەی دەردەکەوێت کاپتنی ب کاپتنێکی باشترە، بەڵام ئێمە کاپتنی أ گەورە دەکەین. بۆ؟ چونکە سەرکەوتن شتێکە لە ڕێگەی خۆلادانەوە بەدەستدێت (بۆ نموونە، سەرکەوتووانە خۆت لە شکستەکان لابدە) ئەمانە لە دونیای دەرەوەدا نادیارن.

ڕاگەیاندنی ئابووری هیچ شتێکی وەک بەڕێوەبەرێکی شلەژاو خۆشناوێت، ئەوەش بەشی خۆی باشە، بەڵام دەبێت بە شێوەیەکی بەرزتر چەپڵە بۆ ئەو بەڕێوەبەرە لێبدەن کە ڕێگری کرد لەوەی کە کۆمپانیاکە لە یەکەم هەنگاودا پێویستی بە گۆڕانکاری گەورە هەبوو. ئەوان لە ژێر ڕاداری میدیا بە دوورن. تەنها خودی بەڕێوەبەرەکە و تیمەکەی دەزانن چەند ژیرانە مامەڵەیان کردووە- تەنانەت ئەو کاتیش بە ئاستێکی سنووردار.

سەرەنجام، ئێمە بەشێوەیەکی سیستماتیکی زیاد لە پێویست جەخت لە ڕۆڵی جەنەڕاڵ، سیاسەتمەدار، پزیشکی نەشتەرگەری فریاکەوتنە و پزیشکە دەروونییە دەکەینەوە، کەچی ڕۆڵی ئەو کەسانە بە هەند وەرناگرین کە کۆمەڵگە و تاکەکان لە توشبوون بە کارەسات دەپارێزن. ئەوانە پاڵەوانی ڕاستەقینەن، دانا ڕاستەقینەکان: پەرستارەکان، مامۆستا باشەکان، یاسادانەرە هەستیارەکان، دیپلۆماتکارە بەهرەدارەکانن.

ئەی سەبارەت بە ژیانی خۆت چی؟ تەنانەت ئەگەر باوەڕیش بەوە نەکەیت، ڕاستییەکە ئەوەیە کە لانیکەم نیوەی سەرکەوتنەکانت بەهۆی خۆلادانەوەکانتن. دڵنیام هەر وەک هەمووومان، تۆش ناوبەناو

کارێک تێکدەدەیت، بەڵام لەوە زیاتر خۆت لە هەڵە گەمژەکان لادەدەیت. بیر لەو مەترسییانە بکەرەوە کە بەهۆی دانایی پێشبینیکردنتەوە خۆت لێ لاداوە- لە ڕووی تەندروستی، پیشە، لایەنی ئابوونی و پەیوەندییەکانتەوە.

خۆ لێلادان شتێکی پڕوپووچ نییە. هاوارد مارکس بەڕێوەبەری بانکی بیمەی ئەمریکی لە کتێبەکەیدا بە ناوی گرنگترین شتەکان چیرۆکێک لە بارەی قومارچییەکەوە دەگێڕێتەوە" ڕۆژێک بیستی کە ئەسپسوارییەک هەیە تەنها یەک ئەسپ بەشداری تێدا دەکات، بۆیە گرەوی لەسەر پارەکە کرد. هێشتا خولێکی بەسەر ئەسپەکەوە تەواو نەکردبوو، ئەسپەکە خۆی بەسەر پەرژینەکەدا هەڵدا و هەڵهات." هێنری کیسینگەر ئاماژە بۆ ئەم هەڵانە دەکات و وەک "نەبوونی خەیاڵ" ئاماژەیان بۆ دەکات. خۆلادان تەنها زانیاری پێویست نییە، پێویستی بە خەیاڵکردنە، بەداخەوە خەیاڵکردنیش زۆرجار بەهەڵە لێیتێگەیشتووین. زۆربەی خەڵک وایدادەنێن واتە کاتێک پەرداخێک شەراب هەڵدەقوڕێنیت لێبگەڕێیت خەیاڵت بگەڕێت. بەداخەوە، ئەمە دەبێتە هۆی ڕێگری لەبەردەم بەرهەمهێنانی بیرۆکەی نوێ. خەیاڵکردن واتە ئەوەی زۆر لە خۆت بکەیت بە درێژایی ڕێگاکە بیر لە ئەگەر و دەرئەنجامەکان بکەیتەوە- تا دوا دلۆپی شەربەتەکە دەدڵیقێندرێتە دەرەوە. بەڵێ، خەیاڵکردن کارێکی سەختە. ڕەنگە توش هەمان بیرکردنەوەت هەبێت، بەتایبەتی دێتە سەر کێشە گەورەکان! ئایا بەڕاست پێویست دەکات بەردەوام بۆڵەت بێت لە بارەی کارەساتە شاراوەکانەوە؟ ئەوە تەنها نائومێدت ناکات؟ ئەزمون دەڵێت

نەخێر. بەگوێرەی چارلی مەنگەر " بەدرێژایی هەموو ژیانم کە ژیانم کردووە پێشبینی کێشەم کردووە...ئەوە دڵتەنگی نەدەکردم کە هەموو کات پێشبینی کێشە بکەم و ئامادە ببم بۆ ئەوەی بەتەواوەتی هەموو هەوڵێکی خۆم بخەمە گەڕ ئەگەر کێشەیەکم تووش بوو."

پێشنیاری ئەوەت بۆ دەکەم هەفتەی پانزە خولەک بە مەبەست تەرخان بکەیت بۆ ئەوەی تەرکیز بکەیتە سەر مەترسییە شاراوەوە و کارەساتبارەکان لە ژیانتدا. دواتر هەموویان لە بیربکە و تەواوی هەفتەکە بەدڵخۆشی و دوور لە نیگەرانی بەسەر ببە. ئەوەی لەو پانزە خولەکەدا دەیکەیت پێیدەگووترێت پرێمۆرترتم. بۆ نموونە بیهێنەرە بەرچاوی خۆت کە هاوسەرگیرییەکەت لە قەیراندایە، یاخود لەناکاو تووشی مایەپووچی بوویت یاخود توشی سەکتەی دڵبوویت. ئێستا هەنگاوێک بگەڕێرەوە، هەموو ئەوانەی گەیاندیتی بەم کارەساتە (وێناکراوە)-یەکسەر بچۆرە سەر هۆکارە گرنگەکان. وەک دواهەنگاو، هەوڵبدە ئەم بابەتانە وەک خراپترین بناسێنە کە هەرگیز ڕوونادەن.

بەدڵنیاییەوە ئەگەر هەموو ئەمانە ناوە ناوە و بەخودئاگاییەوە بکەیت، ئەوا هەر چاوپۆشی لە مەترسییەکان دەکەیت و بڕیاری هەڵە دەدەیت. ئەم کارەساتە بەپیرەوەهاتووانە تەنها لە ڕێگای ڕووکردنە واقیع و ڕاستەوخۆ چارەسەرکردنی کێشەکانەوە ئەهوەن دەبنەوە. بەڵام لە ڕووی ئەو سەختییانەوە کە دەتوانیت پێشبینییان بکەیت، وائاسانترە خۆتیان لێلابدەیت وەک لەوەی چارەسەریان بکەیت. دانایی خۆلێلادانە. نادیارە، بۆیە ناتوانیت کەشوفشی پێوە بکەیت، بەڵام پۆزلێدان بەهیچ شێوەیەک نابێتە هۆی ژیانێکی باش. خۆت پێشتر ئەوە دەزانیت.

٣٤

# کارێک بۆ بوژانەوەی مێشک

بۆچی تۆ لە بارودۆخی هەموو دونیا بەرپرس نیت؟

لە سوریا فڕۆکە جەنگییەکان بە مەبەست نەخۆشخانە و تیمە یارمەتیدەرەکان دەکەنە ئامانج. خوێنڕێژەکانی داعش لەبەر چاوی کامێرا خەڵک سەردەبڕن. لە لیبیا کۆمەڵەی چەتە قاچاغچییەکان پیاو و ژن و منداڵ بە کۆیلە دەگرن، تا ئەو کاتەی لە پەلوپۆ دەکەون کاریان پێدەکەن، دواتر بە سواری بەلەمی بچووکەوە فڕێیاندەدەنە ناو دەریای ناوەڕاستەوە، کەنیوەیان تێیدا نقوم دەبن. لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا قاتی لە دوای قاتی ژیانی ملیۆنان کەسی وێرانکردووە. لە سەرتاسەری جیهاندا، منداڵان بە "ئایدز"ەوە لەدایک دەبن، مەحکومن بەوەی ژیانێکی کورت و تاڵ بژین. لەپشت چەندین دەرگای داخراوەوە توندوتیژی خێزانی زرم و کوتی دێت. ژیان پڕە لە دڵڕەقی. تۆش کتێبێک لە بارەی -ژیانێکی باش-ەوە دەخوێنیتەوە. ئەمانە چۆن پێکەوە دەگونجێن.

هەرکەسێک تۆزقاڵێک ویژدانی هەبێت بە هەڵچوونەوە

کاردانەوەی بۆ هەموو ئەم شتە ترسناکانە دەبێت. کەچی برێکی زۆر کەم خەڵک پلانیان هەیە دەست و پەنجە لەگەڵ هەڵچووندا بکەن. هەموو چیرۆکێک هاوارێکە بۆ یارمەتی. ئێمە حەز دەکەین بە برێکی زۆر ئاوەوە سەفەری ئەسیوبیا بکەین و بە دەستی خۆمان بیدەینە دەست ئەو کەسانەی لەوێ خەریکە لە برسدا دەمرن. بەڵام دواتر بۆمان دەردەکەوێت منداڵەکانمان ئەو ئەرکەکانی ماڵەوەیان پەیوەست بە قوتابخانەوە جێبەجێنەکردووە، پێویستە کەسێک ڕەشاشەکەیان بۆ بکاتەوە و کەرەشمان نەماوە.

کەچی ئێمەش بەهۆی نادادییەکانی دونیاوە وەڕزین. ئێمە پێویستمان بە ستراتیژییەتێکی کەسی هەیە- سندوقێکی کەلوپەلی مێشکی- بۆ ئەوەی لەگەڵ نەهامەت و کارەساتەکانیدا سەر دەربکەین بێ ئەوەی هێمنی ناوەکیمان لە دەست بدەین. لێرەدا پێنج پێشنیار هەن.

یەکەم: لە ئاستی تاکەکەسیدا هیچ شتێکت لە دەست نایات، بەمەرجێک ئەگەر وارێکەوتبێت کە ناوت، ئۆگەستس، چارلیماگن، جۆن ئێف کەنەدی بێت. ئەوە جوان بخەرە مێشکتەوە. زۆربەی ئەو کارەساتانەی بەدەستی مرۆڤ خولقاون (جەنگ، تیرۆریزم، شەڕ و پێکدادانەکان) زۆر لەوە ئاڵۆزترن کە دەردەکەون، هەر لەبەر ئەوەیە هیچ کەس ناتوانێت پێشبینی ئەوە بکات سەرەنجام بە کوێ دەگەن. هەر لەبەر ئەوەشە زۆر زیاتر لەوەی پێشبینیان دەکرێت درێژە دەکێشن. پێویست ناکات دکتۆرات لە سەرکردایەتی سەربازیدا هەبێت بۆ ئەوەی لەوە تێبگەیت کە زۆربەی جەنگ و ئاڵۆزییەکان

ناتوانرێت تەنها لە ڕێگەی هۆکاری سەربازییەوە یەکلایی بکرێنەوە. بەنزیکەیی هەموو دانیشتوانی عێراق و لیبیاپێش دەستتێوەردانی نیازباشی هێزەکانی ڕۆژئاوا گوزەرانیان باشتر بوو- کە ئەوەی هەیە کاریگەرییەکی لاوەکی بێپلانانە بوو. تەنانەت وەک سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تیمی باشترین ڕاوێژکار بۆ هەموو ئەگەرەکان، تەنانەت تۆش زیاد لە پێویست خەملاندنی خۆت دەکەیت کە هەڵە دەکەیت و پەنجەت دەچزێت- نەک لەبەر نەبوونی هاوخەمی و بەزەیی، توانای سەربازی و زانیاری، بەڵکو بەهۆی تێوەگلان لە ئاڵۆزییەکانی ڕەفتارە دوژمنییەکانی بەرامبەر. تەنانەت ڕێکخراوێکی وەک –کۆڕبەندی ئابووری جیهانی WEF- کە ئامانجی دیاریکراوی ئەوەیە" دونیا بکات بە شوێنێکی باشتر"هەر زۆر لەمەو پێش شکستی لە تەواوکردنی ئەرکەکەیدا هێناوە. هەرچەندە هەولێکی زۆری داوە بۆ ئەوەی پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لەگەڵ کەسانی بەهێز و دەوڵەمەندا بونیاد بنێت، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی و بابەتی لەم ڕێکخراوە بڕوانین ئەوا لە کاتی دامەزراندنییەوە هیچ شتێکی بەدەست نەهێناوە. کەواتە زیاد لە پێویست مەزەندە و پێشبینی لە خۆت مەکە. تۆ ناتوانیت ئەم قەیران و ئەو قەیران بخەیتە سەر شانی خۆت چارەسەریان بکەیت. ئەگەریش پێتوایە دار عەسای سحریت پێیە و لە چاوتروکاندنێکدا کۆتایی بەم جەنگ و بەو جەنگ دەهێنیت، ئەوا دووبارە بیر بکەرەوە. لە هەموو ئەو بابەتانەی لەم شێوەیەن، کەسێکە کە نزیکتر بووە لە بارودۆخەکە و بەشێوەیەکی پرۆفیشنالانە خەمخۆری بابەتەکان بووە ماوەیەکی

زۆر لەمەو پێش ئەم چارەسەری تۆی ڕەتکردۆتەوە، بەدڵنیاییەوە لەبەر هۆکاری باشیش.

دووەم: ئەگەر دەتەوێت یارمەتی ئەوە بدەیت ئازارچەشتن لەسەر ئەم هەسارەیە کەم بکەیتەوە، ئەوا پارە ببەخشە. تەنها پارە، نەک کات. پارە. سەفەر مەکە بۆ ناوچەی جەنگ و پێکدادانەکان، تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت ئەگەر پزیشکی فریاگوزاری، کەسێکی خاوەن ئەزموون لە بۆمب پوچەڵکردنەوەدا یاخود دیپلۆماتکار بیت. زۆربەی کەس بە گەوجێتی خۆبەخشی هەڵدەخڵەتێن- باوەڕیان وایە شوێنێک بۆ کاری خۆبەخشی هەیە. لە ڕاستیدا هەر کات بەفیڕۆدانە. کاتەکەم بەشێوەیەکی مانابەخشتر لە -بازنەی پێشبڕکێ-دا وەبەربهێنە (سەیری بەشی چواردەیەم بکە)، چونکە لەوێدایە کە زۆربەی بەهاکانت لە ڕۆژەکەدا دروست دەکەیت. ئەگەر بۆری ئەو لە بیاباندا دادەمەزرێنیت، ئەوا تۆ کارێک دەکەیت کە بیرهەڵکەنەکان دەتوانن بە تێچوویەکی کەم جێبەجێی بکەن. با بڵێین کە وەک خۆبەخشێک دەتوانیت لە ڕۆژێکدا تەنها یەک بیر هەڵبکەنیت. ئەگەر ئەو ڕۆژە بە کارکردن لە دیدەنگەکەتدا[33] بەسەر ببەیت، ئەو پارەیەی پەیدات کردووە بەکاری بهێنیت بۆ ئەوەی بیدەیت بە بیرهەڵکەنەکانی ئەو ناوچەیە، ئەوا لە کۆتاییدا دەبیت بە خاوەنی سەد بیری نوێ. بەدڵنیاییەوە خۆبەخشی واتلێدەکات هەست بە باشبوون بکەیت، بەڵام ئەوە نابێت لەو بارەیەوە بێت. درەوشانەوەی ئەم گەرموگوڕی و خەمخۆرییەش لەسەر بنەمای هەڵەیەک بونیادنراوە. کەسانی

٣٣- دیدەنگە: ئۆفیس.

تایبەتمەندی پلەیەک لە ماڵپەڕەکانی (Medicins sans frontiers
خاچی سوور، یونیسێف) یارمەتییەکان لە سوودی زۆر کاریگەرتردا
دەخەنە گەڕ وەک لەوەی خۆت دەتوانیت بیکەیت. کەواتە سەخت
کار بکە و پارەکەت بخەرە دەستی کەسانی خاوەن ئەزموونەوە.

سێیەم: بەتوندی خۆت لە هەواڵە وێرانکەرەکان بە دوور بگرە- بە تایبەتی کاتێک دێتە سەر کارەساتە مرۆییەکان. دانیشتن بە دیار تەلەفزیۆنەوە، سەیرکردنی وێنەی ئەو کارەساتانە و مستەکۆلە توندکردنت یارمەتی هیچ کەسێک نادات. نە قوربانییەکان، نە خۆت. "گرنگیدان"ت، بە کارەساتە جیهانییەکان جگە لە دۆشدامان بەدیاریانەوە هیچ شتێکی دیکە نییە. "بەردەوام ئاگاداربوونت" ڕەنگە وات لێبکات هەست بکەیت مرۆڤدۆستتریت، بەڵام حەقیقەتەکە ئەوەیە کە تۆ خۆت هەڵدەخڵەتێنیت. هەروەها قوربانییەکانیش. ئەگەر بە ڕاستی دەتەوێت جەنگ، کارەسات، تەنگژە و پێکهەڵپژانێک تێبگەیت، ئەوا باشترە کتێبێک بخوێنیتەوە، تەنانەت ئەگەر تا ساڵێکی دیکەش بڵاو نەکرێتەوە. هەر وەک چۆن درامایەک خۆی دەکاتەوە و تۆش ناتوانیت هیچ شتێک بگۆڕیت (تەنها لە ڕێگەی بەخشینەوە نەبێت).

چوارهەم: دەتوانیت بەشێوەیەکی لۆجیکی مەزەندەی ئەوە بکەیت کەگەردوون لەگەڵ ژیاندا هەر بگرە و بەردەیانە کە هەموو ئەو قەیران، کارەسات، ئازارچەشتنانە لەسەر چەندین هەسارەی تر لەگەڵ ئەوەی خۆماندا زۆر باوە. ئەم بیرۆکەیە یارمەتیمان دەدات هەندێک تێڕوانینمان دەستبکەوێت. بە دەربڕینێکی دیکە، هێزی شەڕ- خراپە- هەمیشە لەدەورمانە، ئەوە شتێکی گەردوونییە و لە کۆڵمان

نابێتەوە. لەبەر ئەوەی سەرچاوە کەسییەکانی تۆش سنووردارن، بۆیە دەبێت تەرکیز بکەیت. دوو بۆ سێ ڕێکخراوی ئاوەدانکردنەوە دەستنیشان بکە و بەشێوەیەکی میهرەبانانە ببەخشە. دڕندەییەکانی دیکەش- کە لە شارەکەت، وڵاتەکەت، لەسەر ئەم هەسارەیە یاخود ئەستێرەکان دیکەدا هەیە- تەنها پێویستت بەوەیە بەشێوەیەکی -ستۆیک-ی قبوڵیان بکەیت.

پێنجەم: تۆ لە بارودۆخی هەموو دونیا بەرپرس نیت. هەرچەندە دڵرەق و بێبایەخانە دەردەکەوێت، بەڵام ئەوە ڕاستییە. براوەی خەڵاتی نۆبڵ لە بواری فیزیادا ڕیچارد فەینمان هەمان شتی لە لایەن -جۆن ڤۆن نیومان-ەوە کە بیرکارێکی زۆر بلیمەتە و بە (باوکی حسابکردن) دادەنرێت"جۆن ڤۆن نیومان بیرۆکەیەکی سەرنجڕاکێشی پێبەخشیم کە ئەویش ئەوەیە پێویست ناکات تۆ بەرپرس بیت لەودونیایەی تێیدایت. بۆیە بەهۆی ئامۆژگارییەکەی -ڤۆن نیومان-ەوە، گەشەم بە جۆرێک نابەرپرسیاری کۆمەڵایەتیدا. لەو کاتەوە بووم بە مرۆڤێکی زۆر دڵخۆش." ئەوەی کە نیومان مەبەستییەتی لە (نابەرپرسیارییەتی کۆمەڵایەتی) ئەوەیە کە: دڵتەنگ مەبە بەوەی کە لە جیاتی ئەوەی لە ئەفریقا نەخۆشخانە دروست بکەیت سەرقاڵ و مژۆڵی کاری خۆتیت. هیچ هۆکارێک نییە هەست بە تاوان بکەیت لەبەر ئەوەی تۆ وارێکەوتووە بارودۆخەکەت لە قوربانییەکی تەقینەوەکانی حەلەب باشترە- ڕەنگە لە چاوتروکاندنێکدا بارودۆخەکانتان پێچەوانە ببێتەوە. ڕێنمووییی ژیانێکی ڕاست و ڕەوان و بەرهەمدار بکە و مەبە بە ئەژدیها. شوێن ئەو ئامۆژگارییە

بکەوە و ئەوا هەر خۆت هەماهەنگیت لە دونیایەکی باشتردا کر
سەرەنجام؟ ستراتیژییەتێک بدۆزەرەوە بۆ ئەوەی یار
بدات لەگەڵ ئەم دڵڕەقییانەی دونیادا سەر دەر بکەیت. پێو
ناکات ببیت بە یەکێک لەوانەی لێرەدا پێشنیارم کردن، بەڵام
پلانێکت هەبێت. ئەگینا بەپێچەوانەوە ژیانکردن سەخت د
بەردەوام لە نێوان ئەو شتانەی هێشتا دەبێت بکرێن لێ
دەبیتەوە- سەرەنجامیش بەو ئەرکە هیچ شتێک تەواو ناکەیت

# ٣٥
# داوی تەرکیز
# چۆن گرنگترین سەرچاوەکانت بەڕێوە ببەیت؟

لە ڕیستۆرانتێکدا دانیشتوویت و ورد چاو بە خشتەی خواردنەکەدا دەگێڕیت. هەڵبژاردەکەت لە نێوان "خشتەیەکی دیگوستاسیۆی سەرسامکەر" "A la carte" [٣٤] دایە. هەر زوو بۆت دەردەکەوێت کە تێکەڵەی پێشژەم و خواردنی سەرەکی هەموو میوانەکان زۆر لەوە گرانترە کە لە خشتەی تامکردنەکەدا هەیە، کە شەرابیشی تێدایە- هەر لەبەر ئەوەشە تۆ داوای دەکەیت، گارسۆنەکە بزەیەک دەکات" بژاردەیەکی باشە، زۆربەی خەڵک داوای ئەوە دەکەن."

ژەم لە دوای ژەم ڕیزە قاپ دەهێندرێت- ئەمویس بارچ، چوار جۆر گۆشتی جگەر، ماسی سەلەمۆن کە بە سرکە لەگەڵ

٣٤- A la carte: واتە ئەو جۆرەی بە دڵی خۆت لەسەر هەر قاپێک کە نرخی خواردنەکانیان جیاوازە برێک هەڵدەبژێریت.

ئەسپاراگەس دا تێکەڵ کراوە، چۆکۆلاتەی ساڤاریان بە شلیکەوە، هێلکۆکەی ماسی مێینە، تەختێک پەنیر بە هەنجیرێکی زەردی قاوەیی باوەوە، سیری کێوی ڕیکۆتا ڕاڤیۆلی، دواتر ئاوی لیمۆ بۆ ئەوەی مەلاشوت پاک بکاتەوە، دواتر گۆشتنی سنگی مراوی، قاپێک باینجان و حەواسڵ و هەموو جۆرە خواردنێک بە زنجیرەیەکی بێکۆتایی پێشکەش دەکرێت. دواتـر چەندین جۆر شـەراب پێشکەش کرا، هەموویان بە یەک لەدوایەکدابوونێکی یەکسان. نزیکەی دوای بیست خولەک، داوای وەسڵی پارەکە دەکەیت، هەرگیز پێشتر ئەوەندە شتەت بە خۆت کۆنەکردۆتەوە، هەرگیز لە ژەمێکی ئاوا قەرەباڵغدا هێندە شتی جیاوازت نەخواردووە، هەرگیزیش ئەوەندە دڵت تێکەڵ و پێکەڵ نەهاتووە.

واز لەو نانخواردنە بهێنە کە لە ڕاستیدا ڕوویدا. زیاتر لە ڕووە کلتورییەکەوە، ئەگەر باسی خواردن بکەین، بەڵام کاتێک دێتە سەر میوانە ملیاردێرەکان- وەک کەسانی وارن بەفێت و بیڵ گەیتس- ئەوا مەراسیمەکە زۆر تایبەت دەبێت. بیڵ گەیتس داوا لەو کۆمەڵەیە دەکات کە وا هەست دەکەن گرنگترین هۆکاربوون لە سەرکەوتنیاندا. بەفێت گووتی" تەرکیز بکەن." بیڵ گەیتس ڕازیبوو. ئەمە شتێکی بەڵگەنەویستە کە تەرکیزکردن گرنگە، بەڵام لەوەش پێویستتر ئەوەیە بۆ کوێی ئاراستە دەکەیت. ئـەوەی بـەرچاوە ئەوەیە کە لە جیاتی هەڵبژاردنی ئەو بابەتانەی تەرکیزیان بخەینە سەر " a la carte" لە بەیانی تا ئێوارەوە هەر سەرمان لەسەر "زانیاری تامی خورادنەکان"ە، کە کەسانی دیکە بۆیان هەڵبژاردووین. ئیمەیلەکان، ئەپدەیتەکانی

فەیسبووک، نامە و تێکستەکان، پۆستەکانی تۆڕی کۆمەڵایەتی تویتەر، سەردێڕی ئەو هەواڵانەی لە سەرتاپای دونیاوە پێمان دەگات، لینکی دۆکۆمێنتەکان، ڤیدیۆ کلیپی وێبسایتەکان، ئەو شاشانەشی تا چاو بڕ بکات لە فرۆکەخانە و وێستگەی شەمەندەفەرەکاندا دەیانبینین- هەر هەموویان ڕکابەری دەکەن بۆ ئەوەی سەرنجی ئێمە ڕابکێشن. ئێمەش بێوەستان هەندێک جار بە چیرۆکی بێبایەخ و هەندێک جاریش بە چیرۆکی جۆشهێنەوە سەر گەرم دەکەین. مەرایی دەکرێین، هەوڵدەدەن پاڵپشتیمان وەربگرن، پێشنیارمان بۆ دەکەن. ئینجا هەروەها ئێمەش کەمێک هەست دەکەین وەک پادشاین، کە لە ڕاستیدا دەبێت هەست بکەین کۆیلەیەکین و بە نانەسکی دەژین.

هەموو ئەم پێشنیارانە دزین نەک دیاری، دۆڕانن نەک بردنەوە، قەرزن نەک پارەی کاش. پۆستێکی ئینستاگرام، جا گرنگ نییە چەند جوان ڕازێندراوەتەوە، قەرزێکە. هەواڵە بەپەلەکان قەرزن. ئیمەیلێک (لە زۆربەی حاڵەتەکاندا) قەرزێکە. ئەو چرکەساتەی دەیخوێنینەوە، پارە دەدەین- بۆ ئەوەی تەرکیز بکەین کات و تەنانەت پارەش.

تەرکیزکردن، کات، پارە سێ گرنگترین سەرچاوەکانمانن. دووانەکەی دواتریان زیاتر ئاشنان. تەنانەت زانستێک هەیە تەرخانکراوە بۆ کات و پارە- لەو چوارچێوەیەدا پێیدەگووترێت "کار و "سەرمایە". تەرکیزکردن هەرچەندە کەمۆکەیەکی لێتێگەیشتووین، ئەمڕۆ بەهادارترینی ئەو سێ سەرچاوەیەیە، گرنگترینە بۆ سەرکەوتنی ئێمە و باشبوونمان. بەداخەوە کاتێک دێتە سەر بابەتی تەرکیزکردن، ئێمە چەندین هەڵەی سیستماتیک دەکەین. لێرەدا چەند ڕێگایەکی گرنگ

هەن کە لە ڕێگەیانەوە دەتوانیت خۆتیان لێ لابدەیت.

یەکەم: ئەوەی نوێیە تێکەڵی مەکە لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی بەتۆوە هەیە. هەر شتێکی نوێ- بەرهەم، بیروڕا، سەردێڕی هەواڵ- جەماوەرێکی دەوێت. تا دەنگی دونیا بڵند بێت، ئەوا دەبێت دەنگی بەرهەمەکە بڵندتر هاوار بکات بۆ ئەوەی ببیسترێت. ئەم ژاوەژاوە زۆر بە جیددی وەرمەگرە. زۆربەی ئەم بانگەوازە شۆڕشگێڕانەییە ناپەیوەستن.

دووەم: خۆت لەو بابەت و تەکنەلۆژیایانە بە دوور بگرە کە "بەخۆڕایین". ئەوانە پێناسەی داوەکانی تەرکیزن، چونکە ئەوانە بەهۆی ڕیکلامەوە پاڵپشتی داراییان بۆ کراوە. بۆ تۆ خۆبەخشانە و بە پێی خۆت دەچیتە ناو ئەو داوەوە؟

سێیەم: خۆت لە هەموو شتێکی "مەلتی میدیا-Multimedia"[٣٥] بە دوور بگرە. وێنە، وێنەی جوڵاو و- لە داهاتووشدا- لە ڕووی کردارییەوە لەسەر و ئاستی سەلامەتییەوە گوڕێک بە هەستەکانت دەدات، بەشێوەیەکی دیاریکراو چۆنێتی بڕیاردانەکانت خراپتر دەکات. باشترین و سەرنجڕاکێشترین جۆری زانیاری نوسینە، هەر لە دۆکۆمێنتەکان بە کەمترین ئەگەر لە ڕێگەی هایپەرلینکی ئینتەرنێتەوە- بەلام کتێب باشترین شێوازە و نمونەییە.

چوارهەم: ئاگاداری ئەوە بە کە تەرکیز دابەش ناکرێت. وەک کات و پارە نییە. ئەو تەرکیزەی دەیدەیت بەو زنجیرە پۆستەی لەسەر

---

[٣٥] "مەلتی میدیا-Multimedia":

شاشەی مۆبایلەکەت سەرە و خواری پێدەکرێت، هەمان ئەو تەرکیزەیە کە لەو کەسەی دەبەیت کە بەرامبەرتدا دانیشتووە.

پێنجەم: لە پێگەی بەهێزییەوە کار بکە، نەک پێگەی لاوازی. کاتێک خەڵکی بێ ئەوەی داوایان لێبکەیت شت دەهێنن بۆ ئەوەی سەرنجت رابکێشن، ئەوا تۆ بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لە پێگەی لاوازیدایت. بۆچی دەبێت، ڕیکلامکەرێک، ڕۆژنامەنوسێک یاخود هاوڕێیەکی تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک بڕیار بدات کە تۆ تەرکیزت ئاراستەی کوێ دەکەیت؟ ڕیکلامێکی ئۆتۆمۆبێلی پۆرش، یاخود بابەتێکی ڕۆژنامەوانی دەربارەی دواین تویتی دۆناڵد ترەمپ یاخود گرتە ڤیدیۆیی توتەڵە سەگێکی خۆشەویست و پێکەنیناوی ڕەنگە شتێک نەبێت دڵخۆشت بکات یاخود هەنگاوێک بەرەو پێشت ببات. تەنانەت بە بێ هەبوونی هەژماری ئینستاگرامیش فەیلەسوفێکی وەک ئێپیکتێتەس دوو هەزار ساڵ بەر لە ئێستا گەیشتووە بە هەمان خاڵ و دەڵێت" ئەگەر کەسێک جەستەی خۆی بە هەر کەسێکی نامۆ کە لەسەر ڕێگا دەیانبینێت ببەخشێت، تۆ توڕە دەبێت. کەچی ئەی خۆت هەست بە هیچ شەرمەزارییەک ناکەیت کە هۆش و زیهنی خۆت دەدەیت بە هەرکەسێک کە وا ڕێدەکەوێت بە زارەکی هێرشت بکاتە سەر و مێشکت نارۆشن و شڵەژاو بکات؟"

بەداخەوە، مێشکی ئێمە لە ڕوانگەی بیردۆزی پەرەسەندنەوە خۆی ئامادە دەکات بۆ ئەوەی یەکسەر لە یەکەم چرکەی ڕووداوەکەوە کاردانەوەی بۆ ڕووداوەکە هەبێت: جاڵجاڵۆکەیەک لێرەیە، مارێک لەوێیە. ئەم هەستیارییە ڕۆژێک لە ڕۆژان زۆر بۆ مانەوە پێویست بوو، بەڵام ئەمڕۆ دەبێتە هۆی هاندانی بەرگەی فرە جەمسەری

بەشێوەیەکی مۆدێرن لە ئەرکێکی مەزندا دەکات. مامەڵەکردن بەشێوەیەکی تەندروست لەگەڵ میدیای هاوچەرخدا بەهرەیەکی خۆڕسک نییە، شتێکیش نییە تەنها بەهۆی دانیشتن بەدیار ئینتەرنێتەوە فێربییت. هەر لەبەر ئەمە، بەگوێرەی رۆژنامەنوسی بواری تەکنەلۆژیا کێڤن کێلی بۆچی دەبێت بە مەبەست فێر ببین چۆن چارەسەری ئەم بابەتە بکەین. چۆن فێربوویت بخوێنیتەوە و چۆن فێری یاسا سادە و سەرەتاییەکانی بیرکاری وەک، کۆکردنەوە و لێکدان و لێدەرکردن... هتد بوویت؟ بە هاوڕێیەتیکردنی ئەو کەسانەی دەیانتوانی بخوێننەوە و کردارە بیرکارییەکان بکەن؟ نەخێر. چەندین ساڵت بەمەبەست لە پراکتیزەکردنی ئەو بەهرانەدا بەسەر برد. ئێستا بە هەمان شێوە پێویستت بە ڕاهێنانێکی توند هەیە چۆن زانیاری، ئینتەرنێت و هەواڵەکان بەڕێوەببەیت. دەبێت تەرکیزکردن فێربکرێت.

لقێکی تر: تەرکیزکردن و بەختەوەری. تەرکیزکردن چ پەیوەندییەکی بە بەختەوەرییەوە هەیە؟ هەمووشتێک. پاوڵ دۆلان دەنوسێت" بەختەوەریت لە ڕێگەی ئەوەی تۆ چەند تەرکیز و سەرنجدانەکانت تەرخان دەکەیت بۆ هەموو شتێک بڕیاری لێدەدرێت." ڕووداوەکانی ژیانیش بە هەمان شێوەن (چ بە ئەرێنی و چ بە نەرێنی)یانەوە، دەتوانن بەشێوەیەکی بەهێز، لاواز یاخود بەهیچ شێوەیەک کاریگەریت لێبکەن= ئەوەش بەندە بەوەی کە تۆ چەند سەرنجی خۆتیان دەدەیتێ. لە بنەڕەتدا، تۆ هەمیشە لەو شوێنە دەژیت کە تەرکیزەکانتی بۆ ئاراستە کراوە، جا گرنگ نییە گەردەکانی جەستەت لەکوێن. هەموو چرکەساتێک تەنها یەک جار دێت. ئەگەر تۆ بەمەبەست زیاتر تەرکیز

بخەیتە سەر سەرنجەکانت، ئەوا زیاترت لە ژیان دەست دەکەوێت. کاتێک دێتە سەر ئەوەی زانیارییەک وەربگریتە ناو مێشکتەوە وریا و توند و بەئاگا بە، هیچ کەمتر وریا و توند و بەئاگا نا لەوەی کە خواردن و دەرمان دەخۆیت.

٣٦

کەمتر بخوێنەرەوە، بەڵام دوو جار- بە باوەڕەوە بخوێنەرەوە.

## ئێمە بە هەڵە دەخوێنینەوە

بلیتی گەشتی جیاواز لە وێستگەی شەمەندەفەری سویسرا تەنها بەشی شەش مۆر شوێنی هەیە. پێش هەر گەشتێک بلیتەکە دەبەیتە بەر ئامێرێکی پرتەقاڵی کە ئەویش لە ڕێگەی مۆرکردنی کات و بەروار و بڕینی تۆزێکی بچووک لە لێواری لای چەپ دەیسەلمێنێت. هەر کە بلیتەکە گەیشتە شەش مۆر، ئیتر ئەو بلیتە بێکەڵک دەبێت.

وایدابنێ کتێب خوێندنەوە بلیتێکە و پەنجا بۆشایی لەسەرە. سیستەمەکەشی بە پێچەوانەوە هەمان شتە: پێش ئەوەی کتێبێک بخوێنیتەوە، دەبێت بلیتەکەت مۆر بکەیت. کەچی بەپێچەوانەی بلیتی شەمەندەفەرەکەوە، ئەمە تاکە بلیتە کە تا کۆتایی تەمەنت دەتبێت. ناتوانیت دانەیەکی نوێ بکڕیت. هەر ئەوەندە کە بلیتەکە زیاد لە پێویست بەکارهێنرا، ناتوانیت هیچ کتێبێکی نوێ بکەیتەوە- هیچ کرێدانێکی بەپەلە پرۆزەش ڕێگە پێدراو نییە. پەنجا کتێب بەدرێژایی

ژیانت؟ بە لای زۆربەی خەڵکەوە ئەمە بابەتێک نییە، بەڵام بۆ تۆ وەک خوێنەری ئەم کتێبە ئەمە بیرۆکەیەکی تۆقێنەرە. قەرارە چۆن بە شێوازێکی نیمچە شارستانی بەم ژمارە کتێبە کەمەوە گوزەر بکەیت؟

کتێبخانە کەسییەکەی خۆم پێکدێت لە سێ هەزار کتێبت-ی نزیکەی یەک لەسەر سێیانم خوێندۆتەوە، یەک لەسەر سێی دیکەش چاوێکم پێداخشاندوون، یەک لەسەر سێشیانم نەخوێندۆتەوە. ناوە ناوە هەندێک کتێبی نوێیان بۆ زیاد دەکەم، ساڵانەش دەستێکیان پێدا دەهێنم و کۆنەکان لە کۆڵ خۆم دەکەمەوە. سێ هەزار کتێب بە بەراورد بە کتێبخانەکەی ئەمبێرتۆ ئیکۆ- کە سی هەزار کتێبی تێدایە- کتێبخانەیەکی خاکەڕایانەیە. کەچی هەندێک جار کاتێک ناوەڕۆکەکەیان بیر خۆم دەهێنمەوە سەرم گێژ دەخوات. کاتێک چاو بە بەرگی کتێبەکاندا دەگێڕم، خەیاڵم پڕ دەبێت لە وردە پڕزۆڵی یادەوەری تێکەڵ لەگەڵ هەستی نارۆشن و تروسکەی ناوبەناوی بارودۆخێکی دیاریکراو. هەندێک جار ڕستەیەک بە مێشکمدا، وەک ئەوەی بەلەمێکی سەوڵدار لە تەمێکی بێدەنگدا بەجێهێڵدرابێت، بەو چەشنە گوزەر دەکات. بەدەگمەن تێیاندایە پوختەیەکی باشیانم بیرمابێت. کۆمەڵێک کتێبیشیان هەن تەنانەت دڵنیا نیم لەوەی خوێندومنەتەوە یاخو نا، دەبێت بیانکەمەوە و سەیری لاپەڕەیەکی نوشتاوە یاخود چەند تێبینییەک بکەم لە بەشی خوارەوەی لاپەڕەکاندا. لەو کاتانەدا، نازانم چ شتێک زۆر شەرمهێنترە، ئەو یادەوەرییە خراپەی من یاخود کاریگەری ئەو هەموو کتێبەی کە وا

دەردەکەوێت زۆر بێبایەخ بن، هەرچەندە بۆ دڵدانەوەی خۆم بۆم دەردەکەوێت کە چەندین هاوڕێم هەمان ئەزموونیان هەبووە. بەڵام لە لای من ئەوە تەنها بەسەر کتێبدا نایەت، بەڵکو بەسەر پەخشان، بابەتی ڕۆژنامەوانی، لێکدانەوە و هەموو جۆرە تێکستێکدا دێت کە خوێندومنەتەوە و چێژم لێوەرگرتوون. بەشێکی زۆر کەمیان لە یادەوەریمدا ماونەتەوە. بەداخەوە کەمێکیان.

کەواتە سوودی خوێندنەوەی کتێبێک چییە کە ناوەڕۆکەکەی بەشێکی زۆری لە یادگەتدا فەوتاون؟ لە کاتی خوێندنەوەی بابەتەکاندا هەستم بە هەمان ئەزموون کرد، بەدڵنیاییەوە ئەمە گومانی تێدا نییە. بەڵام ئەوە بۆ هەستکردن بە خواردنی کرێمی برولی[٣٦] وایە، تۆش پێشبینی ئەوە ناکەیت لە شێوەی کەسەکەدا کە هەڵیبقوڕێنێت. بۆچی ئێمە کەمێک لەوە هەڵدەگرین و لامان دەمێننەوە کە دەیانخوێنینەوە؟

ئێمە بە هەڵە دەخوێنینەوە. ئێمە نەبەشێوەیەکی تەواو بژاردە دەخوێنینەوە نە بە سەرنجێکی ورد و دیقەتەوە دەخوێنینەوە. ئێمە بەشێوەیەک بە سەرنج و تەرکیزمان دەڕوانین هەر وەک ئەوەی پەتی ملی سەگێک بێت و خۆشحاڵ بین بەوەی لێی دەبێتەوە و بەو ناوەدا دەگەڕێت، لە جیاتی ئەوەی بەرەو کولانە چاکەکەی خۆی ئاراستەی بکەین. ئێمە بەنرخترین سەرچاوەکانمان لە شتێکدا سەرف دەکەین کە شایستەی نین.

ئەمڕۆ بەشێوەیەکی جیاواز وەک لە چەند ساڵێکی لەمەو پێش

---

٣٦- کرێمی برولێ: پێشژەمێکی ساردە و لە کرێم دروستکراوە، شەکری سوتاویش بە بەشی سەرەوەیەتی.

دەخوێنمەوە. هەر وەک ئەو کات دەخوێنمەوە، بەڵام کتێبی کەمتر، وەلێ باشتر دەخوێنمەوە، دووجاریش دەیانخوێنمەوە. بەشێوەیەکی توند دەست بە هەڵبژاردنی کتێبەکانەوە دەگرم.بە لای منەوە ئەو پەڕی کتێبێک دە خولەکی دەوێت تا هەڵیدەبژێرم، دواتر بڕیاری خۆمی لێدەدەم- ئاخۆ بیخوێنمەوە یان نەیخوێنمەوە. میتافۆری بلیتە هەمەگەشتییەکە یارمەتیم دەدات بۆ ئەوەی زیاتر توند ببم. ئایا ئەو کتێبەی هەڵمگرتووە و بە دەستمەوەیە ئەو کتێبەیە کە بە نیازم بۆشاییەکی سەر بلیتەکەمی بۆ بکەمە قوربانی؟ کەمێکیان بەڵێ. ئەوانەی کە پارچەیەک لە بلیتەکەم دەبڕن بە ئاراستەی سەرکەوت دوو جار دەیانخوێنمەوە. بە باوەڕەوە. کتێبێک دووجار بخوێنینەوە؟ بۆ نا؟ لە مۆسیقادا وا ڕاهاتووین کە زیاد لە جارێک گوێ لە گۆرانییەک بگرین. ئەگەر ئامێرێکی مۆسیقیش بژەنیت، ئەوا بۆت دەردەکەوێت لە یەکەم هەوڵدا ناتوانیت پلەیەکی بەرز بەدەستبهێنیت لە بەشێوەیەکی باش ژەنینیدا. پێش ئەوەی پەلە بکەیت و بچیتە سەر بەشێکی دیکە ئەوا پێویستی بە چەندین ڕاهێنانی پڕ لە وردی و دیقەت هەیە. ئەی بۆچی هەمان شت بۆ کتێب ڕاست نەبێت؟

کاریگەری خوێندنەوەی کتێبێک دوو جار کاریگەری دوو هێندەی خوێندنەوەی کتێبێک نییە یەک جار. زۆر گەورەترە- من بە ئەزموونی خۆمدا بڕیاردەدەم، من لە هۆکارەکاندا دەیکەم بە دە هێندە. من ئەگەر سەدا سێی کتیب یکم دوای یەک جار خوێندنەوە لە لا بمێنێتەوە، ئەوا دوای دووەم جار خوێندنەوە ڕێژەکە بەرز دەبێتەوە بۆ سەدا سی.

من بەردەوام سەرم سوڕماوە لەوەی کە دەتوانیت چەند لەو کتێبە لە کاتی خاو خوێندنەوەدا، تەرکیزکردن لە کاتی خوێندنەوەدا، لە هەوڵی دووەمدا چەند شتی نوێت بۆ دەردەکەوێت، لەم ڕوانگە پێوراوەوە بەشێوەیەکی چەند مەزن تێگەیشتنت قوڵ دەبێت. کاتێک فیۆدۆر دۆستۆڤسکی- ڕۆماننوسی گەورەی ڕووسی- ڕۆمانی جەستەی مەسیحییە مردووەکە لە گۆڕدا، ی لە نوسنی هۆلبین لە شاری بەیسڵ لە ساڵی ١٨٦٧ خوێندەوە، ئەو وێنەیەی کە دەبوو ژنەکەی بیکێشێت بۆ ئەوەی کاتژمێرێک دواتر بیکێشێت بۆ ئەوەی دووری بخاتەوە تەواوی زیهن و خەیاڵی دۆستۆڤسکی داگیرکرد. دوو ساڵ دواتر، توانی بەشێوەیەکی نیمچە فۆتۆگرافەری بە ورد و درشتییەوە لە ڕۆمانی "گەمژە"دا وەسف بکات. ئایا وێنەیەکی شاشەی ئایفۆنەکەت هەمان کاریگەری هەیە؟ بە ئاستەم. ڕۆماننوسە گەورەکە پێویستی بەوەبوو کە خۆی لە ناو وێنەکەدا نوقم بکات بۆ ئەوەی بتوانێت سودێکی بەرهەمهێنەرانە بەکاری بهێنێت. "خۆنقومکردن" وشەیەکی گرنگە لێرەدا. خۆ نقومکردن، پێچەوانەی ڕوکەشبوونە.

با ئەم بابەتە پوختتر بکەین. یەک: ئاستی کاریگەرییەکە- ئەمە هەندێک تەکنیکی دیارە. ئایا تۆ دەتوانیت ئەو جۆرە بڕیارە لە بارەی کتێبەکانەوە بدەیت؟ بەڵێ، ئەم جۆرە خوێندنەوەیە بەرەو ئاراستەی سوود بەکارهێنانە و ڕۆمانتیکیش نییە. ڕۆمانتیسیزم بۆ چالاکییەکانی دیکە بەجێبهێڵە. ئەگەر کتێبێک هیچ شوێنپێیەکی لە مێشکتدا نەبوو ئەوە لەبەر ئەوەیە کە یان ئەو کتێبە کتێبێکی خراپە،

یاخود تۆ بە خراپی خوێندووتەتەوە، من بەوە دەڵێم بە هەدەردانی کات. کتێب شتێکە لە ڕووی چۆنێتییەوە جیاوازە لە کرێم برولێ، گەشتێکی ئاسمانی بەسەر زنجیرە چیاکانا ئاڵپ دا، یاخود سێکس.

دوو: ڕۆمانەکانی بواری تاوانکاری یاخود ڕۆمانە هەستبزوێن و سیخوڕییەکان لە سیستەمی ئەم بلیتە بەدەرن، چونکە جگە لە هەندێک نمونەی کەمی ئاوارتە و جیاواز نەبێت، ئەوا ناتوانیت دوو جار بیانخوێنیتەوە. کێ دەیەوێت دووبارە بکوژێک بناسێنێتەوە؟

سێ: ئەوە تۆیت کە بڕیار دەدەیت بلیتی خوێندنەوە کەسییەکەت دەبێت چەند بۆشایی هەبێت. من سنوری بۆشایی ئەوەی خۆمم بۆ سەد کتێب بۆ دە ساڵی داهاتوو کەم کردۆتەوە. بە تێکڕا دەکاتە دە کتێب بۆ ساڵێک- هێندە کەمن ئەوە تاوانە بۆ نوسەرێک. بەڵێ، هەر وەک گووتم، من ئەم کتێبانە دوو جار یاخود سێ جار بە چێژێکی مەزن و دە جار هێندە کاریگەرییەوە دەخوێنمەوە.

چوارەم: ئەگەر هێشتا گەنجیت، لە سێیەکی ژیانی چالاکی خوێندنەوەت دا بە خۆت بڵێ کە دەبێت چەند بۆم دەکرێت کتێب دەماشمەوە- ڕۆمان، کورتە چیرۆک، شیعر، کتێبی نا خەیاڵی و لە هەموو بوارەکاندا. سەرتی تێبنێ. هیچ گرنگی بە چۆنێتی مەدە. ئەوەندەی دەتوانیت بخوێنەرەوە. بۆ؟ وەڵامەکە پەیوەندی بە جۆرێک سودلێوەرگرتنی بیرکارییانەوە هەیە کە پێیدەگووترێت -کێشەی سکرتێر-ەوە (سەیری بەشی ٤٨ بکە). لە هاوکێشە کلاسیکییەکەدا، واتە تۆ هەوڵدەدەیت باشترین سکرتێر بۆ کۆمەڵەی داواکارەکانت هەڵبژێریت. چارەسەر ئەوەیە کە بەشێکی

بنچینەیی لە ڕێگەی چاوپێکەوتنەوە دابمەزرێنیت و سەدا سی و حەوتی یەکەمی داواکارییەکانیشت ڕەت بکەیتەوە. لە ڕێگەی – یاخود بە زاراوەیەکی ئاماری- بە وەرگرتنی نموونەی تێکەڵ لە سێیەکی یەکەمی ژیانی خوێندنەوەت، ئەوا تۆ وێنەیەکی نمونەیی لە خۆرئاوابوونە ئەدەبییەکەوە بەدەستدەهێنیت. خۆشت هێزی بڕیاردانت تیژ دەبێتەوە، کە دواتر واتلیدەکات تۆش هێزی بڕیاردانت تیژ ببێت، ئەمەش واتلیدەکات دواتر بەشێوەیەکی توند هەڵبژێر بیت. کەواتە دەست بە مۆردان لە بلیتی خوێندنەوەکەت مەکە تا نەگەیتە تەمەنی سی ساڵی، بەڵام دوای ئەوە دڵڕەق بە. هەر ئەوەندە گەیشتیتە تەمەنی سی ساڵی، ئەوا ژیان لەوە کورتترە کتێبی خراپ بخوێنیتەوە.

## ٣٧

## داوی دۆگما[٣٧]

# بۆچی ئایدیۆلۆجیستەکان[٣٨] شتەکان زۆر سادە دەکەنەوە؟

زنجیری پانتۆڵ، پاڵتۆ...هتد چۆن کار دەکات؟ ڕێژەی تێگەیشتنت لەم بابەتە لەسەر هێڵێک کە لە (٠ واتە هەڕی لە بڕی ناکەم)دەوە دەستپێدەکات تا (١٠ واتە وەک ئاوخواردنەوە وایـە). ژمارەکان بنوسە. ئێستا لەسەر پارچە کاغەزێک شێوازی کارکردنی زنجیرەکە بکێشە. وەسفێکی کورتیشی بۆ زیاد بکە، وەک ئەوەی هەوڵبدەیت زۆر بە وردی بۆ کەسێکی ڕوون بکەیتەوە کە هەرگیز پێشتر زنجیرە نەبینیبێت؟ چەند خولەکێک بۆ خۆت دابنێ. تەواو بوویت؟ ئێستا دوای ئەوەی دووبارە بیرتلێکردەوە تێگەیشتنت لە زنجیرەکان

---

[٣٧]دۆگما: باوەڕێک یاخود کۆمەڵە باوەڕێکە کە کۆمەڵەیەک یاخود ڕێکخراوێک هەڵگرین, کە هەڵگرانی چاوەڕێ دەکەن کەسانی دیکە بێ چەند و چوون هەمان بۆچوونی ئەوان قبوڵ بکەن.

[٣٨]- ئایدیۆلۆجیست: کەسێکە باوەڕی بە ئایدۆلۆجیایەک یاخود فکرەیەک هەیە و کار و کردەوە و قسەکانی بە گوێرەی ئەو بیرو باوەڕەیە.

لەسەر هەمان هێڵ دابنێ.

لیۆنید ڕۆزنبلیت و فرانک کێیل، کە لێکۆڵەرن لە زانکۆی یالی، پرسیارێکی هەمان شێوە ئاسانیان ڕووبەڕووی نزیکەی سەد کەس کردەوە. تەوالێت چۆن کار دەکات؟ پاترییەک چۆن کار دەکات؟ ئەنجامەکان هەمیشە بە هەمان شێوە بوون: پێمانوایە بەشێوەیەکی پێویست و ئەقڵانی باش لەم بابەتانە تێدەگەین، تا ئەو کاتەی ناچارین ڕوونیان بکەینەوە. تەنها ئەو کاتە ستایشی ئەوە دەکەین کە چەند بۆشایی لە زانیارییەکانماندا هەیە. ڕەنگە تۆش بە هەمان شێوە بیت. تۆ باوەڕت وابوو زۆر زیاتر لەوەی لە ڕاستیدا تێگەیشتوویت، تێگەیشتبوویت. ئەوە -وەهمی زانیاری-ە.

ئەگەر لەم ئامێرە سادانەی وەک زنجیری پانتۆڵ و تەوالێتدا تێبکەوین و سەرمان لێبشێوێت، بەس بیهێنەرە بەر چاوی خۆت کاتێک دێتە سەر پرسیارە گەورەکان دەبێت چەند بێئاگا و نەزاز بین. ئەو پرسیارانەی وەک: ئایا بە شێوەیەکی ماوە درێژ چەند کۆچکرن بۆ کۆمەڵگە باشە؟ یاخود: ئایا دەبێت چارەسەری جینەکان ڕێگەیان پێبدرێت؟ یاخود: ئایا بوونی چەکی تایبەت لە لایەن تاکەوە کۆمەڵگا سەلامەتتر دەکات؟

تەنانەت لەگەڵ ئەم پرسیارە قورسانەشدا- بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش و بەتایبەت لەگەڵ ئەم پرسیارە قورسانەدا- وەڵامەکان وەک چۆن گوللە لە دەمانچەیەکەوە دەردەپەڕێت دەمانبێژن. بەلام با ڕاستگۆ بین: ئێمە بیرمان لێنەکردوونەتەوە. تەنانەت بە ئاستێکی ڕووکەشیش. بابەتە کۆمەلایەتییەکان زۆر لە زنجیری پانتول،

تەوالێت و پاتری ئالۆزترن. بۆ؟ چونکە هەر دەستوەردانێک لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەرئەنجامگەلێکی هەیە کە بەتەواوی زۆر لە بەردانەوەی ئاوی تەوالێت دەستپێڕانەگەیشتووترە. لەبەرچاوگرتنی یەکەم شەپۆلی کاریگەرییەکان بەس نییە. دەبێت حسابێک بۆ کاریگەری کاریگەرییەکان بکەیت. بیرکردنەوە لە زنجیرەی کاردانەوەکان، چەند ڕۆژ، هەفتە، بگرە مانگیشی دەوێت، ئینجا کێ کات و وزەی ئەوەی هەیە؟

کەواتە ئێمە کورتەیەکی ئیسراحەت وەردەگرین. لەم خاڵەدا شتێکی نامۆ ڕوودەدات: لە جیاتی خوێندنەوەی کتێب لەم بوارەدا و ڕاوێژکردن بە کەسانی خاوەن ئەزموون، ئەوا ئێمە سووک و ئاسان بیر و بۆچوونی ئەو کەسانە هەڵدەگرین کە لە ئێمە باڵاترن. ئینجا ئەمە ڕەنگە پارتێکی سیاسی، پرۆفیسۆرێک، گرووپێکی کۆمەڵایەتی، یانەیەکی وەرزشی یاخود کۆمەڵێک شەلاتی سەر شەقام بێت. هەر لەبەر ئەوە بیروبۆچوونەکانمان زۆر کەمتر بابەتین وەک لەوەی حەز دەکەین باوەڕمان پێیبێت، بە سەرچاوەگرتنمان بەشێوەیەکی سەرەکی بەهۆی "کۆمەڵەی زانیاری"یەوەیە، هەر وەک ستیڤن سلۆمان و فیلیپ فیرنباخ لە کتێبەکەیاندا بە ناوی –وەهمی زانیاری- یەوە ناوزەندی دەکەن. بەداخەوە ئێمە ئەو بیرکەرەوە سەربەخۆیە نین کە حەز دەکەین وێنای بکەین هەین. لە جیاتی ئەوە ئێمە وەک جلوبەرگەکانمان مامەڵە لەگەڵ بیر و بۆچوونەکانمان دەکەین. ئێمە ئەوانە لەبەردەکەین کە باون- یان با زۆر دەقیقتر بڵێین ئەوەی کە لە نێوان ئەو کەسانەی لای ئێمە باڵان باوە.

کاتێک ئەم حەزە لە سەرو بابەتە کەسییەکان و تا ئاستی میلی پارتە سیاسییەکان بڵاودەبێتەوە دەست بە بونیادنانی تەواوی دونیابینی ئێمە دەکات، ئەمە دەتوانێت کارەسات بخولقێنێت. ئەمە دروست ئەو کاتەیە کە ئێمە دەست بە قسەکردن لە بارەی ئایدیۆلۆجییەوە دەکەین. کەسە ئایدیۆلۆجییەکان ئەو کەسانەن چەند میلێکی گروپ و کۆمەڵە و پارتەکانن کە تا هێز و ئاستی ژمارە (١٠)ی، سەر هێڵەکە بەرزبوونەتەوە، بە کۆمەڵێک بیر و بۆچوونی ئامادەکرا و لە کارتۆن نراوەوە دێنە مەیدان.

کەسە ئایدیۆلۆجییەکان تا ئاستێکی بەرز مەترسیدارن. کاریگەرییەکی لەسەر مێشکمان وەک تەوژمێکی کارەبایی ڤۆڵتی بەرز وایە، دەبێتە هۆی ڕیزێک بڕیاری هەڵەشە، دەبێتە هۆی قرچەقرچکردنی هەموو جۆرە فیوزێک. بۆ نموونە وەک ئەوە وایە، کاتێک کوڕە گەنجە ئەوروپییەکان کە زانکۆیان خوێندووە کە سوێند بۆ داعش دەخۆن و لە پێناو ئەوەدا دەجەنگن کە فێرکارییەکانی سەردەمەکانی ناوەڕاستی ئیسلام بناسێننەوە.

بە هەموو شێوەیەک خۆت لە دۆگما و ئایدیۆلۆجی بوون بپارێزە- بەتایبەتی ئەگەر دڵت بۆیان لێدەدات. ئایدیۆلۆجیستەکان گەرەنتی هەڵەبوونیان دەکرێت. ئەوان دونیابینیت بچووک دەکەنەوە و دنەدنەت دەدەن بۆ ئەوەی بڕیاری مەترسیدار بدەیت. من یەک تاکە کەسی خاوەن مێشکی دۆگما ناناسم کە دوور نزیک هیچ شتێکی هەبێت پەیوەندی بە -ژیانێکی باش-ەوە هەبێت.

تا ئێستا بابەتەکە زۆر ڕوونە. کێشەکە ئەوەیە کە زۆربەی کەس

سەرنجی ئەوە نادەن کە کەوتوونەتە ناو گێژاوی ء ئایدۆلۆجییەوە.

چۆن کەسێکی ئایدیۆلۆجی دەناسیتەوە؟ ئەمە سێ ئالای سوورە بۆ ناسینەوەیان : أ) هەموو شتێک ڕوون دەکەنەوە. ب) بە درۆ ناخرێنەوە. ج) ئەوان تێگەیشتنیان ئاسان نییە.

نموونەیەکی نایاب بۆ ئایدیۆلۆجییەکی بەدرۆنەخراوە کە هەموو شتێک ڕووندەکاتەوە -مارکسیزم-ە. ئەگەر کۆبوونەوەی سەرمایە زیاد بکات، مارکسیستە دڵسۆزەکە یەکسەر دەیداتە پاڵ بنچینە شەڕەنگێز و خراپەکانی سەرمایەداری- هەر وەک ئەوەی مارکس باسی کردووە. ئەگەر نا یەکسانی کەم ببێتەوە، ئەوان وەک گەشەکردنی مێژوو بەرەو کۆمەڵگەیەکی دوور لە چینایەتی ئاماژەی بۆ دەکەن- هەر وەک مارکس پێشبینی کردووە.

هەر لە یەکەم سەیرکردنەوە، ئەم بەدرۆنەخستنەوەیە وەک سوودێک دەردەکەوێت. کێ نایەوێت بیردۆزێکی لەبەر دەستدا بێت ئەوەندە بەهێز بێت بە جۆرێک پێتبڵێت کە تۆ هەمیشە لەسەر حەقیت؟ لە واقیعدا، ئەم بیردۆزە بەدرۆنەخراوانە هەموو شتێکن، جگە لە پێکهاتەیەکی بەهێز- لە ڕاستیدا، ئەوان زۆر بە ئاسانی خۆیان دەردەخەن. هەر کاتێک کەسێکت بینی نیشانەیەکی توشبوونی بە دۆگما نیشاندا، ئەم پرسیارەیان لێبکە" پێم بڵێ بە دروستی پێویست بە چ ڕاستی و حەقیقەتێکە پێت بڵێم بۆ ئەوەی دەست لەم دونیابینییەت هەڵبگریت." ئەگەر وەڵامێکیان نەبوو، ئەوا خۆتیان لێ بە دوور بگرە. ئەگەر گومانت کرد لە ناوچەی دوگماییدا زۆر ڕۆیشتوویت، دەبێت بۆ ئەو بابەتە هەمان پرسیاریش لە خۆت بکەیت.

بۆ ئەوەی تا بۆیان دەکرێت خۆیان لە هێرش و پەلامار بە دور بگرن، زۆر جار ئایدیۆلۆژیاکان، خۆیان لە پشت چرە دوکەڵێکی ڕێونکەردا حەشار دەدەن. ئەمە سێیەم ئالای سووورە کە لە ڕێگەیەوە دەتوانیت ئایدیۆلۆژیایەک بناسیتەوە. ئەمە نموونەیەکە: پیاوێکی ئایینی زمانپاراو و تەواو ڕوونی وەک هانس کونگ بەم شێوەیە وەسفی خودا دەکات"بوونی ڕەها، ڕۆژی پەسلانی بێگومان، دەسەلاتی ڕەها و هەمیشە ئامادەبوو، دڵهەژێنی هەمووان و لە ئامێزگیراوی هەمووان، حەقیقەتترین حەقیقەت لە دڵی هەموو شتەکان و مرۆڤ و مێژووی مرۆڤ و دونیادا بوونی هەیە." جوان جوان خۆی ڕوونکردۆتەوە، بەدرۆشناخرێتەوە و بە شێوەیەکی زمانپاراویش لێڵی تێدایە!

ئەم جۆرە زمانە بەدڵنیاییەوە نیشانەیەکی وڕێنەی ئایدیۆلۆجییە. وریای ئەوەبە- تەنانەت لە قسەکانی خۆشتدا. هەوڵبدە لە دەربڕینی شتەکاندا وشەی خۆت بدۆزیتەوە. هەر بێئاگایانە وێنە و هاوکێشەی ئەو کۆمەڵەیەی لە تۆ بالاترن بەکارمەهێنەرەوە. نموونەیەک: باسی "خەڵک"ی، مەکە کاتێک پارتەکەی تۆ مەبەستی تەنها یەک گروپی کۆمەلایەتی تایبەتە. واز لە دروشم بهێنە.

بە تایبەتی وریابە کاتێک بۆ خەڵکی و بە گشتی قسە دەکەیت. بەرگریکردن لە پێگەیەکی دۆگمایی لە شوێنێکی گشتیدا وا نیشاندراوە کە تەنانەت قوڵتر لە مێشکتدا ڕەگ دابکوتێت. لە ڕووی کردارییەوە هەر لە کۆڵت نابێتەوە.

دەست بە گەڕان بکە بۆ ئەو بەڵگانەی لە دژتن. تەنانەت دەتوانیت

ئەوە بکەیت کە لە (بەشی ٣٠)دا، پێشنیارم کرد و وای بهێنیتە بەر چاوی خۆت لە بەرنامەیەکی مشتومڕی تەلەفزیۆنیدایت لەگەڵ پێنج میوانی دیکەدا، کە هەموویان بیروباوەڕێکیان هەیە پێچەوانەی ئەوەی تۆیە. تەنها کاتێک دەتوانیت بەرپەرچی تێڕوانینەکەیان بدەیتەوە لانیکەم بەڕادەیەک زمانپاراو بیت وەک ئەوەی خۆت دەتەوێت کە بەڕاستی خۆت ئەو بیر و بۆچوونانەت بەدەستهێنابێت و گەڵاڵە کردبێت.

بە کورتی و بە پوختی: سەربەخۆیانە بیر بکەرەوە، زۆر دڵسۆزی هێڵی بیرکردنەوەی هێڵی پارتەکەت مەبە، لە سەرو هەموو شتێکیشەوە خۆت لە خاوەن بیرە دۆگماکان بە دوور بگرە. تا خێراتر لەوە تێبگەیت کە لە دونیا تێناگەیت، باشتر لە دونیا تێناگەیت.

٣٨

## لێدەرکردنی مێشکی

## چۆن بزانیت دڵخۆشیت؟

لە ئێوارەی کریسمس دا لە شارۆچکەیەکی بچووکی ئەمریکا، بە ناوی بێدفۆرد فۆڵس، جۆرج بەیلی خەریکی ئەوەیە خۆی بکوژێت. جۆرج بەیلی سەرۆکی دامەزراوەیەکی قەرز و پارە هەڵگرتنی بچووکە، پیاوێکی ڕاستگۆ و بە ئەخلاقە، ژنێک و چوار منداڵی هەیە، لەبەر ئەوەی مامی هەموو پارەکەی لە قوماردا بە هەدەر داوە توشی مایە پووچی بووە. لەسەر پردێک وەستاوە خەریکە خۆی هەڵدەداتە ڕووبارەکەوە. دروست لەو چرکەساتە هەستیارەدا، پیاوێکی پیر دەکەوێتە ئاوەکەوە و هاواری یارمەتی دەکات. بەیلی ڕزگاری دەکات و پێیدەڵێت کە ئەو فریشتەیە. بەشێوەیەکی سروشتی بەیلی باوەڕی پێناکات. لە جیاتی ئەوە خۆزگە دەخوازێت هەر لە دایکنەبووایە. فریشتەیەک خۆزگەکەی بۆ بەدیدەهێنێت و شارۆچکەی بێدفۆرد فۆڵس-ی گۆڕی بەو شوێنە دڵتەنگەی ئەگەر جۆرج بەیلی هەر بوونی نەبووایە وا دەبوو. کاتێک خەبەری دەبێتەوە و هەر

ئێوارەکەی -کریسمس-ە، جۆرح بەیلی لە خەمۆکییەکەی ڕزگاری بووە. زۆر شادومانە کە هێشتا زیندووە، بە شەقامە سەرەکییەکەی ئەو شارۆچکە بە بەفر داپۆشراوەدا سەر بەرەو خوار ڕادەکات هاوار دەکات"ساڵی نوێتان پیرۆز بێت! ساڵی نوێتان پیرۆز بێت!"

ڕۆمانێکی تراژیدی کۆمیدییە و ناوی –ژیانێکی نایابە- لە ساڵی ١٩٤٦ دا بڵاوبووەتەوە و بووە هۆی درەوشانەوەی نوسەرەکەی- جەیمس ستوارت- لەو کاتەوە بوو بە کریسمسی کلاسیکی. لە بواری دەروونناسیدا ئەوە بە لێدەرکردنی مێشکی ناسراوە، بەدڵنیاییشەوە دەبێت لە سندوقی کەلوپەلەکانی -ژیانێکی باش-ت دا هەبێت. با خێرا فرێک تێیدا بڕۆین. سەرەتا، وەڵامی پرسیارێکم بدەرەوە"بەشێوەیەکی گشتی چەند لە ژیانتدا دڵخۆشیت؟" لەسەر هێڵێک دایبنێ کە لە ژمارە (٠ واتە بەشێوەیەکی قوڵ دڵتەنگم) تا ژمارە (١٠ واتە زۆر دڵخۆشم)، ژمارەکانیش لە چوارچێوەی ئەم لاپەڕەیەدا بنووسە. ئێستا پەرەگرافی دواتر بنوسە(بەڵام زۆر مەڕۆ). دواتر چاوەکانت دابخە و دوای ئەم ڕێنماییانە بکەوە ئێستا دەیانخوێنیتەوە.

چاوەکانت دابخە. بیهێنەرە بەر چاوی خۆت کە قۆڵی ڕاستت لە دەستداوە. جگە لە بنکی قۆڵت هیچی پێوە نەماوە. چۆن هەستێکە؟ ژیانت بە یەک تاکە دەستەوە چەند قورسترە؟ ئەی بۆ خواردن چی دەکەیت؟ تایپکردن؟ ئەی پاسکیل لێخوڕین چی؟ لە باوەشکردنی کەسێک چی؟ ئێستا بیهێنەرە بەر چاوی خۆت کە قۆڵی چەپیشت لە دەستداوە. هیچ دەستت نییە. نە هەڵگرتنی هیچ شتێک دەمێنێت، نە

دەستلێدان، نە دەست پێداهێنان. چۆن هەستێکە؟ لە کۆتاییدا وێنای ئەوە بکە کە بیناییشت لە دەستداوە. هێشتا دەتوانیت ببیستیت، بەڵام هەرگیز دیمەنی خۆرئاوابوونێکی کەنار دەریا نابینیت، هەرگیز ڕووخساری هاوسەرەکەت، منداڵەکانت، هاوڕێکانت نابینیتەوە. باشە، ئێستا چاوەکانت بکەرەوە. لانیکەم دوو خولەک بوەستە بۆ ئەوەی هەر سێ بارودۆخەکە لێکبدەیتەوە- بۆ ئەوەی "هەست" یان، پێبکەیتەوە- پێش ئەوەی لە خوێندنەوە بەردەوام بیت.

دوای ڕاهێنانەکە، ئێستا چەند لە ژیانتدا دڵخۆشیت؟ لەسەر هێڵێک دایبنێ کە لە ژمارە (٠ واتە بەشێوەیەکی قوڵ دڵتەنگم) تا ژمارە (١٠ واتە زۆر دڵخۆشم). ئەگەر تۆش وەک زۆربەی خەڵکی بیت، ئەوا پێزانینت بەرامبەر بە بەختەوەری تا کەشکەشانی فەلەک بڵند بووە. کاتێک بۆ یەکەمجار ئەم ڕاهێنانەم کرد، هەستم دەکرد تۆپێکم و خراومەتە ژێر ئاوەوە و کەسێک ئێستا ڕزگاری کردووم- منیش وەک کانی بەرەو سەر تەقیم. ئەمە کاریگەری جوڵەیی -لێدەرکردنی مێشکی-یە.

بەدڵنیاییەوە پێویست ناکات وای دەربخەیت کە دەست و قاچت لە دەستداوە بۆ ئەوەی هەستکردنت بە باشی بفڕێت بۆ ئاسمان. تەنها بیر لەوە بکەرەوە چ هەستێکت دەبوو ئەگەر هەرگیز هاوسەرەکەتت نەبینیایە، یاخود ئەگەر منداڵەکانت لە ڕووداوێکدا لە دەست بدایە، یاخود لە سەنگەرێکی جەنگدا بوەستایتایە یان لەسەر چرپای مەرگ بوویتایە. گرنگە تەنها بیر لە لێدەرکردنەکە نەکەیتەوە، بەڵکو لە ڕاستیدا هەستی پێبکەیت. سوپاسگوزاری، (هەر وەک لە بەشی ٧

دا بینیمان) هەستێکی زۆر تەواوە کە بە هەموو ڕێکەوتەکانی ژیانمان بەخشراوە- بە تایبەتیش بەخشراوە بەو ڕێکەوتە بەختدارانەی کە وای لە ژیانمان کرد هەر لە یەکەم شوێنەوە ڕێیتێبچێت. بە دەگمەن یەک تاقە کتێبی یارمەتیدەری خودی هەیە کە خوێنەرەکانی هان نەدات بۆ ئەوەی هەموو شەوێک بیر لە شتە ئەرێنییەکانی ژیانیان نەکەنەوە و هەست بە سووپاسگوزاری نەکەن.

بەڵام سووپاسگوزاری دوو کێشەی هەیە. یەکەم، سووپاسی کێ دەکەیت؟ ئەگەر کەسێکی ئاییندار نیت، ئەوا هیچ کەسێک نییە سووپاسگوزاری بیت. دووەم، خووەکان. مێشکی مرۆڤ بە توندی کاردانەوەی بۆ گۆڕانکارییەکان دەبێت، بەخێرایی خۆی لەگەڵ بارودۆخەکاندا دەگونجێنێت. کاتێک کارەساتەکان دەقەومێن ئەمە یەکێکە لە سوودەکانی- خەم و خەفەتی ئێمە کاتێک بەجێدەهێڵرێین، کاتێک لەسەر کورسییەکی پێچکەدار دوای ڕووداو و کارەساتێک گیر دەخۆین زۆر لەوە خێراتر بیرمات دەچنەوە کە بیریان لێدەکەینەوە، سووپاس بۆ خووەکان. دان گیلبێرت بەمە دەڵێت سیستەمی بەرگری دەرونی. بەداخەوە، کاریگەرییەکانی سیستەمی بەرگری دەرونی تەنها بۆ کارەساتەکان سنووردار نەکراونەتەوە. بۆ نموونە تەنها شەش مانگ دوای ئەوەی ملیۆنان دۆلار لە یانسیبێکدا دەبەینەوە، کاریگەری دڵخۆشییەکەمان لە ناو دەچێت. ئەمە بۆ لەدایکبوونی منداڵە نوێیەکانمان یاخود کڕینی خانوویەکی نوێ هەر هەمان شتە. لەبەر ئەوەی نەوەد و نۆ لە سەدی لایەنە ئەرێنییەکانی ژیانمان هەر ئەمڕۆ قووتنەبوونەتەوە، بەڵکو بەهۆی

ڕەستان و چاوەڕێکردنێکی دوور و درێژەوەیە، هێزی
هیچ کاریگەرییەکی ئەو خۆشییەی ئێمە لە بنەڕەتەوە لە بارەیانەوە هەستمان پێکردووە نەیهێشتووە. سووپاسگوزاری هەوڵێکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ جەنگان دژ بەم پرۆسەیە لە ڕێگەی بەمەبەست ناونان و جەختکردنە سەر شتە ئەرێنییانەی مەیلی چوون بەرەو لایانمان هەیە. هەرچەندە بەداخەوە، بەم تاکتیکەش ڕادێین. ئەو کەسانەی هەموو ئێوارەیەک لیستی پشکنینی "سووپاسگوزاری" مێشکییان سەیر دەکەن بە بەراورد بەو کەسانەی کەمتر بەو شێوە زۆرە لیستەکەیان دەپشکنن کاریگەرییەکەی لەسەر باشبوونیان کەمترە. دەرەنجامێکی پێچەوانەیە- ئەمە کەسێکە ئەوەی ڕوونکردەوە لە ڕێگەی یەکسانکردنی هێزی خووەکانەوە.

پرسی ئەوەی سووپاسی کێ بکەین، لەگەڵ بابەتی ڕاهاتندا، لایەنی خراپی – پراکتیزەکردنی ئەو سووپاسگوزارییەیە کە زۆر کەشوفشی پێوە دەکەن-. ئێستا هەواڵە خۆشەکە: لێدەرکردنی مێشکی هیچ لەم زیانانە لەگەڵ خۆی ناهێنێت. ئەوە جوڵەیەکی هێندە پێشبینی نەکراوە کە مێشکت هەرگیز کە دێت نایبینێت. لە چەندین لێکۆڵینەوەدا، دان گیلبەرت، تیمۆسی ویلسن و لێکۆڵەرەوەکانی هاوڕێیان ئەوەیان دەرخستووە کە لێدەرکردنی مێشکی زۆر زیاتر لەوەی تەنها جەخت بخەیتە سەر لایەنە ئەرێنییەکانی ژیان بەشێوەیەکی دیار و گرنگ ڕێژەی بەختەوەری زیاد دەکات. ستۆیکس دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا ئەمەی دەرخستووە: لە جیاتی بیرکردنەوە لە هەموو ئەو شتانەی هێشتا نیتن، ئەوا ڕەچاوی ئەوە بکە کە ئەگەر ئەو شتانەی

هەتن چیتر هی تۆ نەبوونایە چەند غەریبیت دەکردن؟
وادابنێ تۆ وەرزشکارێکیت و بەشداری لە یارییەکانی ئۆلۆمپادا دەکەیت. تۆ لە بارودۆخێکی لوتکەدایت، تەنانەت مەدالیایەکیشت بردووەتەوە. کامەیان زیاتر دڵخۆشت دەکات زیو یاخود برۆنز؟ لە وەڵامدا دەڵێیت کە بە دڵنیاییەوە زیو. کەچی لە ڕاپرسییەکدا لە نێوان ئەو کەسانەی مەدالیایان لە یارییەکانی ئۆلۆمپیادی ساڵی ١٩٩٢ لە شاری بەرشەلۆنە بەدەستهێنابوو ئەوەیان ئاشکرا کرد کە ئەوانەی مەدالیای زیویان بەدەستهێنابوو کەمتر دڵخۆشبوون وەک لەوەی مەدالیای برۆنزیان بەدەستهێنابوو. بۆ؟ چونکە ئەوانەی مەدالیای زیویان بەدەستهێنابوو خۆیان بەوانە بەراورد دەکرد کە مەدالیای ئاڵتوونیان بەدەستهێنابوو، ئەمە لە کاتێکدا ئەوانەی مەدالیای برۆنزیان بەدەستهێنا بوو خۆیان بە دووەمەکان بەراورد دەکرد. لێدەرکردنی مێشکی دەبێتە هۆی ڕێگری لەم کاریگەرییە زیانبەخشە. لە ڕێگەی -لێدەرکردنی مێشکی-یەوە، تۆ هەمیشە خۆت بەو کەسانە بەراورد دەکەیت کە مەدالیایان بەدەست نەهێناوە- بەدڵنیاییشەوە دەتوانیت "ئەوانەی مەدالیایان بەدەستنەهێناوە" بگۆڕیت بە هەر شتێک کە حەزت لێیەتی.
بە کورتی و بە پوختی، لێدەرکردنی مێشکی ڕێگایەکی کاریگەرە بۆ ئەوەی فێڵ لە مێشکت بکەیت بۆ ئەوەی بەهای لایەنە ئەرێنییەکانی ژیانت بەرزتر بنرخێنیت. چونکە دڵخۆشت دەکات، هەروەها دەبێتە یارمەتیدەری -ژیانێکی باش-یش.

پاوڵ دۆلان دەنوسێت" هەندێک جار بەختەوەری ئێمە زۆر بەرچاو نین. پێویستە ئەوەی لە دەستمان دێت بۆ ئەوەی زیاتری بکەین. بیهێنەرە بەرچاوی خۆت کە پیانۆ دەژەنیت و ناتوانیت بیبستیت کە دەنگەکەی چۆنە. زۆربەی چالاکییەکانی ژیان وەک پیانۆ ژەنینەکە وان کە تۆ گوێت لێیان نییە." لە ڕێگەی- لێدەرکردنی مێشکی-یەوە، لە کۆتاییدا ئەزموونی دەنگی قوڵی مۆسیقای ڕاستەقینە دەکەیت.

## ٣٩

## کرۆکی ئەوپەڕی ورد لێبیرکردنەوە

## بیرکردنەوە بە بەراورد بە کردار، وەک لایتی دەستی بە بەراورد بە بلاجکتۆری یاریگا گەورەکانە.

وسسسس! وا خەریکم گەورەترین نهێنی نوسینت پێدەڵێم: باشترین بیرۆکەکان کاتێک بۆت دێن کە دەنوسیت، نەک کاتێک هەر دەیانهێنیت و دەیانبەیت. تەنانەت ئەگەر نوسەریش نیت، ئەم تێڕوانینە ڕەنگە بەسوودی خۆی بسەلمێنێت، چونکە ئەمە بۆ هەموو بواری چالاکییەکانی مرۆڤ ڕاستە. وەبەرهێنێک نازانێت ئاخۆ بەرهەمێک سەرکەوتووە یاخود نا تا ئەو کاتەی بەرهەمی دەهێنێت و دەیخاتە بازاڕەوە- جا گرنگ نییە چەند لێکۆڵینەوەی بە کڕیارانەوە کردووە. فرۆشیارێک گەشە بە تەکنیکی زمانلوسی وا دەدات یەکسەر بەرهەمەکەی بفرۆشرێت ئەمەش لە ڕێگەی چەندین پوختەکردنی بێئەندازە و ئەزموونکردنی چەندین ڕەتکردنەوەی دۆستانە- نەک لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی فرۆشتنی دەستییەوە. دایک و باوکەکان لە ڕێگەی مامەڵەکردنی ڕۆژانەوە لەگەڵ منداڵەکانی

خۆیاندا لە منداڵ بەخێوکردندا لێهاتوو دەبن، نەک بە خوێندنەوەی کتێبەکانی دەستیان. مۆسیقاژەنەکانیش لە ڕێگەی پراکتیزەکردنەوە دەگەنە پلەیەکی باڵا، نەوەک لە ڕێگەی مشتومڕکردن لە بارەی لایەنە شاراوەکانی ئامێرە مۆسیقییەکانیان.

ئەمە بۆ دەبێت وا بێت؟ لەبەر ئەوەی دونیا بە لای ئێمەوە لێڵە، ڕوون نییە، بەڵکو وەک شووشە زوقمگرتووەکان، تەماوییە. واقیع هەرگیز بە تەواوی ڕوون نابێتەوە، تەنانەت پسپۆڕترینیشمان لە ئاراستەیەکی دیاریکراوەوە تەنها دەتوانێت چەند مەترێکی کەم ببینێت. ئەگەر دەمانەوێت بڕۆین بۆ ئەودیو سنوری زانیارییەکانمان، ئەوا لە جیاتی ئەوەی دەست لە ئەژنۆ لێی دابنیشین، دەبێت ئەوپەڕی هەوڵی خۆمان بخەینە کار، دەبێت کار بکەین، نەک هەر پێوەی بتلێینەوە.

هاوڕێیەکم هەیە، پیاوێکی ڕۆشنبیرە و بڕوانامەی ماستەری لە کارگێڕی بازرگانیدا هەیە-بەڵام با ئەوە لە دژی بەکارنەهێنین- پیشەیەکی باشی لە بەڕێوەبردنی ناوخۆیی کۆمپانیایەکی دەرماندا هەیە، کە دە ساڵی لە بەهێزکردن و تۆکمەکردنی کۆمپانیاکەیدا بەسەربردووە. سەدان کتێبی لە بواری وەبەرهێناندا ماشیوەتەوە، هەزاران کاتژمێری بە لێکدانەوە و هێنان و بردنی پێشکەشکردنی بەرهەمەکانی و لێکۆڵینەوەی ورد و درشتی ئەو توێژینەوانەی لە بارەی پشکەکانی بازاڕەوە کراون و نوسینی دوو دەرزەن پلانی بازرگانی بەڕێکردووە. دەرئەنجام؟ تا ئێستا، هیچ شتێک. هەمیشە دەکاتە خاڵێک کە ورد بیرلێکردنەوەکەی پێیدەڵێت: بیرۆکەکەت

چەندین بەڵێنی تێدایە، بەڵام زۆربەی زۆری بەندە بەوەی چەند باش جێبەجێی دەکەیت و پێشبڕکێکارەکانت چۆن مامەڵە دەکەن. هیچ بڕێکیش لە بیرلێکردنەوەکانی یەک میلیمەتر نەیانبردە ئەودیو ئەم خاڵەوە. ئەمە ئەو چرکەساتەیە کە بڕێک لەم زانیارییە زیادانە لە ڕێگەی بیرلێکردنەوە و دابەزاندنی بۆ خاڵی سفر دەتوانرێت کۆبکرێنەوە. ئەمە ئەو خاڵەیە کە حەز دەکەم پێیبڵێم کرۆکی ئەوپەڕی ورد لێبیرکردنەوە.

بابەتەکە هەر ئەوەندە نییە کە من هەموو جۆرە دژایەتی و بەرهەڵستییەکم بۆ ورد بیرلێکردنەوە و هێنان و بردن هەیە! بەڵکو تەنانەت ئەو ماوە کورتانەشی لە والاوردکردنی بیرۆکەیەکدا بەسەر دەبرێت کە دەتوانێت تێگەیشتن و دونیابینی گەورە دروست بکات. کەچی ئەم پڕۆسەیە لە ئەنجامدا بەخێرایی دەرەنجامێکی وێرانکەر دەدات، ئەوەش جێگای سەرسوڕمانە کە چەند بە خێرایی دەگەیتە کرۆکی ئەوپەڕی ورد لێبیرکردنەوە. بڕیارەکانی وەبەرهێنان بە نموونە وەربگرە، هەر ئەوەندە فاکت و پێداویستییەکانت بەردەستەکانت لەسەر مێز بوون، ئەوپەڕی سێ ڕۆژت پێویستە بۆ بیر لێکردنەوە و مشتومڕکردن لە بارەیەوە. ئەی بڕیارەکانی ژیانی تایبەتی خۆت چی؟ ڕەنگە هەفتەیەکی بوێت. گۆڕانی پیشەکەت چی؟ ئەوپەڕەکەی پێنج ڕۆژ. ڕەنگە کاتێکی زیادە بە خۆت ببەخشیت بۆ ئەوەی نەوەک جۆلانەکردنی باری دەروونی و میزاجت کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر بڕیارەکەت هەبێت. بەڵام دوای ئەوە، چونکە خەڵوەتەوە ناتگەیەنێت بە هیچ هەنگاوێک پێشتر- ئەگەر زانیاری نوێت دەوێت،

دەبێت کار بکەیت و بجوڵێیت.

بەراوردکردنی ورد بیرکردنەوە لە شتەکان بێکەم و زیاد وەک بەراوردکردنی لایتی دەستی و بلاجکتۆری یاریگا گەورەکانی یاری تۆپی پێ وایە. کە تیشکی ڕووناکییەکەی زۆر زیاتر لەم دونیا نارۆشنەی لیێتیناگەین دەبڕێت و دەڕوات. هەر ئەوەندەشی گەیشتیتە شوێنێکی نوێ و سەرنجڕاکێش هەمیشە دەتوانیت لایتە دەستییەکەت بکوژێنیتەوە.

ئەم پرسیارەی دواتر وێنەی گرنگی بیرکردنەوە لە پرۆژەیەکی بازرگانی دەخاتە ڕوو. تۆ کامەیان هەڵدەبژێریت، درێـژەدان بە کۆمپانیایەک لە بیاباندا یاخود لە ناوەڕاستی زەریادا؟ پێش ئەوەی لە خوێندنەوە بەردەوام بیت، تاوێک بوەستە و بیری لێبکەرەوە. هاوسـەرەکـەت؟ خۆشەویستەکەت؟ ڕاوێـژکـارێـک؟ زیرەکترین پرۆفیسۆر کە دەیناسیت؟ یاخود گاڵتەجاڕێک؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر! بەڵکو تۆ کەسێکی شـارەزا لە دروستکردنی بەلەم و کەشتیدا هەڵدەبژێریت.

خـاوەن بـیـردۆزەکـان، پـرۆفـیـسـۆرەکان، ڕاوێـژکـارەکـان، نوسەرەکان، خاوەن ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت حەز دەکەن وێنای ئەوە بکەن کە دونیا لە ڕێگەی قوڵ بیرلێکردنەوەوە خۆی بۆیان ئاشکرا دەکات. بەداخەوە ئەم حاڵەتە بەدەگمەن ڕوو دەدات. بیرمەندەکانی وەک نیوتن، ئەنشتاین، فینمان ئاوارتە و جیاوازن. بەنزیکەیی هەموو پرۆسەکان بەرەو تێگەیشتنێکی گەورەتر- جا لە بواری زانست، ئابووری و ژیانی ڕۆژانەدا بووبێت- لە ڕێگەی کاردانەوە ماددی و

بەرجەستەیی لەگەڵ دونیای نەبینراودا بەدەستهاتووە.

ئەمە بە قسە ئاسانە و هەموو کەس پێیدەوێرێت. تەنانەت من مەیلی ئەوە دەکەم بیرێکی زۆر زیاتر لە شتەکان بکەمەوە، زۆر باشتر کرۆکی ئەوپەڕی ورد لێبیرکردنەوە ببڕن. بۆ؟ چونکە ئەوە زۆر ئاسوودەترە. چونکە زۆر خۆشترە والاوردی هەموو شتەکان بکەیت، وەک لەوەی تەنها دەست بە خاڵە دەستپێکەکانەوە بگریت. خەملاندن ئاسانترە وەک لە درک پێکردن. ئەگەر هێشتا هەر خەریکی هێنان و بردنی بژاردەکانتیت، ئەوا ئەگەری شکستت سفرە، هەر ئەوەندە هەنگاوێکت نا، ئەو قوربانییە هەر لە سفر زیاترە. هەر لەبەر ئەوەیە بیروڕا و سەرنجەکان زۆر باون. ئەگەر هەر سووک و ئاسان بیر لە شتێک دەکەیتەوە، ئەوا هەرگیز لوتت بە لووتی واقیعدا ناتەقێت، ئەمەش واتا هەرگیز شکست ناهێنیت. کارێک بکە و بجوڵێ، هەرچەندە شکستی لە ناکاو ئەگەری گەڕانەوە و ڕوودانی هەیە، بەڵام تۆ ئەزموونی نوێ بەدەست دەهێنیت. وەک ئەو وتە باوەی هەیە دەڵێت" ئەزموون لەوەوە دەستت دەکەوێت کاتێک ئەوەی ویستت بەدەستت نەهێنا."

پابلۆ پیکاسۆ زانی چەند بەهادارە بەرامبەر تاقیکردنەوە و ئەزموونەکان ئازا بیت، بۆیە دەڵێت" بۆ ئەوەی بزانیت دەتەوێت وێنەی چی بکێشیت، دەبێت دەست بە وێنەکێشان بکەیت." لەگەڵ ژیانیشدا دروست هەمان شت ڕاستە. بۆ ئەوەی بزانیت چیت دەوێت، باشترین شت ئەوەیە تەنها دەست بە شتێکی نوێ بکەیت. ئەم بەشە ڕەنگە بەرەو ئاراستەیەکی دروست تێتەوە بژەنێت، بەڵام وریابە: بە

بیرکردنەوە لێی هەرگیز ژیانێکی باش نادۆزیتەوە.
دەروونناسەکان بەمە دەڵێن وەهمی لێکۆڵینەوەی ورد: ئەو بیرۆکە بە هەڵە وەرگیراوەی کە دەڵێت بیرلێکردنەوەی قوڵ بە تەنها خۆی دەتوانێت ڕێگەمان ڕۆشن بکات بۆ ئەوەی ئارەزووی ڕاستەقینە، مەبەستمان لە ژیاندا، کرۆکی ئاڵتوونی بەختەوەری کەسیمان بناسین. هەر بۆیە خودپرسی زیاتر ئەگەری ئەوەی هەیە لە پاڵنەر و سۆزی جیاواز و بیرۆکەی لێڵ و مەزاجیدا بتچەقێنێت.

بۆیە بۆ جاری داهاتوو کاتێک خەریکبوو بڕیارێکی گرنگ بدەیت، بە وردی بیری لێبکەرەوە- بەڵام تەنها تا ئاستی کرۆکی ئەوپەڕی ورد لێبیرکردنەوە. سەرت دەسوڕمێت لەوەی چەند خێرا دەیگەیتێ. هەر ئەوەندەی گەیشتیتە ئەوێ، لایتە دەستییەکەت بکوژێنەرەوە و بلاجکتۆرەکانت هەڵبکە. لە شوێنی کارکردندا ئەوەندە بەسوودە وەک ئەوە وایە لە ماڵەوە بیت، جا ئەوە لە پیشەکەتدا وەبەرهێنانی تێدا بکەیت یاخود لە ژیانی خۆشەویستیتدا.

## ٤٠
# شوێنی کەسانی دیکە گۆڕینەوەی ئەرکەکان

بۆن هۆرۆویتز بازرگان و یاریدەدەری دامەزرێنەری کۆمپانیای ئۆپسوێ و ئێستاش سەرمایەدارێکی سەرکێشە، چەند ساڵێک لەمەو بەر سەیری خۆی کرد ڕووبەڕووی کێشەی بەڕێوبردن بووەتەوە. دوو بەشی دیار کە لە کۆمپانیاکەدا بەڕێوەی دەبردن- پاڵپشتی کڕیاران و ئەندازیاری فرۆشیاری-هەردووکیان لە تەنگژەیەکی گەورەدا بوون. ئەندازیاری فرۆشتن پاڵپشتی کڕیارانی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە تەواو وەک پێویست وەڵامی کڕیارانی نەدەدایەوە و ئەوەش ببووە هۆی ڕێگریکردن لەبەردەم فرۆشتندا. پاڵپشتی کڕیاران ئەندازیاری فرۆشیاری بەوە تۆمار دەکرد کە یاسای پڕ لە هەڵە و پەڵەی بۆ داناون و پێشنیارەکانی ئەوانی بۆ بەرەوپێشچوون پشتگوێخستووە. ڕوون و ئاشکرا دیاربوو کە هەر دوو بەشەکە لە بنەڕەتەوە بەشێوەیەکی نزیک کاریان پێکەوە دەکرد. ئەگەر بە جیا سەیریان بکەین، هەردووکیان بەشێوەیەکی باش بەڕێوەدەبران و

بەشێوەیەکی نایاب ستافیان بۆ داندرابوو. داوایان لێکرا هەوڵبدەن بۆ کەمێک تەواوکردنی کارەکان لە تێڕوانینی یەکترەوە شتەکان ببینن. بەڵام دواتر هۆرۆویتز بیرۆکەیەکی هەبوو. سەرۆکی بەشی پاڵپشتی کڕیاران ـــی کرد بە سەرۆکی - ئەندازیاری فرۆشیاری و بە پێچەوانەشەوە. بۆ ماوەیەکی کاتیش نا، جا بزانە، بەڵکو بۆ هەمیشەیی. هەردووکیان لە بنەڕەتەوە تۆقین، بەڵام هەفتەیەک دوای ئەوەی چوونە جێگەی ڕکابەرەکەیان، ئەوا دەبوو تا بنی بنی کێشە و قەیرانەکان بڕۆن. لە ماوەی هەفتەکانی دواتردا کاروبارەکانیان تەواو ڕێکخست و توندوتۆڵ کرد، ئیتر لەو کاتە بەدواوە ئەو دوو بەشە لە هەر بەشێکی دیکەی کۆمپانیاکە زیاتر هەماهەنگی یەکتریان دەکرد.

بیر لەوە بکەیتەوە کە خۆت بخەیتە پێگەی کەسی بەرامبەرت زۆر جار بە کەڵک نایات. ئەوەش لەبەر ئەوەی گۆڕانکارییە مێشکییە پێویستەکە زۆر گەورەیە و هۆکاری پاڵنەریش کەمە. بۆ ئەوەی لە بنەڕەتەوە لەکەسێک تێبگەیت، ئەوا دەبێت خۆت بخەیتە شوێنی ئەو کەسە، نەک تەنها لە ڕووی فکری و زهنییەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی کرداری و واقعی. دەبێت خۆت بخەیتە شوێنی نەیارەکەت و بە دەستی یەک ئەزموونی بارودۆخەکەی بکەیت.

من هەرگیز کاری دایکانم بە جیددی وەرنەگرتبوو تا خۆمان منداڵمان بوو، ناوبەناویش خۆم ئاگام لە منداڵە ساواکانمان-کە دوانەش بوون- دەبوو. دوای تاقیێک لە دە ڕۆژ گەشتی بازرگانی شەکەت و ماندووتر بووم. بەدڵنیاییەوە، چەندین دایک پێشتر

ئەوەیان پێگووتبووم، هەروەها لە چەندین کتێبی بێشومار لە بارەی دایک و باوکایەتییەوە ئەوانە باس کراوە. کەچی هەموو ئەوانەم بە ساردوسڕی وەرگرتبوو. تەنها بە کردنی توانیم دەست بە تێگەیشتن بکەم لێی.

بەڕاستی مایەی سەرسامییە کە چەند بە دەگمەن ئێمە ئەم فێڵە سادەیە بەکاردەهێنین. "دەبێت شتەکان لە تێڕوانینی کڕیارەوە ببینین." ئەمە وتەیەکی بەناوبانگە لە ڕاگەیاندنی هەموو ئەرکێکی هەماهەنگدا. ئەمە بیرۆکەیەکی نایابە، بەڵام بە تەنها بەس نییە. لە ڕاستیدا دەبێت" خۆمان دەبێت ببین بە کڕیار." چەندین کۆمپانیا هەن کە لەمە تێگەیشتوون. شیندلەر بەڕێوەری نێودەوڵەتی کۆمپانیایەکی دابینکردنی ئۆتۆمۆبێلی بەرزکەرەوە و ئەسکەلەیە. لە یەکەم ساڵی کارکردنیاندا، هەموو کارمەندەکانی شیندلەر - هەر لە سکرتێرەوە تا بەڕێوبەری نوسینگەی جێبەجێکردن- دەبوو سێ هەفتە لەسەر شوێنی کارکردن بەسەرببەن. جا کارمەندەکە چ کچ بێت یان چ کوڕ دەبێت بە جلی کارکردنەوە هەڵبگەڕێت و یارمەتی لە دامەزراندن و چەسپاندی ئۆتۆمۆبێلی بەرزکەرەوە و ئەسکەلەکاندا بدات. بەم شێوەیە کەسانی نەشارەزا نەک تەنها فێردەبن کە دیوی ناوەوەی ژیانی بەرهەمەکانیان چەند ئاڵۆزە، بەڵکو ئەزموونی ئەوەش دەکەن کە کارکردن لە شوێنی کار چۆنە. هەر بۆیە قسەیەک لەم بارەیەوە هەیە دەڵێت"سەیرکە، من لە پیسکردنی دەستەکانمدا زۆر باش نیم." ئەمە بە تەنیا دەبێتە هۆی نیازپاکییەکی قوڵ لە نێوان تاکەکانی بەشەکاندا.

کۆمپانیاکان حەزیان لێیە وایدەربخەن کە ئەوان پەیوەندییان لەگەڵ هێزی کاردا هەیە. خۆت دەزانیت مەبەستم چییە: بە دەگمەن دەبینیت ڕاپۆرتی کۆمپانیایەک بڵاوبکرێتەوە و بە بێ ئەوەی وێنەی خانمێک یاخود پیاوێکی بە ویقار و چاکەت و پانتۆڵ لەبەر لە بەشی بەڕێوەبردنی باڵاوە لە ڕیزی پێشەوەی بەشی بەرهەمهێناندا نەوەستابێت. تەنها یەک لە سەدی ڕاپۆرتەکان وێنەی بەڕێوبەری باڵای تێدایە کە لەسەر زەوی کارگەکە کار بکات و جل و بەرگ و کڵاوی کارکردنی پۆشیبێت. هەر بە ڕوون و ئاشکرا دیارە کە ئەوان لە شێواندنی قژیشیاندا بۆ تەنها یەک وێنەی فۆتۆگرافەری زۆر باش نین. ئەوانە ئەو کۆمپانیایانەن کە من مەیلی ئەوەم هەیە پشکەکانیان بکڕم.

بیرکردنەوە و کارکردن دوو ڕێگای جیاواز و بنچینەیین بۆ تێگەیشتن لە دونیا، وەلێ هەرچەندە زۆربەی خەڵکی ئەم دووانە تێکەڵ دەکەن. ئەگەر دەتەوێت بڕوانامەیەک لە خوێندن لە بواری لێکۆڵینەوەی بازرگانیدا بەدەستبهێنیت، ئەوا لێکۆڵینەوە بازرگانییەکان بڕوانامەیەکی نمونەییە، بەڵام نەک ئەوەی بتەوێت لە بازرگانیدا کار بکەیت. ئەگەر دەتەوێت ببیت بە پرۆفیسۆر لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ئەوا خوێندنی ئەدەب زۆر بێکێشە و گرێیە، بەڵام نەکەیت خەیاڵپڵاوی ئەوە بکەیت کە دەتکات بە نوسەرێکی باش.

ئایا کاتێک دێتە سەر بابەتە بەرچاوەکانی وەک ئەخلاق و ڕەوشت ئایا هەر بیرکردنەوە نییە لانیکەم دەبێت بەکردار؟ ئێریک شویتزگبێل و جۆشوا ڕەست بە وردی لەم پرسەیان کۆڵیوەتەوە.

ئایا پرۆفیسۆرەکانی بواری ئیتیک -ئەخلاقناسی- کە ڕۆژ تا ئێوارە سەروکاریان لەگەڵ پرسە ئەخلاقییەکاندا هەیە، کەسانی باشترن؟ خەملاندنێکی عەقڵانی دەردەکەوێت. لێکۆڵەرەکان پرۆفیسۆرەکانی بواری ئەخلاقناسییان لەگەڵ پرۆفیسۆرەکانی حەڤدە بوار مامەڵەی جیاوازدا بەراورد کرد، جا هەر لە خوێنبەخشینەوە بیگرە، بۆ ئەوەی دەرگا توند دەدەن بە یەکدا، تا ئەوەی لە دوای کۆنفرانسێک شوێنی خۆیان پاک دەکەنەوە. دەرەنجام؟ فەیلەسوفەکانی بوار ئەخلاق هیچ ئەخلاقیانەتر لە هیچ کەسێکی دیکە مامەڵەیان نەدەکرد.

هەر ئەوەندەی ئەوەت قبوڵکرد کە بیرکردنەوە و کارکردن دوو شتی جودان، دەتوانین ئەم زانیارییە بۆ سودێکی باش بەکاربهێنیت. کەنیسە و سوپا و زانکۆکان لە جێگیرترین ڕێکخراوەکانی دونیان. حەوت سەدەیە هەر ماون و لە چەندین جەنگیش ڕزگاریان بووە. نهێنی پشت ئەم جێگیرییەیان چییە؟ ئەوان لە ناخەوە باوەڕیان بە کارەکەیان هەیە. هەموو ئاستێک لە بەڕێوەبردندا خاوەنی زانیارییەکی کرداری و هۆگربووانەیە کە لە بارەی ئەوەیە لەژێر ئەو ئاستەوە هەست بە چی دەکەیت. بۆ ئەوەی ببیت بە بیشۆپ[٣٩] دەبێت لە خواری خوارەوە لە قەشەیەتییەوە دەستپێبکەیت. هەموو جەنەڕاڵێک ڕۆژێک لە ڕۆژان سەرباز بووە. هەرگیزیش نابیت بە سەرۆکی زانکۆ ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان یارمەتیدەری پرۆفیسۆرێکی خواری خوارەوە نەبوویت. ئایا پێتوایە کەسێکی بەڕێوبەری نوسینگەی

---

٣٩- بیشۆپ: قەشەیەکی باڵایە بەرپرسی کارەکانی کەنیسەی شارێک یاخود شارۆچکەیەکە.

جێبەجێکردنی وەک والمارت-پیاوێکە کە ئێستا دوو ملیۆن کارمەند بەڕێوە دەبات- دەتوانێت ببێت بە جەنەڕاڵێکی لێهاتوو فەرمانڕەوایی دوو ملیۆن سەرباز بکات؟ بۆ چەند و چون نەخێر: هیچ سووپایەک لە دونیادا بیر لە خستنە سەرکاری ئەو ناکاتەوە. سەرەنجام؟ بەراستی هەقی خۆیەتی خۆمان بخەینە شوێنی کەسانی دیکە و بە واقیعی سەیرێکی بارودۆخیان بکەین. ئەمە لە گرنگترین پەیوەندی ژیانتدا بکە- هاوسەرەکەت، کارمەندەکانت، کڕیارەکانت، ئەگەر کەسێکی سیاسیت دەنگدەرەکانت. گۆڕینەوەی ئەرکەکان ڕێگایەکی کاریگەرترین، خێراترین بەسوودترین و بێمەسرەفترین ڕێگایە لە بونیادنانی تێگەیشتنێکی هاوبەشدا. ببە بەو پاشایەی لە ناو خەڵکدا باس دەکرێت کە خۆی وەک سواڵکەر گۆڕی بۆ ئەوەی تێکەڵی هاوڵاتیانی خۆی ببێت. لەبەر ئەوەشی ئەمە هەمیشە ڕێی تێناچێت، ئەمە پێشنیارێکی دیکە: ڕۆمان بخوێنەرەوە. ڕۆچوون لە ڕۆمانێکی باشدا، هاوڕێیکردنی قارەمانی ڕۆمانەکە لە سەرکەوتن و کاتە سەختەکانیدا، چارەسەرێکی کاریگەرە کە لە شوێنێکی نێوان بیرکردنەوە و کارکردندا دادەنیشێت.

٤١

# وەهمی گۆڕینی دونیا- بەشی یەکەم
# بە بیردۆزی "پیاوە مەزنەکان" تێمەکەوە

نیلسۆن ماندێلا" ئێمە دەتوانین دونیا بگۆڕین و بیکەین بە شوێنێکی باشتر. دروستکردنی جیاوازی بە دەستی تۆیە." ستیڤ جۆب" ئەو کەسانەی تەواو شێتن و پێیان وایە دەتوانن دونیا بگۆڕن ئەوانەن کە دەیگۆڕن." ئەمانە قسەی بەهێزن. قسەگەلێک وەک چەخماخە و بروسکە بەر زیهن و خەیاڵمان دەکەون. وشەگەلێکم بە جۆرێک لەگەڵ مانا و هیوا و گرنگیدا دەدوێت.

بەڵام هەر بەڕاست دەتوانین دونیا بگۆڕین؟ جگە لە مانای گشتی ڕۆژی زیندووبوونەوە کە ڕۆژنامەکان حەز دەکەن بیوروژێنن(یان ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەبووبێت)، ئەمڕۆ ئەم پەیامانە بەشێوەیەکی ئایینی و خەڵوەتئاسای بە گوێماندا دەدرێنەوە. هەرگیز پێشتر ئەم گەشبینییە لە بارەی کاریگەری تاکەوە هێندە بەربڵاو نەبووە. بە لای خەڵکی سەردەمی چاخەکانی ناوەڕاست، ئەنتیکە کلاسیکییەکان، چاخی بەردین ئەو دوو گووتەیەی سەرەوە ڕەنگە

مایەی تێگەیشتن نەبوو‌بێت بۆیان. بە لای ئەوانەوە دونیا هەر بەو شێوەیە بووە کە هەبووە. کاتێک هەڵچونێک ببوایە، ئەوە لەبەر ئەوە بوو کە پادشاکان ئاگری جەنگیان خۆش دەکرد، یاخود خوداکانیان توڕە دەکرد ئەوانیش بە ناچاری تۆڵەیان دەکردەوە و زەوییان دەلەراندەوە. ئەوەی کە تاکێکی هاوڵاتی، تاکێکی جوتیار، تاکێکی کۆیلە کە ڕەنگە دونیا بگۆڕێت- ئەم بیرۆکە پووچە هەرگیز خۆی بە مێشکیاندا نەکردووە.

هەروەها ئەمە بۆ دانیشتووانی هاوچەرخی ئێستای سەر زەویش نابێت. ئێمە نەک تەنها وەک دانیشتووی سەر زەوی خۆمان دەبینین، بەڵکو خۆمان وەک ئەندازیاریشی دەبینین. ئێمە زۆر خولیای ئەو بیرۆکەیەین کە لە ڕێگەی دروستکردن و خستەسەرپێی کۆمپانیای بچووکەوە و کۆکردنەوەی پارە و پڕۆژەی خێرخوازییەوە هەر وەک چۆن بەشێوەیەکی نایاب و سەرکەوتوو سیلیکۆن ڤالی و داهێنەرە ڕەسەنەکانی مێژووی دونیا پێش ئێمە کردوویانە، ئێمەش دەتوانین دووبارە شێوەیەکی دیکە بە بەری دونیادا بکەینەوە. گۆڕینی ژیانمان ئیدی بەس نییە، دەمانەوێت دونیاش بگۆڕین. ئێمە کار بۆ ئەو ڕێکخراوانە دەکەین کە ئەم ئامانجەیان لە ئەستۆگرتووە- سووپاسگوزارین بۆ هەستکردن بە ئەم "مەبەست"ە-تەنانەت ئامادەین بە نیوەی موچەکەشمان ئەو کارە بکەین.

ئەو بیرۆکەیەی دەڵێت تاکێک دەتوانێت دونیا بگۆڕێت، یەکێکە لە گەورەترین ئایدۆلۆژیاکانی ئەم سەدەیەمان- یەکێکە لە دڵخۆشکەرترین وەهمەکانیش. لەمەدا، دوو بەرەی ئاوەزی تێکەڵ

بوون. یەکێکیان -وەهمی تەرکیزکردن- هەر وەک لە بەشی ۱۱ دا بینیمان دانیاڵ کاهنمان ڕوونیکردەوە" لە ژیاندا هیچ شتێک کاتێک بیری لێدەکەیتەوە ئەوەندە گرنگ نییە کە پێتوایە گرنگە." کاتێک لە ڕێگەی چاویلکەیەکی گەورەکەرەوە لە نەخشەیەک ورد دەبیتەوە، ناوچەکانی سەر نەخشەکە گەورەکراون. سەرنجی ئێمەش ئەرکەکانی خۆی بە هەمان شێوە بەڕێوە دەبات: کاتێک ئێمە سەرقاڵی کەمپینی خۆمانین بۆ گۆڕینی جیهان، گرنگییەکەی زۆر لەوە گەورەتر دەردەکەوێت کە لە ڕاستیدا هەیە. ئێمە بە شێوەیەکی سیستماتیکی زیاد لە پێویست گرنگی پرۆژەکانمان دەخەملێنین.

بەرەی دووەمی ئاوەزی -بیروڕای بەمەبەست-ە، زاراوە لە لایەن فەیلەسوفی ئەمریکییەوە -دانیاڵ دینێت-ەوە ئەم زاراوەیە داتاشراوە. لە ژێر - بیروڕای بەمەبەست -دا، مەزەندەی ئەوە دەکەین لە پشت هەموو گۆڕانکارییەکانەوە مەبەستێک هەیە- بێ گوێدان ئەوەی ئاخۆ ئەم گۆڕانکارییە هەر لە ڕاستیدا بە مەبەست بووە یاخود نا. کەواتە کاتێک پەردەی ئاسن[٤٠] لە ساڵی ۱۹۸۹ دا دەکەوێت، لەبەر ئەوەبوو کە کەسێک یاخود لایەنێک شکستپێهێنان و خستنی هێنابووە بەر باس. کۆتاییهاتن بە سیاسەتی -ئاپارتاید[٤١]-لە

---

٤٠- پەردەی ئاسن: بریتییە لە ناوی ئەو سنورە نا ماددی و نا واقیعییەی لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمەوە لە ساڵی 1945 دا تا کۆتایی جەنگی سارد لە ساڵی 1991 ئەوروپای بۆ دوو بەرە دابەش کردبوو. هاوپەیمانی سەربەخۆی نێودەوڵەتی سەربازی و ئابووری لە هەر یەک لە بەرەکانی پەردەکەدا بەرەوپێشچوونی بەخۆوە دەبینی.

٤١ - ئاپارتاید: ئەو سیاسەتە بوو کە لە دژی ڕەشپێستەکان لە باشووری ئەفریقا پەیڕەو دەکرا, کە تێیدا تەنها سپی پێستەکان تەواوی مافی سیاسی و مافەکانی دیکەیان هەبوو, هەروەها ڕەشپێستەکان زۆریان لێدەکرا بۆ ئەوەی

باشووری ئەفریقا هەرگیز بێ کەسێکی کەمپینگێری وەک نیلسۆن ماندێلا ئەگەری ڕوودانی نەبوو. هندستان بۆ سەربەخۆبوونی پێویستی بە مەهاتما گاندی بوو. مۆبایلە زیرەکەکان پێویستیان بە ستیڤ جۆب بوو. بێ ئۆپینهیمەر هیچ بۆمبێکی ئەتۆمی بوونی نەبوو. بێ ئەلبێرت ئەنشتاین بیردۆزی ڕێژەیی بوونی نەدەبوو. بێ بێنز ئۆتۆمۆبێل بوونی نەدەبوو. بێ تیم بیرنەرس لی هیچ ئینتەرنێتیک - تۆڕی فراوانی جیهانی World Wide web-بوونی نەدەبوو. لە پشت هەر گەشەکردنێکی جیهانییەوە، ئێمە ئارەزوویەکی مرۆیی بۆ دادەنێین.

ئەم دانانی نیازە ڕەگ و ڕیشەی لە ڕابردووە پەرەسەندووەکەماندا داکووتاوە. واباشترە زۆر بخەملێنیت وەک لەوەی کەم بخەملێنیت. وا باشترە ئەگەر گوێت لە خش و هوڕێک بوو لە دەوەنێکدا، وێنای ئەوە بکەیت کە سەرچاوەی دەنگەکە پڵنگێکی برسی کەڵبەدارە یاخود جەنگاوەرێکی دوژمنە وەک لەوەی بڵێیت بایە. بەدڵنیاییەوە کەسانێکی زۆر کەم هەن کە مەزەندەی ئەوە دەکەن ئەوە ڕەشەبا بووە و ئەو وزەی هەڵهاتنەیان لە کۆڵ خۆیان کردووەتەوە- بەڵام زوو بێت یاخود درەنگ لە ناکاو و بە شڵەژاوی لە جینی مرۆڤ دەسڕدرێنەوە. مرۆڤایەتی ئەمڕۆ وەچەی بایەلۆجی ئەو بوونەوەرانەیە کە مرۆڤ لێیانەوە پەرەی سەندووە بە -بیروڕایەکی بەمەبەست-ی، زۆر چالاکەوە. هەر لە کاتی لە دایکبوونمانەوە لە مێشکماندا چەسپێندراوە. هەر لەبەر ئەوەیە

---

لە شوێنێکی دیکە دوور لە سپی پێستەکان بژین و لە قوتابخانەی جیاوازیشدا بخوێنن.

تەنانەت کاتێک بوونیشیان نییە ئێمە هەر نیاز و هۆکارە بەهێزەکان دەبینین. ئەی کەواتە چۆن دەکرا شتێکی وەک هەڵوەشاندنەوەی ئاپارتاید بێ بوونی نیلسۆن ماندێلا ڕوویبدایە؟ چۆن دەکرا جگە لە کەسێکی نمونەیی وەک ستیڤ جۆب بیرۆکەی ئایفۆن بدۆزێتەوە؟

بیروڕای بەمەبەست دەمانگەیەنێت بە لێکدانەوەی مێژووی دونیا وەک مێژووی "مرۆڤە مەزنەکان" (بەداخەوە، ئەوان مرۆڤی باڵا بوون). لە کتێبە نایابەکەیدا، بە ناوی "پەرەسەندنی هەموو شتێک" بیرمەند و زانای بەناوبانگی بەریتانی نات ڕیدڵی بیردۆزەیەکی توند و بەهێز بۆ ڕەتکردنەوەی "مرۆڤی مەزنەکان" دەخاتە ڕوو، ئەویش" ئێمە مەیلی ئەوە دەکەین زۆر ستایشی ئەو شتانە بکەین کە هەر کەسێکی زیرەک لە چرکەساتێکی دروستدا پاڵپشتی بکات و لێی نزیک بێت." فەیلەسوفەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری زۆر لە مێژە بە هەمان دەرەنجام گەیشتوون. مۆنتسکۆ دەنوسێت" مارتن لوسەر بەهۆی -ڕیفۆرمەیشن[٤٢]-ەوە، ستایشکراوە...بەڵام ئەوە هەر دەبوو ڕووبدات. ئەگەر -مارتن لوسەر-یش نەبووایە، کەسێکی دیکە ئەو کارەی هەر دەکرد."

لە دەوروبەری ساڵانی ١٥٠٠ دا، کۆمەڵێک لە داگیرکەرە پورتوگالی و ئیسپانییەکان سەرتاپای ئەمریکای ناوەڕاست و باشوریان داگیرکرد. ئیمپراتۆرەکانی ئەزتێکس، مایا، ئینکاس بە خێراییەکی بەرچاو لە ناوچوون. بۆ؟ نەک لەبەر ئەوەی "مرۆڤە مەزن"ەکانی، وەک کۆرتێس زۆر چاوکراوە و بە بەهرە بوون، بەڵکو

٤٢- ڕیفۆرمەیشن: نوێخوازی.

لەبەر ئەوەی ئەو سەرکێشە ئیهمالانە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن لەگەڵ خۆیاندا لە ئەوروپاوە نەخۆشیان هێناوە- جۆرە نەخۆشییەک کە بەرگرییان لە دژی پەیدا کردووە، بەڵام دواتر سەلما بۆ کەسانی ڕەسەنی ئەو ناوچەیە کوشندە بوو. هەر لەبەر ئەم ڤایرۆس و بەکتریایانەیە ئەمڕۆ نیوەی کیشوەرەکە بە ئیسپانی و پرتوگالی قسە دەکەن، هەر لەبەر ئەوەشە خودایەکی کاسۆلیکی دەپەرستن.

بەڵام ئەگەر ئەو "مرۆڤە مەزن"انەی، چیرۆکی دونیایان نوسی نەبوونایە، کێ دەینووسی؟ وەڵام: هیچ کەس. ڕووداوەکان بە ڕێکەوت بەرهەم و زادەی کۆمەڵێک کاریگەری و خواستی هەلومەرجی نەژمێردراون. ئەمە وەک ترافیک لایت کاری خۆی دەکات، نەک وەک ئۆتۆمۆبێل. هیچ کەسێک ئاراستەی ناکات. مێژووی دونیا لە بنەڕەتەوە بێ بەرنامە و بەختدار و پێشبینینەکراوە. ئەگەر بۆ ماوەیەکی تەواو دوور و درێژ لە بەڵگە مێژووییەکان بکۆڵیتەوە، ئەوا دەگەیت بەوەی هەموو گەشەسەندنە گەورەکان کەمێک بەرکەوتەی ڕێکەوت لە بارەیانەوە هەیە، تەنانەت زاڵترین کەسایەتی مێژووی مرۆڤیش تەنها بوکەڵەیەکی سەردەمەکەی خۆی بووە. کلیلی - ژیانێکی باش- ئەوەیە کە وەک بت "مرۆڤە مەزن"کان، نەپەرستیت و خۆشت وابەستەی ئەو وەهمە نەکەیت کە خۆت دەتوانیت ببیت بە یەکێک لەوان.

٤٢

# وەهمی گۆڕینی دونیا – بەشی دووەم

بۆچی نابێت ئـەوەنـدە کەسێکت خۆشبوێت کـە هەڵەکانی نەبینیت-لانیکەم خۆت؟

لە بەشی پێشوودا ئەوەمان خستەڕوو کە بیردۆزی "مرۆڤە مەزن"ەکان، هەڵەیەکە و هیچی تر. کەچی هەندێک "مرۆڤی مەزن" هەبوون کە ڕەنگە تۆ دژیان بوەستیتەوە، ژمارەیەکی زۆر کەم بوون کە شێوەی تەواوی چارەنوسی دونیای ئێمەیان دیاریکرد!یەکێک لەو نموونانە -دێنگ خیۆپینگ-ە. لە ساڵی ١٩٧٨ دا ئابووری بازاڕی ئازادی بە چین ناساند، ملیۆنان کەسی لە هەژاری و نەداری ڕزگار کرد- سەرکەوتووترین پڕۆژەی گەشەسەندوو بوو کە تا ئێستا هەبووبێت. بە بێ -دێنگ خیۆپینگ- چین ئەمڕۆ نەدەبوو بە یەکێک لە هێزەکانی دونیا.

نـەدەبـوو؟ لێکدانەوەکانی نـوسـەری بەریتانی مـات ڕیدلی وێنەیەکی جیاواز دەخاتە بەر دەستمان. پێشکەشکردنی ئابوورییەکی بازاڕ هەرگیز نیازی -دێنگ خیۆپینگ- نەبوو. ئەوە گەشەسەندنێک

بوو له ژێرەوە. له گوندێکی دووردەست بە ناوی خیاوۆگانگ هەژدە جوتیاری نائومێد بڕیاریاندا سامانی زەوییەکانیان لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن. هەر یەکێکیان ڕێگەیان پێدەدرێت بۆ ئەوەی جوتیاری بۆ خۆی بکات. ئەوان باوەڕیان وابوو تەنها لە ڕێگەی ئەم کردارە نا باوەوە دەیانتوانی زەوییەکانیان ئەوەندە بە بەرهەم بکەن کە خواردنی تەواوی خێزانەکانیان بدات. لە ڕاستیدا، تەنها لە ساڵی یەکەمدا لە تێکڕای بەرهەمی کۆکراوەی پێنج ساڵی ڕابردوو بەرهەمیان هەبوو. ئەم دەغڵ و دانە بەخشندەیە سەرنجی حیزبی دەسەڵاتداری بە لای خۆیدا ڕاکێشا کە ئەویش پێشنیاری بەرفراوانکردنی ئەوتاقیکردنەوەیەی بەسەر کێڵگەکانی دیکەدا کرد. سەرەنجام پێشنیازەکە کەوتە بەردەستی -دێنگ خیۆپینگ- کە بڕیاری دا ڕێگە بدرێت ئەم تاقیکردنەوەیە ڕێچکەی خۆی وەربگرێت. مات ڕیدڵی نوسی کە سەرۆک پارتێکی کەمتر لە -دێنگ خیۆپینگ- ئایین و ئۆین "ڕەنگە ئەم چاکسازییەی دوابخستایە، بەڵام هەر ڕۆژێک دەهات ئەو چاکسازییە بکرایە."

ئاساییە، ڕەنگە تۆ پێتوابێت، کەسانی ئاوارتە و جیاوازیش هەن. بێ گۆتەنبەرگ ئەمڕۆ هیچ کتێبێک بوونی نەدەبوو. بێ تۆماس ئەدیسۆن هیچ گڵۆپێکی ڕووناکی نەدەبوو. بێ برایانی -رایتس-[٤٣] بوو، هیچ گەشتێکی ئاسمانی نەدەبوو.

٤٣- برایانی رایتس: ئۆرڤیلێ ڕایت کە لە (19ی ئابی 1871) لە دایکبووە و (30ی کانوونی دووەمی 1948) کۆچی دوایی کردووە, لەگەل -ویلبەر ڕایت-ی برای کە لە (16ی نیسانی 1867) لە دایکبووە و لە (30ی ئایاری 1912) دا, کۆچی دوایی کردووە. پێکەوە نەخشەسازی, دروستکردن, هەڵفرینی یەکەم

بەڵام تەنانەت ئەوەش ڕاست نییە، چونکە ئەو سێ کەسەش بەرهەمی سەردەمەکەی خۆیان بوون. ئەگەر گۆتەنبەرگ ئەوەی نەدۆزیایەتەوە، ئەوا کەسێکی دیکە گەشەی بە تەکنەلۆجیای چاپکردن هەر دەدا- یاخود درەنگ یان زوو تەکنەلۆجیا ڕێگای خۆی لە چینەوە (کە بۆ زەمەنێکی دوور و درێژ ناسراوە) تا ئەوروپا هەر دەدۆزییەوە. سەبارەت بە گڵۆپی ڕووناکیش هەر ڕاستە: دوای دۆزینەوەی کارەبا، بە پلاکێک داگیرساندنی یەکەم ڕووناکی دەستی تەنها درەنگ و زوو کەوتبوو. تەنها ئەدیسۆن نەبوو کە یەکەم کەس گەیشت بەو دەستکەوتە، بەڵکو بیست و سێ بیرمەندی دیکەش ناسراون کە پێش ئەوەی بمرن وایان لە وایەرەکانیان کردووە بدرەوشێنەوە. مات ڕیدڵی ڕوونیدەکاتەوە" سەرەڕای ئەو هەموو بلیمەتییەی، ئەدیسۆن ناپێویست و بێ ئاتاج بووین لێی. بیهێنەرە بەر چاوی خۆت کە ئێلیشا گرەی⁴⁴

---

بارستە هەوای کۆنترۆڵکراو، کە سەرچاوەی وزەشی پێوەبەسترابوو لە هەوا قورسترو پێیدەگووترا فڕۆکەی هەوایی ئەنجامدا و توانیان لە بەرواری (17ی کانوونی یەکەمی 1903) فڕۆکەکە لە ئاسماندا کار پێبکەن. هەروەها بەوەش ناسراون کە توانیان ڕێگایەک بۆ کۆنترۆڵکردنی فڕۆکە بدۆزنەوە.

٤٤- ئێلیشا گرەی: ئەندازیارێکی کارەبایی ئەمریکییە و لە (2ی ئابی 1835) لە دایکبووە و لە (21ی کانوونی دووەمی 1901) کۆچی دوایی کردووە و یاریدەدەری دامەزرێنەری -کۆمپانیای پیشەسازی کارەبایی ڕۆژئاوایی-بووە. گرەی زیاتر بە گەشەپێدانی جۆری بنچینەیی لە تەلەفۆندا لە ساڵی 1876 لە هایلاند پارک، ئیلینۆیس ناسراوە. هەندێک لەم نوسەرانەی ئەم دواییانە مشتومڕی ئەوە دەکەن کە گرەی دەبێت وەک یەکەم داهێنەری تەلەفۆن بناسرێت و ئەلەکساندەر گراهام بێل بیرۆکەی ئەوەی کە شلەمەنی دەتوانێت وزە بگوازێتەوە بەشێوەیەکی نایاسایی لە -گرەی- وەرگرتووە. وەرگێڕ

ئەلێکساندەر گراهام بێڵ[45] هەمان ڕۆژ ڕێکەوتننامەیەکیان
د ڕێگەی تەلەفۆنەوە بکردایە. بیهێنەرە بەر چاوی خۆت ئەگەر
یەکێکیان لە ڕێگای دا بۆ ئۆفیسی مۆرکردنی ڕێککەوتننامەکە لە
سواری ئەسپەکەی بگلایە، ئەوا مێژوو ئێستاش هەر وەک خۆی
دەبوو." بە هەمان شێوە، برایانی -رایتس- تەنها دەستەیەک بوون
لەو دەستەیەی کۆدەستەیەی لە سەرانسەری دونیادا کۆببوونەوە
بۆ ئەوەی فڕۆکەیەکی چارۆکەدار بە بزوێنەرێکەوە بنێن. ئەگەر
برایانی -ڕایتس-نەبوونایە، ئەوە بەو مانایە نایات کە تۆ دەبوو بە
کەڵەک بۆ -ماڵۆکرا[46]- بپەڕیتەوە. کەسێکی دیکە گەشەی بە گەشتی
ئاسمانی بە ماتۆڕکراو دەدا. لە ڕووی کردارییەوە ئەمە بۆ هەموو
داهێنان و دۆزینەوەکانی دیکەش ڕاستە. مات ڕیدڵی مشوومڕی
ئەوە دەکات کە "تەکنەلۆجیا داهێنەرەکانی خۆی دەدۆزێتەوە، نەک
بە پێچەوانەوە." تەنانەت گەشەسەندنە زانستییە باڵاکانیش لە هەر
کەسێکی دیاریکراو سەربەخۆ و بێمنەتن. هەر ئەوەندەی ئامێرەکانی
پێوانەکردن وردییەکانی خۆیان دۆزییەوە، سەرەنجام داهێنانەکان
بە پێی گونجانی خۆیان ڕوودەدەن. ئەمە نەفرەتی زانستە: تاک
بە تاکی لێکۆڵەرەکان هەر لە بنەڕەتەوە پێویست نین. هەموو ئەو
شتانەی بۆ دۆزینەوە هەن، لە خاڵێکدا، کەسێک دەیاندۆزێتەوە.
هەمان شتیش بۆ بازرگان و بەرپرسی پیشەسازییەکان ڕاستە.

---

[45]- ئەلێکساندەر گراهام بێڵ: زانا، داهێنەر، ئەندازیار، لە بەرواری (2ی ئابی 1847) لە سکۆتلەندا لە دایکبووە، بە هۆی داهێنانی یەکەمین تەلەفۆنی کردارییەوە ستایش دەکرێت. هەروەها دامەزرێنەری -کۆمپانیای تەلەفۆن و تەلەگرافی ئەمریکی-یە، لە ساڵی 1885 دا. وەرگێڕ

[46]- ماڵۆکرا: گەورەترین دوورگەیە لە ئیسپانیا.

کاتێک لە ساڵانی هەشتادا کۆمپیوتەری ناو ماڵ خرایە بازارەوە، دەبوو کەسێک خێرا نەخشەیەک بۆ سیستەمی بەگەڕخستنی دابڕێژێت. وا ڕێکەوت ئەو کەسە بیڵ گەیتس[٤٧] بوو. ڕەنگە کەسێکی دیکە هەمان ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی ئەوی بەدەستنەهێنایە، بەڵام ئەمڕۆ چارەسەرێکی بەرنامەیی هاوشێوەمان هەر دەبوو. ڕەنگە بە بێ ستیڤ جۆب[٤٨] مۆبایلە زیرەکەکانمان هێندە جوان و کەشخە نەبوونایە، بەڵام کەم تا زۆر هەمان ئەرکیان دەبوو.

بازنەی هاوڕێکانم کۆمەڵێک ئەندامی بەڕێوبەری نوسینگەی جێبەجێکردن لە خۆ دەگرێت. هەندێکیان دامەزراوەیەکی گەورە لە خۆ دەگرن کە سەدان هەزار کارمەند کاری تێدا دەکات. ئەوان کارەکانیان بە جیددی دەگرن، تەنانەت هەندێکیان خۆیان بە شێوەیەکی مەیدانی کار دەکەن، لە خەڵاتی ئەوەشدا پارەیەکی بێشوماریان چنگ دەکەوێت. کەچی هێشتا هەر لە بنەڕەتەوە دەتوانرێت لا ببرێن و بکرێن بە کەسانی دیکە. چەند ساڵێکی کەم دوای خانەنشینبوونیان، هیچ کەس تەنانەت ناویشیانی بیر نامێنێت. کۆمپانیا زەبەلاحەکانی وەک جێنراڵ ئێلیکتریک، سیمێنس،

---

٤٧- بیڵ گەیتس: ناوی تەواوی -ویلیام هێنری گەیتسی سێیەم-ە، لە (28ی تشرینی یەکەمی 1955) لەدایکبووە، بە بیڵ گەیتس ناسراوە، بازرگانێکی ئەمریکییە، دامەزرێنەر و بەڕێوەبەری کۆمپانیای -مایکرۆسۆفت-ە. لە دوای -جێف بیزۆ- کە خاوەنی کۆمپانیای -ئەمازۆن-ە دووەم دەوڵەمەندترین کەسی جیهانە.

٤٨- ستیڤ جۆبس: ناوی تەواوی -ستیڤ پاوڵ جۆبس-ە لە (24ی شوباتی 1955) لە دایکبووە، داهێنەر و پیشەسازێکی بواری بازرگانی ئەمریکییە، یاریدەدەری دامەزرێنەری کۆمپانیای -ئەپڵ-ە، داهێنەری لاپتۆپ و مۆبایلی زیرەک بوو.

ڤۆلکسواگن، بەدڵنیاییەوە بەڕێوبەری نوسینگەی جێبەجێکردنی دیار و بەرچاویان هەبووە. بەڵام کێ ئەمڕۆ ناویان دەزانێت؟ بابەتەکە هەر ئەوە نییە کە دەتوانرێت شوێنی ئەوان بگیرێتەوە، تەنانەت دەرەنجامە بەهێزەکانی کۆمپانیاکەشیان لەسەر ئاستە گشتییەکەی زیاتر پەیوەندی بە خواستی بازاڕەوە هەیە وەک لە بڕیارەکانی ئەوان. وارن بەفێت بەم شێوەیە دەری دەبڕێت" أ) تۆمارێکی باشی بەڕێوەبەری (کە بە گوێرەی دەرەنجامە ئابوورییەکان پێوراوە) زۆر زیاتر ئەرکێکە و پەیوەندی بەوەوە هەیە کە سواری چ بەلەمێکی بازرگانی بوویت وەک لەوەی چەند کاریگەرانە سەوڵ لێدەدەیت."

مات ڕیدڵی کەمێک ڕەق و توندترە" زۆربەی بەڕێوبەرەکانی نوسینگەی جێبەجێکردن حازرخۆرن، پارەی چاکیان پێدەدرێت بۆ ئەوەی سواری شەپۆلی ئەو شتانە بین کە کارمەندەکانیان دروستی دەکەن... ئەو وەهمەی کە ئەوان ئاغا و دەرەبەگن وەک هەموو شتێکی تر لە لایەن میدیاوە بەکاردەهێندرێت."

ماندێلا، ستیڤ جۆب، گۆرباچۆڤ، مەهاتما گاندی، مارتن لوسەر و داهێنەرە بەناوبانگەکان و بەڕێوبەرە مەزنەکانی نوسینگەی جێبەجێکردن منداڵی سەردەمی خۆیان بوون، نە منداڵی دایک و باوکیان. هەموو پڕۆسەیەکی گرنگی ڕێنماییکراو تاکتیکی خۆیان بەکاردەهێنن، بەدڵنیاییەوە ئەگەر ئەوانیش نەبوونایە کەسێکی دیکە ئەوەی دەکرد. بۆیە دەبێت دوودڵ بین لەوەی زۆر گرنگی بە "مرۆڤەمەزن"ەکان بدەین جا چ ژن بن چ پیاو- هەروەها دەشبێت لە بارەی دەستکەوتەکانی خۆمانەوە خاکی بین.

گرنگ نییە کە ڕەنگە دەستکەوتەکانت چەند نایاب و مەزن بن، ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەوانە بە بێ تۆش ڕوویان دەدا. کاریگەری تۆ لەسەر دونیا زۆر بچووکە. گرنگ نییە چەند بلیمەتیت- جا بازرگانیت، کەسێکی ئەکادیمیت، بەڕێوبەری نوسینگەی جێبجێکردنیت، جەنەڕاڵێکی سەربازیت، سەرۆکیت، لە ئاستە گشتییەکەی شتەکاندا تۆ بێبایەخ و ناپێویستیت و جێگرەوەشت هەیە. تاکە شوێن کە بە ڕاستی دەتوانیت جیاوازییەکی تێدا دروست بکەیت ناو ژیانی خۆتە. تەرکیزت بخەرە سەر چواردەورەکەی خۆت. هەر زوو بۆت دەردەکەوێت کە دەستبەسەراگرتنی ئەوە بەرزخوازییەکی تەواوە. بۆچی گۆڕینی دونیا دەکەیت بە ئەرک لەسەر خۆت؟ خۆت لە نائومێدی بپارێزە.

باشە، ڕەنگە بەخت ناوەناوە فڕێتبداتە پێگەیەکەوە کە بەرپرسیارێتییەکی گەورەی تێدابێت و تۆش بەشێوەیەکی باڵا بەرامبەر ئەو ئاڵانگێڕییە هەڵبستیتەوە. تۆ دەکرێت باشترین بازرگان، داناترین سیاسەتمەدار، بەتواناترین بەڕێوبرەی نوسینگەی جێبەجێکردن، بیرمەندترین لێکۆڵەر بیت. بەڵام هەرگیز هەڵەی وا نەکەیت بیر لەوە بکەیتەوە تەواوی مرۆڤایەتی چاوەڕێی تۆیان کردووە.

من بۆ یەک چرکەساتیش گومانم لەوە نییە کە کتێبەکانم وەک بەردێک بەردەبنەوە بۆ ناو زەریای مێژووی دونیا ئاوا ون دەبن. دوای مردنم، ڕەنگە کوڕەکانم بۆ ماوەیەک هەر باسم بکەن. بەوهیوایەشم خێزانەکەشم هەمان شت بکات، یان تەنانەت منداڵی

منداڵەکانیشم. بەڵام دواتر هەر ئەوەندەیە. ڕۆڵف دۆبیلی لەبیر دەچێتەوە، دروستیش هەر دەبێت بەو شێوەیە بێت. زۆر باوەڕ نەبوون بە گرنگی خۆت یەکێکە لە بەهادارترین ستراتیژییەکان بۆ ژیانێکی باش.

# ٤٣

# هەڵەتێگەیشتن لە"دونیای دادپەروەر"

## بۆچی ژیانمان وەک ڕۆمانە تاوانییە کلاسیکەکان نییە؟

با دوو ڕۆمانی تاوان بە هەند وەربگرین. لە یەکەمیاندا، دوای گەڕانێکی سەرنجبەر، ئەفسەری لێکۆڵەر سەرەنجام بکوژەکە دەدۆزێتەوە و قۆڵبەستی دەکات. بکوژەکە دەبرێت بۆ بەردەمی دادگا و سزا دەدرێت. لە ڕۆمانی دووەمدا، دوای گەڕانێکی سەرنجبەر، ئەفسەری لێکۆڵەر بکوژەکە نادۆزێتەوە. ئەفسەرەکە کەیسەکە دادەخات و دەچێتە سەر کەیسی دواتری. کام ڕۆمانەیان بۆ خوێنەران زیاتر مایەی ڕەزامەندییە؟ بە ڕوون و ئاشکرا یەکەم. ئارەزووی ئێمە بۆ دادپەروەری ئەوەندە بەهێزە، بە ئاستەم دەتوانین بیرکردنەوە لە نادادی قبوڵ بکەین.

وەلێ ئەمە حەزێکی ئاسایی نییە، چونکە ئەوە ئەو دانەیانە کە ئێمە پێمانوایە جێبەجێ دەبێت. ئەگەر ئێستاش نەبێت، هەر ڕۆژێک دێت لە داهاتوودا جێبەجێ ببێت. زۆربەی خەڵکی بەقوڵی بڕوایان وایە

لە بنەڕەتەوە دونیا دادپەروەرە. بڕوایان وایە کە کردەوە باش
پاداشت دەکرێن و خراپەکانیش سزا دەدرێن، کەسە خراپەکان ب
دەکرێن بۆ ئەوەی ڕوونکردنەوەی خۆیان بدەن و بکوژەکانیش
کۆتاییدا لە پشت شیشی بەندینخانەوە دەوەستن.

بەڵام واقیع، بە داوای لێبووردنەوە، بەو شێوەیە نییە.
ڕاستیدا دونیا دادپەروەر نییە، زۆریش نادادپەروەرە. دەبێت ئێ
چی لەگەڵ ئەم حەقیقەتانەدا بکەین کە لەگەڵیان هاوڕا نین؟ ئەم
باوەڕی منە ئەگەر سووک و ئاسان نادادپەروەرییەکانی دونیا وەک
حەقیقەت قبوڵ بکەیت و بەشێوەیەکی -ستۆیک-ی بەرگەی بگریت
ئەوا ژیانێکی باشترت دەبێت. لە کردنی ئەمەدا بەدرێژایی ڕێگا خۆت
لە نائومێدییەکی زۆر قوتار دەکەیت.

یەکێک لە بەهێزترین و ئاڵۆزترین چیرۆکەکانی ناو ئینجیل
چیرۆکی ئەیوب —پێغەمبەرە خ.ر. وەرگێڕ- ئەیوب بازرگانێکی
خودانـاس، سـەرکـەوتـوو، زۆر خۆشەویست بـوو، ژیانێکی زۆر
شەرەفمەندانەی بەڕێدەکرد، پیاوی ناو پیاوان بوو، هاوسەرگیرییەکی
جێگیریشی کردبوو، دە منداڵیساڵحیشی هەبوو- بە کورتی و بە
پوختی لەو جۆرە کەسانە بوو کە بەغیلییان پێدەبرد و هەموو شتەکان
هەمیشە بە خۆشی و هێواشی بۆی دەچوونە سەر. شەیتان بە خودا
دەڵێت" هیچ چەندوچوونی تێدا نییە ئەیوب لە خوداترسە. هەموو
شتەکان بێ سەرئێشە دەڕۆن. ئەگەر کێشەی زیاتری هەبووایە، هەر
زوو ئیمانەکەی لەق دەبوو."

خودا بێزار دەبێت لەمە. نیازی ئەوەی هەیە بانگەشەکەی شەیتان بە درۆ بخاتەوە، ڕێگەی پێدەدات کەمێک نارێکی بەسەر ژیانی -ئەیوب-ی پێغەمبەردا بهێنێت. لە چاو تروکاندنێکدا، ئەیوب پێغەمبەر هەموو پارەکەی لە دەست دەدات. شەیتان هەموو منداڵەکانی دەکوژێت- حەوت کوڕ و سێ کچ. تەنانەت کۆیلەکانیشی دەمرن. لە کۆتاییدا سەرەڕای ئەوانەش، شەیتان ئەیوب تووشی نەخۆشی دەکات. کێمێکی بە ئازار لە سەرتاپای جەستەیەوە دەردەچێت. سووکایەتی پێدەکرێت و دەردەکرێت. ئەیوب پێغەمبەر گوێی لە لێواری گۆڕ دەلەقێت. کاتێک بە دیار خۆڵەمێشی ماڵە سووتاوەکەیەوە دادەنیشێت. خێزانەکەی ئەم ئامۆژگارییەی دەکات" خودا بە نەفرەت بکە و بمرە." کەچی ئەیوب پێغەمبەر لە سووپاسکردنی خودا بەردەوام دەبێت. ئەگەر تەنها بۆ کوشتنی ئازارەکەش بێت، ئەوا ئەو تامەزرۆی ئەوەیە بمرێت، بەڵام خودا تەنانەت مۆڵەتی ئەوەشی پێنادات. لە کۆتاییدا زریانێک دێت و خودا لە ناو گێژەڵوکەیەکەوە قسە لەگەڵ ئەیوب پێغەمبەر دەکات، بۆی ڕوون دەکاتەوە کە کارەکانی خودا بە لای مرۆڤەکانەوە هەرگیز مایەی تێگەیشتن نین و هەر واش دەمێننەوە، ناتوانن لە ئەو، خودا، تێبگەن. لەبەر ئەوەی ئەیوب هەر بە ئیمانداری مایەوە، لەبەر ئەوەی تەنانەت سەختترین تاقیکردنەوەش وایانلێنەکرد گومان لە خودا بکات، ئەوا هەموو شتێکی پێدەبەخشرێتەوە- تەندروستییەکەی، دەوڵەمەندییەکەی، سەرتاپای خێزانەکەی تەنانەت بە هەموو منداڵەکانیشییەوە. لە خۆشیدا شاگەشکە دەبێت، تەمەنێکی تولآنیش دەژی.

به بەراورد لەگەڵ ستانداردەکانی ڕۆمانێکی تاوانکاری، کە تێیدا بکوژەکە دەستبەسەر دەکرێت و بە حوکمی دادپەروەرانەی خۆی دەگات، چیرۆکی پێغەمبەر ئەیوب زۆر ئاڵۆزترە. سەرئەنجام دەگاتە کۆتایی بازنەکە. ئەزموونی نادادییەکی قوڵ دەکات، بەڵام لە کۆتاییدا هەموو شتێک سەرەنجام بە خێر دەگەڕێت. پەیامەکە ئەوەیە کە دونیا دەکرێت هەندێک جار نادادپەروەر دەربکەوێت، بەڵام تەنها لەبەر ئەوەیە کە ئێمە لەوە تێناگەین خودا چۆن دەیخاتە گەڕ. ئینجیل دەڵێت کە تۆ دەبێت ئەو نادادپەروەرییە قبوڵ بکەیت. تاهەتایە بەردەوام نابێت. لە پشت هەموو ئەو شتانەوە نەخشەیەکی دادپەروەرانە هەیە، کە ئێوەی مرۆڤ، هەر وەک ئەوەی تواناتان سنوردارە، وا بە ئاسانی لێی تێناگەن.

به دەربڕینێکی دەروونناسییانە، ئەمە ستراتیژییەتێکی زۆر نایابە بۆ هەڵکردن و دەست و پەنجە نەرمکردن لەگەڵ تیر و مەنجەنیقەکانی چارەنووس. سووتان، دیاریکردنت بە نەخۆشی شێرپەنجە، ئەزموونکردنی مردنی منداڵەکەت- ئەوانە هەمووی تراژیدیان، بەڵام لە بوارە گشتییەکەی شتەکاندا و لەسەر ئەرزی واقیع بە جۆرێک لە جۆرەکان مانابەخشن، بۆ منیش نییە تێبگەم هەموو ئەو شتانە چۆن پێکەوە دەگونجێن. خودا تەنها تاقیم دەکاتەوە، ئەگەر منیش بەردەوام بێ ئەوەی لەرزینێک هەبێت لە باوەڕبوونم بەو، ئەوا لەبەر ئەوە تا کۆتایی پاداشتم دەداتەوە.

تا ئێستا زۆر ئیسراحەتە، بەڵام کێ بە جدی بڕوای بە خودایەکە کە لێدەگەڕێت ئەو هەموو دڵڕەقییەی موی سەر قیت دەکەنەوە

بەسەر مرۆڤدا بێت ئەمە لە کاتێکدا دەتوانێت سووک و ئاسان هەموو ئەو شتانە چارەسەر بکات؟ خەڵکی زیاتر و زیاتر لە باوەڕنەکردن و نەچوون بە ئەقڵیاندا سەر ڕادەوەشێنن. کەچی هێشتاش، بە نهێنی، توند دەستمان بە بیرۆکەی نەخشەیەکی دادپەروەرانە بۆ دونیا گرتووە. کەچی ئێمە تامەزرۆیانە بڕوامان بە جۆرێک لە جۆرەکان کارما[٤٩] هەیە، کە بە هۆی کردەوە چاکەکانمانەوە پاداشت دەکرێین و بە هۆی خراپەکانیشمانەوە سزا دەدرێین- ئەگەر لەم ژیانەشدا نەبێت، ئەوا لە ژیانەکەی دیکەدا.

فەیلەسوفی ئینگلیزی جۆن گرەی نوسیویەتی کە لە یۆنانییە کۆنەکاندا "بێ پرسیارکردن باوەڕیان وابوو کە ژیانی کەسێک لە ڕێگەی بەخت و چارەنووسەوە بەڕێوەدەبرێت...ئەخلاقەکان لە بارەی چاکناسییەوەن وەک ئازایەتی و دانایی، بەڵام ئازاترین و داناترینی مرۆڤەکان بەرەو نشێوی شکست و وێرانبوون دەڕۆن. بۆیە وا بۆمان باشترە ژیانی خۆمان بونیاد بنێین- لانیکەم لە ناو خەڵکدا- بۆ ئەوەی وایپشان بدەین "ئەخلاق" لە کۆتاییدا دەیباتەوە. کەچی هێشتا لە ڕاستیدا باوەڕمان پێی نییە. لە بنەڕەتدا، دەزانین کە هیچ شتێک وامانلێناکات دژ بە چارەنوس و بەخت بۆمان ناسەلمێنێت."

ئەمە حەقیقەتەکەیە: هیچ نەخشەیەکی دادپەروەرانە بۆ دونیا لە ئارادا نییە. تەنانەت پلانێکی نادادپەروەرانەش لە ئارادا نییە. بە

---

٤٩- کارما: وشەیەکی سانسکریتییە, کە بە پێی بیروباوەڕی بوزی و هندۆسییەکان پوختەی کاروباری باش و خراپی کەسێکە و بە گوێرەی ئەو کار و کردەوانەش بڕیار دەدرێت کە ئاخۆ ئەو کەسە لەم ژیانەدا یاخود لە ژیانەکەی دیکەدا چی بەسەر دێت.

هیچ شێوەیەک پلانێک هەر لە ئارادا نییە. دونیا هەر لە بنەڕەتەوە کاری بە باش و خراپەوە نییە. قبوڵکردنی ئەم زانیارییە بە لامانەوە زۆر قورسە بە ڕادەیەک کە زانست زاراوەی خۆی بۆ ئەم دیاردەیە داتاشیوە: هەڵەتێگەیشتن لە"دونیای دادپەر". ئەمە بەدڵنیاییەوە بە واتای ئەوە نایات کە نابێت بەرامبەر نادادی هێور بینەوە- بۆ نموونە لە ڕێگەی بیمەی کۆمەڵایەتی و چاودێری کۆمەڵایەتییەوە. تەنها ئەوەیە کە چەندین شت هەن ناکرێت دابین بکرێت و دابەش بکرێت.

یەکێک لە مامۆستاکانی خوێندنگای ئامادەییم نمرەکانی لە گۆترە دادەنا، بێ ئەوەی کەمترین پەیوەندی بە سەرکەوتنەکانەوە هەبێت. ئەم نمرە کوێرانە، لە گۆترەیە، ڕاستەوخۆ ڕۆیشتە ناو ڕاپۆرتەکانمانەوە. خوێندکارەکان دڵگەرمانە نارەزاییان دەربڕی. کاتێک سەلما ئەمە بێسوود بوو، ڕامانکرد بۆ لای بەڕێوبەری خوێندنگاکەمان- ئەویش ڕێزی لە بڕیاری مامۆستاکە گرت و هیچی نەکرد. ئەوە تەواو نادادپەروەرانە بوو، ئێمەش هەر پرتە و بۆڵەمان بوو. بەڵام مامۆستاکە هەر بە هێمن و لەسەرخۆیی مایەوە:"ژیان نادادپەروەرانەیە. تا زووتر ئەمە بزانیت، باشترە!" دەمانتوانی توند پڕ بدەینە بۆقەتەی ملی و ڕەگی دەربێنین. کاتێک بیر لە ڕابردوو دەکەمەوە، یەمە یەکێک لە گرنگترین وانەکان بوون کە لە حەوت ساڵی خوێندنی ئامادەییمدا فێربووم.

کاتێک فەیلەسوفی ئەڵمانی لیبنز سێ سەد ساڵ لەمەو پێش بانگەشەی ئەوەی کرد کە ئێمە لە باشترینی ناو هەموو

ئەو دونیایانەی ئەگەریان هەیە دەژین(چونکە، بەدڵنیاییەوە، خودا بەمەبەست دونیایەکی خراپی دروستنەکردووە)، ڤۆڵتێر چەند ساڵێکی کەم دواتر لە وەڵامی ئەمەدا ڕۆمانێکی تەنزئامێزی بە ناوی کاندید نوسی. دوای بومەلەرزە سەختەکەی لیسبۆن لە ساڵی ١٧٥٥ دا، کە سەرتاپای شارەکەی وێران کرد، هیچ کەسێکی عاقڵ نەیدەتوانی بەردەوام بێت لە باوەڕبوون بە پلانێکی دادپەروەرانە بۆ دونیا. خەونێکی یوتۆپیا[٥٠]ی لە بارەی ژیانێکەوە کە خاڵی بێت لە نیگەرانی بۆ هەمووومان کۆتایی پێهات. کاندید کە کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکەیە، ژیانێک دەژی بە کارەسات قاندراوە، لە کۆتاییشدا درک بەوە دەکات کە" دەبێت ئاگاداری باخچەکەی خۆمان بین."

سەرئەنجام؟ هیچ پلانێکی دادپەروەرانە بۆ دونیا بوونی نییە. بەشێکی ژیانێکی باش ئەوەیە کە بە توندی ئەوە قبوڵ بکەیت. تەرکیز بخەرە سەر باخچەکەت- لەسەر هەموو ڕۆژێکی ژیانت- بژاری تەواویش بەشی خۆت دەدۆزیتەوە بۆ ئەوەی بەردەوام سەرقاڵت بکات. ئەو شتانەی بەسەرتدا دێن لە خولی ژیانتدا، بەتایبەتی مستەکۆڵە جدییەکانی چارەنووس، کەمێک پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئاخۆ تۆ کەسێکی باشیت یان خراپ. کەواتە بەدبەختی و چارەڕەشی بە -ستۆیسیزم- و ئارامییەوە قبوڵ بکە. دروست بە هەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ سەرکەوتنە باوەڕپێنەکراوەکان و چەپۆکەکانی بەختدا بکە.

---

٥٠-یوتۆپیا: شاری خەونەکان.

٤٤

# بیروباوەڕی فڕۆکە شمەکهێنەکان

## خەیاڵ پڵاو مەبە

لە جەنگی جیهانی دووەمــدا، چەند دورگەیەکی بچووکی زەریای هێمن بوون بە گۆڕەپانی ململانێی جەنگە سەختەکانی نێوان سووپای ژاپۆنی و ئەمریکییەکان. خەڵکی ناوچەکەش، کە هەرگیز پێشتر سەربازیان نەبینیبوو- هەرگیز ئۆتۆمۆبێلی جێب و تەلەفۆنی لاسلکییان چاو پێنەکەوتبوو- بەسەرسامییەوە سەیری ئەو دیمەنە توندوتیژانەیان دەکرد کە لە کوخە کایەکانییانەوە بەرزدەبووەوە. ئەو کەسانەی بە یەکپۆشی نامۆوە کە ئێسکی ڕوخساریان زەق دەرپەڕیبوو، قسەیان لەگەڵ دەکردن. چەندین باڵندەی[٥١] لە هەژمار نەهاتوو لە ئاسماندا بەشێوەیەکی بازنەیی باڵەفڕکەیان بوو، چەندین پاکەتیان بۆ سەر زەوی لە ڕێگەی چەند پارچە قوماشێکی

---

٥١- باڵندە: لێرەدا نوسەر مەبەستی فڕۆکەیە, بەڵام لە زمانی ئەو کەسانەی لەو دوورگانەدا دەژیان دەگێڕێتەوە, بەو پێیەو ئەوان فڕۆکەیان نەبینیبوو پێیان وابووە باڵندەن. وەرگێڕ.

فوتێکراوەوە بەردەدایەوە. پاکەتەکان پڕ لە قووتوو بوون.

هاتنە خوارەوەی خواردن لە ئاسمانەوە لە بیرۆکەی بەهەشت نەبێت هیچ شتێکی دیکە بەو شێوەیە نەدەچوو. سەربازەکان ئەو خواردنە لە قووتونراوانەیان لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچەیەدا بەش کرد. هیچ کەس پێشتر هەرگیز کەسانی ڕێبوار و نەناسی نەبینیبوو ڕاو بکەن یاخود خواردن کۆ بکەنەوە. بەپێی ئەو بەڵگانەی لەبەردەستدان ئەوان کارێکی دروستیان دەکرد. بەڵام بەنیازبوون چۆن فیل لەم باڵندە شمەکهێنە بکەن؟

دوای جەنگ، کاتێک هێزەکانی سووپا کشانەوە و کەسانی ناوچەکە دووبارە تەنها بوونەوە، شتێکی نامۆ ڕوویدا. بیروباوەڕێکی نوێ لە زۆربەی دوورگەکاندا قووتبووەوە ئەویش- بیروباوەڕی فڕۆکە شمەکهێنەکان. خەڵکانی ناوچەکە ڕۆیشتن بۆ ئەوەی گەلاوگوڵی لەسەر گردەکان بسووتێنن و چواردەوری ناوچەیەکی پاکیان بە بەرد دا. بە فڕۆکەیەکی تەواو هەمان شێوەیان بە دروستکرد و لەسەر ڕاڕەوێکی دەستکردی فڕۆکە دایاننا. دواتر بورجی ڕادیۆیان بە قامیش دروستکرد، هێدفۆنیان لە تەختە داتاشی، دواتریش لاسایی جوڵەی ئەو سەربازانەیان کردەوە کە لە جەنگدا بینیبوویان. ئاگرەکەیان کردەوە بۆ ئەوەی لاسایی هێمای ڕووناکییەکە بکەون، هەر وەک چۆن لەسەر جلی یەکپۆشی سووپاکە بینیبوویان هەندێک هێماشیان وەک تاتۆ لەسەر پێستیان هەڵکۆڵی. لە بنەڕەتدا دەیانویست شێوەی فڕۆکەخانەیەک دروست بکەن، بەو هیوایەی بتوانن سەرنجی ئەو باڵندە زۆر و زەوەندانە بە لای خۆیاندا ڕابکێشن کە لە ماوەی جەنگەکەدا خواردنێکی بێشووماریان بۆ فڕێ دابوونە خوارەوە.

ریچار فیینمان لە یەکێک لە وتارەکانیدا باسی -بیروباوەڕی فرۆکە شمەکهێنەکان-ی کرد" لە دەریاکانی باشووردا کۆمەڵە خەلکێک هەن -بیروباوەڕی فرۆکە شمەکهێنەکان=یان هەیە...هەموو شتێک بە دروستی دەکەن. شێوەکەی نایابە. دروست بەو شێوەیە دەردەکەوێت کە پێشتر دەرکەوتووە. بەڵام بە کەڵک نایات. هیچ فرۆکەیەکی ئاسمانی نانیشێتەوە." فیینمان بە توندی و بە ئاشکرا رەخنەی لەو مەیلخوازییە بو کە خەریکە لە زانستەکانیشدا بواریکی زیاتر داگیر دەکات: پەیوەستبوونێکی توند بە فۆرم و شێوەوە بێ ئەوەی بەڕاستی لە ناوەڕۆک تێبگەن.

ئەمە تەنها هاوڵاتییان ناوچەیەکی دیاریکراو یاخود زاناکان نین کە دەکەونە داوی - بیروباوەڕی فرۆکە شمەکهێنەکان-ەوە. هاوڕێیەکم هەبوو هەموو خەون و خولیای ئەوەبوو ببێت بە رۆماننوسێکی گەورە. لەو کاتەوەی زمانی ئینگلیزی لە زانکۆ خوێندبوو، باسی ئەو بابەتە نەبێت باسی هیچ شتێکی دیکەی نەدەکرد. بە ئێرنیس هێمنگوای سەرسام بوو. نموونەیەکی خراپ نییە تا شوێنی بکەویت: هێمنگوای نایاب دیار بوو. هەموو جۆرە کارەکتەرێکی ژنی هەبوو، کتێبەکانی ملیۆنان کۆپییان لێفرۆشرابوو. هێمنگوای یەکەمین نوسەر بوو کە وەک ئەستێرەیەکی درەوشاوە ناوبانگێکی نێودەوڵەتی هەبێت. هاوڕێکەم چی کرد؟ سمێڵی لێ درێژکرد، کراسەکانی بە ئوتونەکراوی و قۆپچەی دانەخراوەوە لەبەر دەکرد، لە کتێبخانەکان دادەنیشت و یەک دوو خواردنەوەی تێکەڵ دەکرد. یەک بن هەنگڵ دەفتەری -مۆڵیسکین-ی لەسەر

یەک هەڵچنیبوو، چونکە وادیارە هێمینگوای ئەو دەفتەرانەی بەکارهێناوە(کە لە ڕاستیدا وانییە). بەداخەوە، هیچ لەم خوانە دوور و نزیک کاریگەری لەسەر سەرکەوتن و شکستهێنانی ئەو بوارەی باسکرا نەبوو. هاوڕێکەشم بوو بە قوربانی - بیروباوەڕی فڕۆکە شمەکهێنەکان-.

ڕەنگە تۆ بە - بیروباوەڕی فڕۆکە شمەکهێنەکان- پێبکەنیت، بەڵام ئەوانە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەربڵاون. تەنانەت لە دونیای بازرگانیشدا. چەند بازرگان بەو هیوایەی سەرنجی چەندین کارمەندی بلیمەت ڕابکێشن بە لای خۆیاندا لە لاسایی گووگڵ دا دیدەنگەکانیان دروست وەک ئەوان لێکردوە؟ چەند پشککڕی بەرزخواز لە کۆبوونەوەیان لەگەڵ وەبەرهێنەرەکاندا بە چاکەتێکی کڵاوداره‌وه ئامادەبوون بەو هیوایەی ببن بە -مارک زوکەربێرگ-ی داهاتوو؟

بە تایبەتی و بەشێوەیەکی زۆر دامەزراو نەریتی بیروباوەڕی فڕۆکە شمەکهێنەکان لە ناو وردبینە ئابوورییەکاندا بەدیدەکرێت. ئەوان لیستێکی پشکنینی توندوتۆڵیان هەیە بۆ ئەوەی لە ماوەی وردبینی ساڵانەیاندا پێیدا بڕۆن. ئایا تۆمارێکی مۆرکراو بۆ هەموو خشتەی کۆبوونەوەکان هەیە؟ ئایا وەسڵی هەموو خەرجییەکان بەشێوەیەکی ڕاست تۆمار کراون؟ ئایا لە ماوەی هەژمارکردنی دروستدا داهاتەکە زانراوە؟ ئایا هەموو کەیسەکان بەشێوەیەکی یاسایی مامەڵەیان لەگەڵ کراوە- نەوەک کاتێک کۆمپانیاکان چەند مانگێکی کەمی دیکە شکست بخۆن یان توشی کێشە ببن- وەک

کۆمپانیاکانی ئێنرۆن، لیهمان برەزەرس، ئەی ئای جی، یو بی ئیس- وردبینە ئابوورییەکان لە لای ناکەهانەوە بە توندی هێرشیان دەکرێتە سەر. ئەوەندەی بەڵگە لەبەردەستدایە ئەوەیە کە ئەوانە لە ناساندنی ئەو ناوچانەی کە کۆمپانیاکە شکستی تێدا هێناوە و کەموکورتی هەبووە لە کەیسەکاندا زۆر باشن، بەڵام هەر ئەوەندە هەیە لە دۆزینەوەی ژمارەی ڕاستی زیانەکاندا بەو چەشنە نین.

یەک نموونەی تایبەت و خۆش لە دونیای مۆسیقاوە دێت. دوای دۆزینەوەی فیلێک بۆ خۆ گەیاندن بە کۆشک و دەسەڵاتی فەڕەنسا، بەرزبوونەوە بۆ پلەی (سەرۆکی ئاوازدانەران و دواتر بەرپرسی بەشی مۆسیقا) لە دەسەڵاتەکەی سون کینگ دا لە ڤێرسایلەس، جین باپتیستێ لولی تا بچووکترین ئاستی وردەکاری دیاریکرد کە دەبێت مۆسیقای دەوڵەت چۆن بێت. بۆ نموونە، مۆسیقای پێشەکی ئۆپێرا دەبوو شوێن پێکهاتەیەکی زۆر تایبەت بکەوێت- بەردەوامییەکەی دەبوو بە شێوەیەکی دیاریکراو دووبارە بکرایەتەوە، ڕیتمی بڕگەی یەکەم دەبوو نیو بڕگەی دیکە بەدوایدا بێت، دواتر دەبوو -فوگ[٥٢]-ێگ بەدوایدا بێت، ئیتر تا کۆتایی بەو شێوەیە دەڕوات. لەو سەردەمەدا لولی قەناعەتی بە پادشا کرد تا دەسەڵاتی ئەوەی بداتێ تەواوی ئۆپێرا بۆ خۆی قۆرخ بکات، نەک تەنها لە پاریس، بەڵکو لە تەواوی فەڕەنسادا. زۆر بە چاوچنۆکی ئەم دەسەڵاتەی بەکارهێنا، دڵڕەقانە ئەم کێبڕکێیانەی لە بەرژەوەندی خۆی بەکاردەهێنا. لولی وردە

---

٥٢- فوگ: پارچە مۆسیقایەکە کە تێیدا یەک یان دوو بڕگە لە سەرەتادا پێشکەش دەکرێت و دواتر بەشێوەیەکی ئاڵۆزتر دووبارە دەکرێتەوە.

ورده بوو بە "بێزراوترین مۆسیقاژەنی هەموو سەردەمەکان" (هەر وەک ڕۆبێرت گرینبێرگ ئاماژەی پێدەکات)، کەچی لە ناکاو هەموو کۆشکی شاهانەکانی ئەورووپا داوای مۆسیقای جۆری -لولی-یان، دەکرد و خواستیان لە سەری هەبوو. تەنانەت لە شڕ و وێرانترین، دوورەدەستترین قەڵاکانی سویسرا لە زنجیرە چیاکانی ئالپ، دەسەڵاتی شاهانەکان نەریتەکانی -پاریس-یان بەکاردەهێنایەوە، ئەمە لە سادەترین شێوەی دا بەکارهێنانی -بیروباوەڕی فڕۆکە شمەکهێنەکان-، چونکە ئەمە وای لە چینە باڵا و ئەرستۆکراتەکە دەکرد کەمێک هەست بکەن وا لە ڤێرسایلەس دانیشتوون.

تێبینییەکی لاوەکی: لە بەرزی دەسەڵاتیدا، لە ٨ی کانوونی دووەمی ١٦٨٧ دا، لولی کۆنسێرتێکی بەڕێوە دەبرد کە ستافێکی زۆر تۆکمەی بەکارهێنا بۆ ئەوەی لە گۆڕەپانەکەدا مۆسیقا بژەنن، هەر وەک لەو کاتەدا نەریت بوو. لە چرکەساتێکدا، هێندە بە قورسی پێ بە زەویدا دەنێت پەنجەیەکی پێی دەشکێت. ئەو بابەتە دەتەقێتەوە و دواتر توشی نەخۆشی -گانگرین[٥٣]-ی کرد، لولی سێ مانگ دواتر کۆچی دوایی کرد، زیاتر بوو بە هۆی بوژانەوە و ئاه بە بەرداهاتنی شانۆی مۆسیقای فەڕەنسی.

دەبێت چی لەم چیرۆکەوە فێر ببین؟ کوت و مت لاسایی لولی مەکەرەوە. خۆت لە هەر جۆرە - بیروباوەڕێکی فڕۆکە شمەکهێنەکان- بە دوور بگرە. ئاگاداری خۆشت بە: لاساییکردنەوەیەکی بێناوەڕۆک

٥٣- گانگرین: جۆرە نەخۆشییەکە کە بەشێکی جەستە یاخود ئەندامێک بە هۆی بریندار و نەخۆشییەوە چیتر خوێن و پێداویستییە جەستەییەکانی دیکەی پێناگات.

زۆر لەوە باوترە کە ئێمە بیری لێدەکەینەوە. وەک خۆی کە هەیە سەیری بکە و لە ژیانتی دوور بخەرەوە، ئەگینا بە پێچەوانەوە تەنها کاتت لە دەست دەدات و تێڕوانینت تەسک دەکاتەوە. خۆت لەو کەس و ڕێکخراوانە بە دوور بگرە کە کەوتوونەتە داوی - بیروباوەڕی فرۆکە شمەکهێنەکان-ەوە. خۆت لەو هاوڕێیەتییانە بە دوور بگرە کە پاداشتی خۆبەزلزان و لە جیاتی دەستکەوت مەراسیم دەگێڕن. لەسەر و هەموو شتێکیشەوە کوێرانە لاسایی مامەڵەی کەسانی سەرکەوتوو مەکەرەوە، بێ ئەوەی بەڕاستی لەوە تێبگەیت کە چ شتێک لە سەرەتاوە سەرکەوتووی کردن.

٤٥

## ئەگەر لەسەر ڕێڕەوی خۆت ڕابکەیت هەرگیز نادۆڕێیت.

## بۆچی زانیاری گشتی تەنها وەک خوو بەسوودە؟

ئەگەر گرافیک دیزاینەر، شۆفێری فڕۆکە، پزیشکی نەشتەرگەری دڵ، بەڕێوەبەری کۆمپانیایەک بیت، چەند دەزانیت و زانیاریت دەبێت؟ بڕێکی زۆر. مێشکت زانیارییاکان لە بارەی ناوچەی تایبەتمەندیتەوە هەر دەهێنێت و دەبات. تەنانەت ئەگەر لە قۆناغە سەرەتاکانی پیشەکەشتدا بیت، ڕەنگە پێشتر لە پێشینەکەی خۆتت زیاتر زانیبێت. فڕۆکەوانەکان چیتر بەو ڕادەیە سووک و ئاسان پێویست ناکات لە دینامیکی هەوا و چەندین ئامێری لەیەکچوودا شارەزاییەکی باڵایان هەبێت. هەموو ساڵێک ڕووبەڕووی تەکنەلۆجیای نوێ و یاسای زانستی فڕین دەبنەوە کە دەبێت ئاشنابن لەگەڵیاندا- ئەمە یاسا کۆنەکانیش لەولاوە بوەستن. دیزاینەرەکانی بواری گرافیک نابێت تەنها ئاگاداری بەرنامە کۆمپیوتەرییەکانی ئامادەکراوەکانی وەک ئەدۆب فۆتۆشۆپ و ئین دیزاین بن، بەڵکو دەبێت ئاگاداری جوانکارییەکانی بواری ڕیکلام بن

لە پەنجا ساڵی ڕابردوو دا. ئەگینا ئەوان ئەو قوربانییە دەدەن کە تەنها بیرۆکە کۆنەکان هەڵدەهێنجنەوە، یان بگرە لەوەش خراپتر تەنانەت هەر ناشتوانن بەردەوام بن. بەرنامەی کۆمپیوتەری نوێ ساڵانە دێتە بازاڕەکانەوە، لە دیدەنگەکاندا بەکاردەهێندرێن، کڕیارەکان ڕێژەی خواستیان لەسەری بەرز دەبێتەوە، داوای دیزاینەر دەکەن بۆ ئەوەی ڤیدیۆیان بۆ بەرهەم بهێنن، لە ڕووی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە باڵا ببن و واقیعێکی کرداری دروست بکەن.

ئەی سەبارەت بە ناوچەی دەرەوەی ئەزموونی خۆت چی؟ ئایا کەمتر یاخود زیاتر لە پێشینەکانی خۆت دەزانیت؟ بە خەیاڵی من کەمتر. ئەی چۆن دەبێت پێچەوانەکەی بێت؟ مێشکت تەنها توانایەکی سنورداری هەیە، تا شوێنی زیاتر لە ناوچەی تایبەتمەندی خۆتدا پڕ بکەیتەوە، بۆشایی کەمترت بۆ زانیاری گشتی دەمێنێتەوە. ڕەنگە بە توڕەییەکی زۆرەوە ناڕەزایی دەرببڕیت. من، کەسێکم تایبەتمەندیم لە یەک بواردا هەیە؟ هیچ کەس نایەوێت یەکێک بێت لەوانە. ئێمە پێمان باشترە بە خۆمان بڵێین گشتگەرا، یاخود کارمەندی لێپرسراو( نوسەر ئەم وەسفەی بۆ هەڵبژاردووە) یاخود ئەوانەی لە بواری هێڵەکانی ئینتەرنێتدا کار دەکەن. ئێمە کونپشکی ئەوە دەکەین تا بزانین ئاخۆ پیشەکەمان چەند مەودای فراوانە، جانتای کڕیارەکانمان چەند هەمە چەشنە، ئێمە هەموومان خۆمان وەک بەهرەدار دەبینین، نەک وەک تایبەتمەندێکی کوێرانە.

کەچی کاتێک سەیری ژمارەی بێکۆتایی بوارە تایبەتمەندەکان دەکەیت- هەر لە دیزاینی کۆمپیوتەری چیپسەوە بیگرە تا بازرگانی

قاوە- ئەو گەردوونە پڕ لە زانیارییەی کە بە خەیاڵی خۆمان دامانناوە، لە ناکاو گرژ دەبێتەوە و دەبێت بە کونێکی بچکۆلە. ئێمە لە بارەی کەمتر و کەمترەوە زیاتر و زیاتر دەزانین. بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی دیکە دەریببڕین، کاتێک شارەزاییەکانی ئێمە وردە وردە زیاد دەکات، بێئاگایی و غافڵیمان لە ئاستە کردارییەکەدا دەتەقێتەوە. بۆ ئەوەی بمێنینەوە، ئێمە پشت بە چەندین کرێکاری ئیسراحەت و بێئەرک دەبەستین، کە ئەوانیش لە بەرامبەردا پشت بە چەندین کرێکاری بێ ئەرک و ئیسراحەت دەبەستن. یان تۆ پێتوایە بەشێوەیەکی خێرا دەتوانیت پارچەکانی مۆبایلێکی نوێ پێکەوە بنێیت و دروستیان بکەیت؟

ئەم کەسە ئیسراحەتانەی پاڵیان لێداوەتەوە وەک قارچک لە زەوییەوە هەڵدەتۆقن. بەم خێراییە نائاساییە ئەوان داهاتەکانی پێ چەند هێندە دەکەن لە مێژووی مرۆڤایەتیدا یەکەمین جارە شتی وارووبدات. تاکە دابەشکردنی کار کە بۆ ملیۆنان ساڵ بوونی هەبووە لە نێوان ژن و پیاودا بووە، ئەوەش تەنها لەبەر ئەو بارودۆخە بایەلۆجییە ئاشکرایەی هەیە و بە شێوەیەکی گشتی پیاو گەورەتر و بەهێزترە لە ژن، ژنیش دەبێت بە بارودۆخی دووگیانیدا بڕوات، بووەتە هۆکاری ئەو دابەشکارییە. ئەگەر بە وردی لە ژیانی کۆنی باو و باپیرانمان ورد ببینەوە کە چۆن پەنجا هەزار ساڵ پێش ئێستا ئیشیان کردووە، سەرمانسوڕ دەمێنێت لەوەی کە چەند بە باشی -بەنزیکەیی- هەموویان -بە نزیکەیی- لە هەموو شتێکدا باش بوون. هیچ کەسێکی تایبەتمەند لە نەخشەسازی تەوری بەردین، بەرهەمەکانی تەوری بەردین، بازاڕکاری تەوری بەردین، پاڵپشتی کڕیارانی تەوری بەردین، ڕاهێنانی

ئەوری بەردین، بەڕێوبردنی کۆمەڵگای ئەوری بەردین دا نەبووە. ئەمانەت کۆمەڵە کەسێکیش بوونیان نەبوو ئەرکیزیان لەسەر ئەوە بێت سنگ دەربپەڕێنن و ئەم ئەورانە ڕابوەشێنن. هەموویان ئەوری خۆیان بەرهەم دەهێنا، هەمووشیان دەیانزانی چۆن بەکاری بهێنن. ڕاوچی و کۆکەرەوەکان "تایبەتمەندی"یان، نەبوو.

ئەمە تا دە هەزار ساڵ لەمەو پێش کە جێگیربوونی کۆمەڵگاکان زۆر زیادی کرد نەگۆڕا. لە ناکاو بە تایبەتمەندبوونی ئەرکەکان دەرکەوت: بەخێوکردنی ئاژەڵی ماڵی، جوتیاری دانەوێڵە، گلکاری، زەوپێوان، سەربازەکان، ئاو هەڵگرەکان، چێشتلێنەرەکان، دادنوس. تایبەتمەندی داهێنرا، پیشە و بواری تایبەتمەندی- لەگەڵ ئەوەشدا گەمژەیەکی بێئاگا لە دونیا پەیدا بوو.

کەسێکی سەردەمی چاخی بەردین دەکرێت تەنها وەک گشتگەرایەک دەیتوانی بمێنێتەوە. وەک کەسێکی تایبەتمەند ئەوان هیچ دەرفەتێکیان نابێت. ئێستا، دە هەزار ساڵ دواتر، بارودۆخەکە بەتەواوی پێچەوانە بووەتەوە: خەڵکی تەنها وەک تایبەتمەندێک دەتوانن بژین و ڕزگاریان بێت، ئەمە لە کاتێکدا گشتگیرەکان هیچ دەرفەتێکیان لەبەردەستدا نییە. ئەوەی دەمێنێتەوە لە گشتگەراکان- ئەوانەی سەریان لە هار و مار دەردەچێت، نوسەرە هاکەرەکان ئەوانەی لە نێو ڕۆژنامەنوسەکاندان- بەهای دەستڕەنگینییەکەی خۆیان بینیوە بەربۆتە خوارەوە بۆ ناو کەندەلایێک. ئەمە مایەی سەرسامییە کە چەند بە خێرایی پەرەوەردەی گشتی بووە بە شتێکی بێسوود.

ده هەزار ساڵ- لە تێڕوانینێکی پەرەسەندنییەوە- بیردۆزی پەرەسەندن- تەنها چاوتروکاندنێکە. هەر لەبەر ئەوەیە هێشتا بە تەواوی لە کونە تەنگ و بچووکەکانماندا هەست بە ئاسوودەیی ناکەین. وەک کەسانی تایبەتمەند کە ئێستا هەین، هەست بە ناتەواوی، لاوازی و ئامادە بۆ پەلاماردان دەدەین. بۆ نموونە کەسێک کە بەڕێوەبەری بەشی پەیوەندییەکانە و ڕەنگە شانازی زۆریش بە خۆیەوە بکات، هەندێکجار لە بەرامبەر پیشەکەیدا هەست بە تەریقبوونەوەوە و تەنانەت بە شەرمەزاریش دەکات. پێیوایە ئەگەر لە شتێکی بواری تایبەتمەندییەکەی خۆی تێنەگەیشت ئەوا دەبێت داوای لێبووردن بکات. ئەمە لە کاتێکدا سروشتیترین شتە لە دونیادا.

ئێتر کاتی ئەوەیە لە خەیاڵپڵاوی بوون بە کەسێکی گشتگرا بووەستین. بۆ ماوەی دە ساڵ تاکە ڕێگا بۆ سەرکەوتنێکی لێهاتووانە- هەروەها بۆ سەرکەوتن لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە- لە ڕێگەی تایبەتمەندیگەرایانەوە بووە. لە ماوەی ئەو کاتەدا، دوو شت ڕوویانداوە کە هیچ کەس نەیدەتوانی پێشبینییان بکات. جیهانگیری ئەو کون و کەلەبەرە بچووکانەی کە پێشتر لە ڕووی جوگرافییەوە لە یەکتر دوورکەوتبوونەوە تێک و پێکدا بەسەر یەکدا. گۆرانیبێژێک لە شارێکدا، گۆرانیبێژێکی دیکە لە شارێکی دیکەدا، هەردووکیان کە پێشتر داهاتێکی ئیسراحەتیان پەیدا دەکرد و هەرگیزیش ڕێیان نەدەکەوتە ڕێی یەکتر، لەناکاو خۆیان لە هەمان پیشەی ئیسراحەتدا- کە ئێستا جیهانگیرییە- دۆزییەوە، سووپاس بۆ گەیشتنی شریتە تۆمارکراوەکان. سەرتاپا بە یەکجار، دونیا پێویستی بە چەندین گۆرانیبێژ نەما. سێ دانە بەس بوو،

کاریگەری "براوە هەمووشتێک لەگەڵ خۆی دەبات" سەری گەیشت بە نایەکسانییەکی جیاواز لە داهاتدا. چەند سەرکەوتوویەکی کەم دەستیان بەسەر سەرتاپای بازاڕدا گرت، ئەمە لە کاتێکدا ئەو زۆرینەیەی مابوونەوە دابەزێندرابوونە ئاستێکی نزم و کەنار خرابوون.

شتێکی دیکەش ڕوویدا. پیشە ئیسراحەتەکان بەشێوەیەکی بێکۆتایی دەستیان بە دابەشبوون بۆ کاری نیمچە ئیسراحەت و نیمچە-نیمچە ئیسراحەت کرد. ژمارەی تایبەتگەراکان وەک ناپاڵم تەقییەوە. ئەوەی پێشتر لە سنورێکی هەرێمیدا دوور لە یەک بوون، بەڵام لە ڕووی پرۆفێشناڵی و لێهاتووییەوە یەکیان گرتبوو، ئێستا لەسەر ئاستی جیهانی یەکیان گرتووە، بەڵام لە ئاستە پرۆفیشناڵی و لێهاتووییەکەوە لێکدابڕاو و جودان. کێبڕکێی نێوان ئەم بوارانە زۆر گەورەیە، ژمارەی ئەو بوارانەش بە هەمان شێوە هەر وەهان. کێڤن کیلی دەڵێت" ئەگەر هەوڵنەدەیت لەسەر ڕێگا و نانی کەسێکی تر براوە بیت، ئەوا بەئەندازەی ناکۆتا براوە هەیە."

ئەمە بە لای من و تۆوە واتا چی؟ یەکەم: زۆرجار ئێمە بەشێوەیەکی تەواو توند تایبەتمەندی ناکەین و خۆمان بۆ بوارێک تەرخان ناکەین، کاتێکیش کەسانی دیکە بەسەرماندا سەردەکەون بە سەرسوڕمانەوە کاردانەوەمان دەبێت. بۆ نموونە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بوون بە ڕادیۆلۆجیست -پزیشکی تیشک- لە نەخۆشخانەیەکدا، لە ڕاستیدا تەنها کاتێک سوودی هەیە کە ئەگەر بەنیازبیت ببیت بە تایبەتمەند لەو بوارەدا- ڕادیۆلۆجیستی ناوەکی، ڕادیۆلۆجیستی چارەسەری پزیشکی، ڕادیۆلۆجیستی دەماری یان ئەوانەی لەو شێوەیەن. کەواتە تەنها

پەیوەست مەبە بە بوارەکەی خۆتەوە، بەڵکو لە خۆت بپرسە بە تەواوی ئەو بوارە چییە. ئەمە بەو مانایە نایەت کە ناکرێت ناوبەناو سەر لە کۆگاکەی خۆت دەربهێنیت، بەڵکو دەتوانیت چەندین بابەتی بەسوود لە بوارەکانی ترەوە لە ڕێگەی بەراوردکردنەوە بەدەستبهێنیت. تەنها لەوە دڵنیابە کە ئەوە بە چاولێبوونێک لە کونیلەکەی خۆتەوە، لە -بازنەی پێشبڕکێ-ی خۆتەوە دەکەیت. (سەیری بەشی ١٤ بکە.)

دووەم: ئەگەر باشترین بیت لە بازنەکەی خۆتدا-مەبەستم لە هەر چوارقوڕنەی جیهانیشە- ئەوا کاریگەری "براوە هەمووشتێک لەگەڵ خۆی دەبات"یارمەتیت دەدات لێی بێیتە دەرەوە. ئەگەر بەو شێوەیە نەبوو، ئەوا دەبێت زیاتر لەو بوارەدا قاڵ ببیتەوە. ئەگەر دەتەوێت بەسەر براوەکەدا زاڵ بیت، ئەوا دەبێت لە کێبڕکێی خۆت بەردەوام بیت.

سێیەم و کۆتاییش: واز لە کۆکردنەوەی ئەو هەموو زانیارییانە بهێنە کە بەو هیوایەی دەتەوێت پێشکەوتن لە ئەگەرەکانی بەردەم پیشەکەتدا بکەیت دەتوانیت کۆیان بکەیتەوە. بە کورتی و بە پوختی، چیتر سوود زانیاری گشتیدا نییە. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا "کۆکردنەوەی زانیاری گشتی" تەنها وەک خوویەک سوودی هەیە. کەواتە پشوو بدە و ئەگەر هەر لە بنەڕەتەوە حەزت لێیە کتێبێک لە بارەی مرۆڤی چاخی بەردینەوە بخوێنەرەوە. بەس وریابە خۆت نەبێت بە یەکێک لەوان.

٤٦

## ململانێ لە پێناوی چەکدا

## بۆچی دەبێت خۆمان لە گۆڕەپانی جەنگ بپارێزین؟

ئەو جۆرە دوکانی لەبەرگرتنەوانەت لە بیرە کە دە بۆ بیست ساڵێک پێش ئێستا هەبوون؟ شوێنێکی سادەبوون و چەند ئامێرێکی هاکەزایی لەبەرگرتنەوەیان تێدابوو. لە هەندێکیاندا هەر بۆ خۆت دەتتوانی ئەو ئامێرانە لە ڕێگەی دینارێک خستنە کونێکەوە بەکاربهێنیت. ئەمڕۆ دووکانی لەبەرگرتنەوەکان شتێکی تەواو جیاوازن. زیاتر وەک چاپخانەی بچووک وان، چاپی ڕەنگاوڕەنگ و سەدان جۆر کاغەزی جیاوازت بۆ پێشنیار دەکەن. پەڕەکان بە ئامێر و مەکینەی زۆر تەکنیک بەرزدا تێدەپەڕن- بەرگ ڕەق و بەرگ تێگیراویشن، ئەگەر ئەوە ئەوە بێت کە تۆ دەتەوێت. ئێستا ڕەنگە وایدابنێیت، کە ئەم دەستکەوتە سەرسوڕهێنەرە تەکنەلۆجیاییانە سوودێکی گەورەی بە قازانجی خاوەن ئەو دوکانانە گەیاندووە، بەڵام بەداخەوە وانییە. قازانجەکەیان هەر پێشتر نزم بووە، لە

ڕاستیدا بگرە خراپتریش بووە. کەواتە بەهای ئەم ئامێرە گرانبەهایانە دەچێتە گیرفانی کێوە؟

زۆربەی گەنجەکان باوەڕیان وایە ڕۆیشتن بۆ زانکۆ کارێکی پێشوەختەیە بۆ بەدەستهێنانی پیشەیەکی درەوشاوە، دەستکردنیشە بە وەرگرتنی موچەیەک کە بۆ ئەوانەی زانکۆیان تەواو کردووە بەرزترە وەک لە چاو ئەو کەسانەدا کە بڕوانامەیان نییە. بۆ ئەوەی باڵانسێک لەم نێوەندەدا ڕابگرین، دوای لابردنی ئەو تێچووەی سەرفیان کردوە لەگەڵ ئەو کاتەی لەو ماوەیەدا لە بەدەستهێنانی بڕوانامەدا خەریکبوون، زۆربەی خوێندکاران بارودۆخیان هیچ باشتر نییە و بگرە خراپتریشە لەو هاوتەمەن و هاوئاستانەی خۆیان کە کەمتریان خوێندووە. کەواتە ئەم پرۆسە گرانبەها و کاتلەناوبەرە چ جۆرە بەهایەک زیاد دەکات؟

دوای پڕ فرۆشترین کتێبی منداڵانی بە ناوی "سەرکێشییەکانی ئەلیس لە سەرزەمینی خەیاڵەکاندا- لویس کارۆڵ پاشکۆیەکی بۆ ئەم بەرهەمە بە ناوی "لە چاویلکەیەکی بیناییەوە"، لە ساڵی ١٨٧١ دا نوسی. لە ناو ئەو کتێبەدا شاژنی سوور (کە بەشێکە لە یاری شەترەنج) بە "ئەلیس"ی بچووک دەڵێت" خۆ دەیبینیت، ئێستا لێرەدا بۆ ئەوەی لە هەمان شوێن بمێنیتەوە، دەبێت هەموو ئەو ڕاکردنانە ڕابکەیت کە دەتوانیت." لە کردنی ئەم کارەدا بە دروستی وەسفی ئەو گۆڕانکارییە بەردەوامە دەکات کە دوکانی لەبەرگرتنەوە و خوێندکارەکان کەوتوونەتە داوییەوە. هەر دوو حاڵەتەکە بە جۆرێک لە جۆرەکان لە - ململانێ لە پێناوی چەکدا- لە خۆ دەگرێت. لە

بنەڕەتدا زاراوەیەکی سەربازییە، ئەو گۆڕانکارییە بەردەوام شاراوە بێمتمانەییەی لە هەموو شوێنێک دەبینرێت: خەڵکی ناچارن خۆیان چەکدار بکەن، چونکە خەڵکی دیکەش هەمان شت دەکەن- تەنانەت ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی سەیری بکەین، سەرتاپای پرۆسەکە بێمانایە.

با بگەڕێینەوە بۆ دوو نموونەکە و یەکسەری پرسیاریان لە بارەوە بکەین: چی بەسەر بەهای ئەو پارە وەبەرهێنراوەدا دێت؟ بەڵێ، بەشێکی دەچێت بۆ کڕیارەکان، بەڵام بەشی سەرەکی دەڕوات بۆ کەسانی خاوەن ئامێری کۆپی و زانکۆکان. جۆن کاسیدی لە ڕۆژنامەی نیویۆرکەر دا نوسیویەتی"ئەگەر بەنزیکەیی هەمووان بڕوانامەی زانکۆیان هەبێت، ئەوا بە دەستهێنانی بڕوانامەیەک هیچ جیاوازت ناکات لە خەڵکانی دی. بۆ ئەوەی ئەو پیشەیە بەدەستبهێنیت کە دەتەوێت، ڕەنگە پێویستت بەوە بێت بچیت بۆ کۆلێجێکی خەیاڵی -گرانبەها- یاخود بڕوانامەیەکی بەرزتر بەدەستبهێنیت."

ئەو کەسانەی لە - ململانێ لە پێناوی چەکدا- گیریان خواردووە بەدەگمەن درکی پێدەکەن. ئەو شتانەی لە ناوەوەن کە لە هەموو هەنگاوێک و هەموو وەبەرهێنانێکدا کاتێک لێکۆڵینەوە لە خۆی دەکات دەردەکەوێت هەستی پێبکرێت، بەڵام لە باڵانسە گشتییەکەیدا یان دەبێت بە هیچ یاخود دەبێت بە شتێکی نەرێنی. بۆیە باش سەیرێکی چوار دەوری خۆت بکە. ئەگەر بە پێچەوانەی پێشبینییەکانەوە، خۆتت لە بازنەی - ململانێ لە پێناوی چەکدا- دۆزییەوە، لێی وەرە دەرەوە. گەرەنتی ئەوەت دەکەم ژیانێکی باش لەوێ نادۆزیتەوە.

بەڵام چۆن دێیتە دەرەوە؟ هەوڵبدە بوارێکی چالاکی بدۆزیتەوە - ململانێ لە پێناوی چەکدا- دزەی نەکردبێتە ناوی. کاتێک وام دانا لەگەڵ چەند هاوڕێیەکمدا کۆمپانیای -ئەبستراکت- دابمەزرێنم، یەکێک لە پەیڕەوەکانمان ئەوە بوو خۆمان لە مامەڵەی - ململانێ لە پێناوی چەکدا- بپارێزین. بە دەربڕینێکی کرداری، ئەمە بەو مانایە هات کە ئێمە قوژبنێکمان دۆزییەوە کە هیچ کێبڕکێیەکی تێدا نەبوو، بۆ ماوەی دە ساڵ زیاتریش، بەو دەرەنجامە گەیشتین کە ئێمە تاکە سەرچاوەی دابینکردنی کتێبە گشتییەکان بووین- بارودۆخێکی زۆر ناوازە بوو.

لە بەشی ٤٥ دا مشومڕی گرنگی تایبەتمەندبوونمان کرد. کەچی تایبەتمەندبوونیش بە تەنیا بەس نییە، چونکە تەنانەت لەو قوژبنە بچووکانەشدا، دەتوانیت زۆر جار سەرتوێژی - ململانێ لە پێناوی چەکدا-ی شاراوە هەڵبدەیتەوە. تۆ پێویستت بە قوژبنێکە کە تێیدا بتوانیت بە ئاسودەیی و بە هێمنی کارەکانی خۆتی تێدا ڕایی بکەیت، بەڵام ئەوەش دەبێت خاڵی بێت لە کاروباری کاردانەوە - ململانێ لە پێناوی چەکدا-.

گەر سەیر بکەیت لە ژیانی کارکردنی چەندین کەسیشدا دەتوانیت ببینیت ململانێ و کاردانەوە چ ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە. تا زیاتر هاوپیشەکەت کار بکات، ئەوا دەبێت تۆش زیاتر کار بکەیت بۆ ئەوەی لە کاروان جێنەمێنیت. کەواتە لە کۆتاییدا بە خاڵێک زۆر لە پشت ئەو بەرهەمهێنانەیە کە لە بەشی پێویستەوەیە. ئەگەر ئێمە خۆمان بە باو و باپیرانی ڕاوشکارمان بەراورد بکەین، ئەوا بۆمان

بەردەکەوێت ئەوان لە ماوەی هەفتەیەکدا پانزە بۆ بیست کاتژمێر کاریان کردووە. ئەوەی ماوەتەوە کاتی ئیسراحەت و پشوویان بووە. دەڵێت بەهەشتە بۆ خۆی- بە بێ ململانێ لە پێناوی چەکدا ئێمەش دەتوانین هەمان کار بکەین. هیچ جێگای پرسیار و مشتومڕ نییە کە ئەنسرۆپۆلۆجیستەکان -ئەو کەسانەی لە ڕەگەز و مێژووی مرۆڤ دەکۆڵنەوە-بە سەردەمی ڕاوشکار دەڵێن" کۆمەڵگای دەوڵەمەندی ڕاستەقینە." ململانێی لە پێناو کەلوپەل و پێداویستی و خاوەندارێتیدا لە ڕاستیدا هەرگیز شوێنی لەق نەبووە و لەناونەچووە، چونکە لەو ڕۆژگارانەدا بە تەواوەتی جێگیر نەبوون شوێنپێیان قایم نەبووە. کۆچەری بوون و چەندین شتیان هەبوو کە لەگەڵ خۆیاندا بۆیان نەدەگێڕدرا- تیر و کەوان، کوڵکی ئاژەڵان، منداڵی بچووک. ئایا هەستیان دەکرد حەزیان لەوە بێت خۆیان زیاتر بارگران بکەن؟ نا، سووپاس. هەر سووک و ئاسان سیستەمێکی پاداشتی پێویست لە شوێنی - ململانێ لە پێناوی چەکدا-. نەبوو.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا شتەکان جیاوازن، نەک تەنها لە شوێنی کارکردندا، بەڵکو تەنانەت لە ژیانی تایبەتی و کەسی خۆشتدا، ئەگەر وریا نەبیت، ئەوا لە کۆتاییدا قاچت دەچەقێتە قوڕاو و لیتاوێکی خەستی - ململانێ لە پێناوی چەکدا-. تا خەڵک زیاتر لە تۆڕی کۆمەڵایەتی تویتەر تویت بکەن، ئەوا بۆ ئەوەی ئاگادار بمێنیت لە تۆڕی کۆمەڵایەتی تویتەر دا، تۆش دەبێت زیاتر تویت بکەیت. تا خەڵکی زیاتر هەوڵ لەگەڵ لاپەڕەکانی -فەیسبووک-یاندا بدەن، ئەوا دەبێت تۆش هەوڵی زیاتر بدەیت، تا لە ناپەیوەستی تۆڕە

کۆمەڵایەتییەکاندا لە بیر نەچیتەوە. تا هاوڕێی زیاترت نەشتەرگەری جوانکاری بکەن، تۆش زووتر هەست بە فشاری دەروونی دەکەیت بۆ ئەوەی خۆت بخەیتە بەر میهری چەقۆ و نەشتەر. هەمان شت بۆ بواری جلوبەرگ، کەمالیات، ڕووبەری باڵەخانەکەت، لەشجوانی، بەدووکەوتنی وەرزشەکان وەک (ماراسۆن، نمایشی وەرزشی...) توانا ئەسپی ئۆتۆمۆبیلەکەت و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەت ڕاستە.

ملیۆنان لێکۆڵینەوەی زانستی بڵاو دەکرێنەوە. سەد ساڵ لەمەو پێش (لە سەردەمی ئەلبێرت ئەنشتاین دا)، ڕێژەکە یەک لە سەدی ئەوەش نەبوو. کەچی ڕێژەی پێشکەوتنە زانستییەکان بەنزیکەیی بەشێوەیەکی نەگۆڕ ماوەتەوە. تەنانەت لە بواری زانستەکانیشدا، کاردانەوەی شاراوەی - ململانێ لە پێناوی چەکدا- ڕۆڵی خۆی هەیە. کەسە ئەکادیمییەکان لەسەر بنەمای ژمارەی ئەو توێژینەوە زانستییانەی چاپیان کردووە و ڕێژەی ئەو توێژینەوانەی وەک سەرچاوە تێیاندا بەکارهاتوون، پارەیان دەدرێت و پلەیان بەرز دەکرێتەوە. تا لێکۆڵەری زیاتر لێکۆڵینەوە بڵاو بکەنەوە، ئەوا ئەوان بەشێوەیەکی زیاتر وەک سەرچاوە ناویان دەهێندرێت، ئەوا دەبێت هەموو کەس زیاتر بۆ ئەوەی لە کاروان جێنەمێنێت چاپ بکات. ئەم پێشبڕکێیە تەنها بۆ بەدواکەوتنی زانست بە توندی پێکەوە بەستراون. قازانجکەرەکان ڕۆژنامە ئەکادیمییەکانن.

ئەگەر پەرۆشی پیشەیەکیت بۆ نموونە مۆسیقاژەنی، لەژێر هیچ بارودۆخێکدا پیانۆ و کەمانچەژەن هەڵمەبژێرە. پیانۆژەن و

کەمانچەژەنەکان دڵتەنگترین مۆسیقاژەنی سەر ئەم هەسارەیەن، چونکە فشاری پێشبڕکێکە لە ناو ئامێرە مۆسیقییەکاندا دڵڕەقانەترینە. بەردەوامیش لە زیادبووندایە، چونکە لە سەرتاسەری دونیادا هۆڵی کۆنسێرتەکان هەموو ساڵێک جمەی دێت لە کۆمەڵەی هونەری نوێ پیانۆژەن و کەمانچەژەنەکانی زۆر بەهرەمەند کە لە کیشوەری ئاسیاوە هاتوون. واباشترە ئامێرێکی ئیسراحەت هەڵبژێریت. کە دۆزینەوەی پێگەیەک لە ئۆرکێسترادا ئاسانتر بێت، تەنانەت ئەگەر لە کۆمەڵەیەکی جیهانیشدا نەبیت خەڵک هەر بە توانا و لێهاتووییەکەت سەرسام بێت. وەک پیانۆژەن و کەمانچەژەن، هەمیشە خۆت بە لانگ لانگ و ئان سوفی موتەر بەراورد دەکەیت. تۆش خۆت بەراورد دەکەیت و ڕۆحی خۆت زیاتر وێران دەکەیت.

سەرەنجام؟ هەوڵبدە لە مامەڵەی کاردانەوەی - ململانێ لە پێناوی چەکدا- هەڵبێیت. ناسینەوەی سەختە، چونکە هەموو کەسێک کاتێک هەنگاو دەنێت هەنگاوەکەی خۆی بە لاوە ئەقڵانییە. کەواتە زوو زوو لە مەیدانی جەنگ بکشێرەوە و لەسەرەوە چاودێری بکە. مەبە بە قوربانی ئەو شێتییە. ململانێ لە پێناوی چەکدا درێژەوەبووی سەرکەوتنێکی پڕ چەرمەسەرییە، باشترین بژاردەشت ئەوەیە تا بۆت دەکرێت خۆتی لێلابدەیت. تەنها لە شوێنێکدا ژیانێکی باش دەدۆزیتەوە کە خەڵکی شەڕی لەسەر نەکەن.

٤٧

## هاوڕێیەتی کەسە نامۆکان بکە.
## دورخراوەکان بناسە، بەڵام خۆت مەبە بە یەکێک لەوان.

"لەسەر داخوازی فریشتەکان، هەروەها بە فرمانی مرۆڤە مەزنەکانیش، باروک دی ئیسپینۆزا مەحکوم، بەنەفرەت، دەربکەن... شەو و ڕۆژ نەفرەتی لێبێت، کاتێک دانیشتووە و کاتێکیش هەستاوەتە سەر پێ هەر نەفرەتی لێبێت، کاتێک دەچێتە دەرەوە، کاتێکیش دێتە ژوورەوە نەفرەتی لێبێت. خودا لێینابووریێت...ئێمە فرمان دەکەین هیچ کەس نە بە زارەکی نە بە نوسین گفتوگۆی لەگەڵ نەکات، هیچ چاکە و نەرمونیانێکی بەرامبەر پیشان نەدات و لەژێر هەمان میچ یاخود چوار باوڵدا لەگەڵی نەمێنێتەوە. هیچ شتێکیش کە ئەو نوسیویەتی و دایڕشتووە نەخوێنێتەوە."

لە ڕێگەی ئەم فرمان دەرکردنەوە- کە لە ساڵی ١٦٥٦ چاپکرا و بە شێوازێک کە چوار هێندە درێژتر و پێنج جار ڕەق و زبرتر بوو- سپینۆزا ی تەمەن بیست و سێ ساڵ کە بەشێوەیەکی توند پێیانەوە

پابەند بوو لە ئەمستەردام لە کۆمەڵگەی جولەکەیی کرایە دەرەوە. لە بەرزترین ئاستی فەرمیدا وەک دەرکراوێک ناوزەد کرا. هەرچەندە سپینۆزا شتێکی وەهای بڵاونەکردبووەوە بگاتە ئەو ئاستەی تێڕوانینی بیرکردنەوەی ئازادی ڕۆشنبیری گەنجەکان بیخەنە ئەو ئاستەی کە پێکدادانی لەگەڵ بنەما و دامەزراوەکانی ئاییندا هەبێت. ئەمڕۆ سپینۆزا وەک یەکێک لە مەزنترین فەیلەسوفەکانی هەموو سەردەمەکان سەیر دەکرێت.

ڕەنگە ئێمە بەم لەکۆمەڵگا دەرکردنە پێبکەنین، بەڵام ڕەنگە سپینۆزا-ی داماو زۆر بە پێکەنینهێن نەیبینیبێت. بیهێنە بەر چاوی خۆت ئەگەر دەسەڵات لە هەموو ڕۆژنامە و تەختەی ڕاگەیاندن و لە هەر هەموو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بە نەفرەتت بکات، بە هەموو هۆکارێکیش لە هەموو شوێنێکدا بڵاوبکرایەتەوە تا دڵنیاببنەوە کە هیچ کەس دەستی پێتڕانەگات و قسەت لەگەڵ نەکات. بەدڵنیاییەوە ئاساندوویەتی.

ئەگەر ئەندامی دامەزراوەیەکی بازرگانی بیت، ئەوا هەموو سوودەکانی ئەندامبوون دەزانیت. ئەوا داخڵبوونی خۆڕایت بۆ ناو ئاسانکاری و هاوکارییەکانی دامەزراوەکە دەبێت کە تێیدا قەنەفەی قوڵداری ئاوریشمی لێیە و بە ئیسراحەت خەوت لێدەکەوێت لەسەری، سەر مێزەکانیش دوایین گۆڤارەکانیان لێ بڵاوکراوەتەوە، هەمیشەش کەسێک دەدۆزیتەوە تا دەمەتەقێیەکی شیاوی لەگەڵ دا بکەیت. لەبنەڕەتدا سەرتاپای ژێرخانە ئابوورییەکە بۆ ئەوە دامەزراوە تا پێداویستییەکانی تۆ پڕ بکاتەوە و قایلیان بکات.

زۆربەی خەڵکی ئەندامی یەک یاخود دوو "دامەزراوەن"- وەک کارمەندانی کۆمپانیایەک، قوتابیانی قوتابخانەیەک، پرۆفیسۆرەکانی زانکۆکان، هاولاتیانی شارێک، ئەندامانی ڕێکخراوێک...هتد. هەموو ئەو کۆمەڵانە چاویان بە پێداویستییەکانی ئێمە دەکەوێت، ئاسوودەبووین تێیاندا. هەست دەکەین چاوێکیان لێمانەوەیە.

کەچی هێشتا چەندین کەس هەن ئەندامی هیچکام لەو دامەزراوانە نین. یان بە مەبەست خۆیانی لێدەبوێرن، یاخود هەر لە یەکەم هەنگاوەوە نەچوونەتە ناوی، یان وەک سپینۆزا بە نوکە شەقێک کراونەتە دەرەوە. زۆربەی ئەم کەسە دەرکراوانە شێتن، بەڵام هەموویان نا. ناوبەناو یەکێک لەم دەرکراوانە دەبێت بە کەسێک هەنگاوێک بەرەو پێشەوە تەکان بە دونیا دەدات، هەر خۆشیان هەموو ئەرکەکە لە ئەستۆ دەگرن. ژمارەی ئەو پێشکەوتنانەی لە زانست، ئابووری، ڕۆشنبیریدا کە دەدرێنە پاڵ دەرکراوەکان تووشی سەرسوڕمانت دەکات. بۆ نموونە ئەلبێرت ئەنشتاین نەیتوانی پیشەیەک لە زانکۆ بدۆزێتەوە، ئەویش ڕۆیشت مافی کردنەوەی دیدەنگەیەکی لە ئاستی سێیەمدا بەشێوەیەکی فەرمی لە شاری بێرن وەرگرت و لە کاتە بەتاڵەکانیدا شۆڕشێکی لە بواری فیزیادا کرد. دوو سەد ساڵ پێش ئەوە، نیوتن گەشەی بە یاسای هێزی ڕاکێشانی زەوی دا و لقێکی تەواوی لە بواری بیرکاریدا داهێنا، هەرچەندە دامەزراوەکەی (کۆلێجی ترینیتی[٥٤]، لە کامبریج) بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعونە ڕەشەوە بەزۆر ناچاری داخستن

[٥٤]- ترینیتی: لێرەدا کە ناوی کۆلێجەکەیە, لە بنەڕەتدا واتە سێ خودایی کە لە ئایینی مەسیحییەتدا هەیە, باوک, کوڕ, ڕۆحی پیرۆز.

زۆربەی خەڵکی ئەندامی یەک یاخود دوو دامەزراوەن"- وەک کارمەندانی کۆمپانیایەک، قوتابیانی قوتابخانەیەک، پرۆفیسۆرەکانی زانکۆکان، هاوڵاتیانی شارێک، ئەندامانی ڕێکخراوێک...هتد. هەموو ئەو کۆمەڵانە چاویان بە پێداویستییەکانی ئێمە دەکەوێت، ئاسوودەبووین تێیاندا. هەست دەکەین چاوێکیان لێمانەوەیە.

کەچی هێشتا چەندین کەس هەن ئەندامی هیچکام لەو دامەزراوانە نین. یان بە مەبەست خۆیانی لێدەبوێرن، یاخود هەر لە یەکەم هەنگاوەوە نەچوونەتە ناوی، یان وەک سپینۆزا بە نوکە شەقێک کراونەتە دەرەوە. زۆربەی ئەم کەسە دەرکراوانە شێتن، بەڵام هەموویان نا. ناوبەناو یەکێک لەم دەرکراوانە دەبێت بە کەسێک هەنگاوێک بەرەو پێشەوە تەکان بە دونیا دەدات، هەر خۆشیان هەموو ئەرکەکە لە ئەستۆ دەگرن. ژمارەی ئەو پێشکەوتنانەی لە زانست، ئابووری، ڕۆشنبیریدا کە دەدرێنە پاڵ دەرکراوەکان تووشی سەرسوڕمانت دەکات. بۆ نموونە ئەلبێرت ئەنشتاین نەیتوانی پیشەیەک لە زانکۆ بدۆزێتەوە، ئەویش ڕۆیشت مافی کردنەوەی دیدەنگەیەکی لە ئاستی سێیەمدا بەشێوەیەکی فەرمی لە شاری بێرن وەرگرت و لە کاتە بەتاڵەکانیدا شۆڕشێکی لە بواری فیزیادا کرد. دوو سەد ساڵ پێش ئەوە، نیوتن گەشەی بە یاسای هێزی ڕاکێشانی زەوی دا و لقێکی تەواوی لە بواری بیرکاریدا داهێنا، هەرچەندە دامەزراوەکەی (کۆلێجی ترینیتی[٥٤]، لە کامبریج) بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعونە ڕەشەوە بەزۆر ناچاری داخستن

---

٥٤- ترینیتی: لێرەدا کە ناوی کۆلێجەکەیە, لە بنەڕەتدا واتە سێ خودایی کە لە ئایینی مەسیحییەتدا هەیە, باوک, کوڕ, ڕۆحی پیرۆز.

کراو دوو ساڵ لە دەرەوەی شار ژیا. چارلس داروین کە لێکۆڵەرێکی سەربەخۆ بوو، هەرگیز موچەی لە دامەزراوەیەکەوە وەرنەگرت، هەرگیزیش وەک پرۆفیسۆر و مامۆستای زانکۆ دانەمەزرا. مارگارێت تاچەر کە یەکێک بوو لە بەهێزترین سەرۆک وەزیرانەکانی بەریتانیا، ژنی ماڵەوە بوو، بێ ئەوەی هیچ پاشخانێکی هەبێت هەڵتۆقییە سەر شانۆی سیاسی وڵات. جاز کە ژانرێکی مۆسیقییە سەرتاپای لە لایەن کەسە دەرکراوەکانەوە دامەزرێنرا. مۆسیقای -ڕاپ-یش بە هەمان شێوە. لیستی نوسەر، بیرمەند، هونەرمەندە مەزنەکان پێکدێت لە ژمارەیەکی بێئەندازە کەسانی یاخی: کلێیست، فرەدریک نیچە، ئۆسکار وایلد، لیۆ تۆلستۆی، سۆلژێنیتسم، گاوگین. با لە بیریشمان نەچێت کە دامەزرێنەری هەموو ئایینەکان، بێ جیاکاری کەسانی دەرکراو بوون. بەدڵنیاییەوە نامانەوێت زیاد لە پێویست مەزەندەی ڕۆڵ و کاریگەری "ژنە مەزنەکان" و "پیاوە مەزنەکان" بکەین،(هەر وەک لە بەشی ١٤ دا بینیمان). ئەگەر ئەوانیش نەبوونایە، ژن و پیاوی دیکە دەهاتنە شوێنیان و هەمان کاریگەری نایابیان دەبوو. هەرچەندە خاڵە سەرەکییەکە ئەمەیە: دەرکراوەکان مەیلی ئەوەیان هەیە خێراتر بن و هەر لەبەر ئەوەش کاریگەرییەکی زووتریان وەک لە کەسە دەرنەکراوەکانیان هەبێت.

دەرکراوەکان چێژ لە تاکتیکێکی سوودبەخش دەبینن. پێویست ناکات پەیوەستی بنەما دامەزراوەکانەوە بن، کە ئەمە خاویان دەکاتەوە. پێویست ناکات خەریکی ئەو شتە بێکەڵکانە بن کە بەشێوەیەکی هەمیشەیی و جێگیر لە زۆربەی دامەزراوەکاندا ڕەگی

داکوتاوە. پێویست ناکات بیرۆکەکانی خۆیان بە سلایدە بینراو و مۆدێرنەکان و لە هەمان کاتدا گاڵتەجارەکانی پاوەر پۆینت لە کەلک بخەن. ئەوان دەتوانن خۆیان لەو جۆرە هێزە مێشک ئازاردەرانە لابدەن کە لە دانیشتنێکدا فیلّت لێدەکەن. بە خۆشحاڵییەوە دەتوانن خۆیان لەو کۆبوونەوەیە لابدەن، یان دەتوانن بەشداری لەو بۆنانەدا بکەن، تەنها بۆ ئەوەی " ڕووی خۆیان پیشانبدەن"، لەبەر ئەوەی هەرگیز لە یەکەم شوێندا بانگهێشت نەکرابوون. پێویست ناکات لەترسی وەدەرنان لە ڕووی سیاسییەوە ڕێیان دروست بێت، چونکە ئەوان خۆیان پێشتر دەرکراون.

سودێکی تر: پێگە ڕۆشنبیرییە دوورەپەرێزەکەیان سەرنجدانیان سەبارەت بە دژێتی و کورتهێنانی سیستەمە باوەکە تیژ دەکاتەوە، کە ئەندامانی دامەزراوەکە کوێرن لە بارەیەوە. دەرکراوەکان قوڵتر سەیر دەکەن، ئەمە بەو مانایە دێت کە ڕەخنەگرتنەکەیان لە بارودۆخە چەقیوەکە تەنها ڕووکەش نییە، بەڵکو بنچینەییە.

چەندین بیرۆکەی ڕۆمانتیکی لە بارەی ژیانکردن وەک دەرکراوێکەوە هەیە- بەڵام هەڵەی وا نەکەیت خۆت ببیت بە یەکێک لەوان. چونکە هێزەکانی کۆمەڵگا لە دژت ڕیز دەبەستن. ڕەشەباکە توند و بێبەزەیی دەبێت. لە ڕووی کردارییەوە دەرکراوەکان دونیا تێکیشکاندوون، چەندی لە توانایاندا بێت و بۆیان بکرێت دژایەتیان دەکەن. تەنها کەمینەیەکیان وەک ئەستێرەی کلکدار دەدرەوشێنەوە. نەخێر، ژیانی دەرکراوەکان بابەتی فیلمە، نەک بابەتی ژیانێکی باش.

کەواتە چی بکەین؟قاچێکت بە توندی لە دامەزراوەکاندا

بچەقینە. ئەوان هەموو سوودەکانی ئەندامبوونت لەو دامەزراوەیەدا دەپارێزن. بەڵام لێگەڕێ قاچەکەی ترت بگەڕێ. دەزانم ئەوە کەمێک وەک ئالنگارییەک دەردەکەوێت کە خۆگونجێنییەکی ژیرانەی دەوێت، بەڵام لە ڕووی کردارییەوە باش کاری خۆی دەکات. هاوڕێیەتی دەرکراوەکان بکە. ئەم قسانە هەر بە دەم خۆشن. ئەمانە چەند یاسایەکن بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا بڕۆیت: ١) هیچ مەراییەک مەکە. تەنها بەشێوەیەکی ڕەسەن حەزت لە کارەکەیان بێت. ٢) با هیچ شتێک لەسەر کەرامەتت نەکەوێت. دەرکراوەکان هیچ باکیان بەوە نییە کە ئاخۆ تۆ دکتۆرات هەیە یاخود سەرۆکی دامەزراوەیەکی بازرگانیت. ٣) بەخشندە بە. دەرکراوەکان بە دەگمەن لە شوێنی مەبەستدا ئامادەن. هەندێکجار خۆیان نەشتوە و کراسی ڕەنگاو ڕەنگ لەبەردەکەن. ٤) هەماهەنگی: لەبەرامبەردا هەندێک شتیان پێببەخشە: جا ئەوە هەرچییەک بێت، بیرۆکە، پارە، پەیوەندیکردن بێت.

هەر ئەوەندەی ئەم کاری باڵانس ڕاگرتنەت تەواو کرد، ئینجا ڕێتێدەچێت کە ببیت بە بەشێکی گەیەنەر، هەر وەک بیڵ گەیتس و ستیڤ جۆب بڕیاریاندا بیکەن- هەردووکیان ئەندامی دامەزراوەیەک بوون و پەیوەندییەکی توندوتۆڵیشیان بەو کۆمەڵگا شێتخانەیەی ئالوودەبووەکانی تەکنەلۆجیاوە هەبوو. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بە دەگمەن -بەڕێوەبەرێکی نوسینگەی جێبەجێکردن- دەدۆزیتەوە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ دەرکراوەکاندا هەبێت. جا واز لەوەش بێنە کە زۆربەی کۆمپانیاکان بیرۆکەیان لێبڕاوە.

لە کۆتاییدا وا باشترە وێنەیەکی ڤان کوخ-ت لەسەر دیواری ژوورەکەت هەبێت وەک لەوەی خۆت ببیت بە ڤان کوخ. باشترینی نێوان هەموویان ئەوەیە تا بۆت دەکرێت کارەکانی ڤان کوخ لە دەوری خۆت کۆبکەیتەوە. ئەو تێڕوانینە نوێیانەی دەبن بە بەشێک لە تۆ و یارمەتی ڕێگاکەت بەرەو ژیانێکی باش دەدەن.

٤٨

## کێشەی سکرتێر

## بۆچی قەبارەی نموونەکانمان زۆر بچووکن؟

بابلێین کە تۆ دەتەوێت سکرتێرێک (بڕوانە: یاریدەدەرێکی کەسی) بەکری بگریت. سەدان ژن بۆ ئەو ئەرکە داواکارییان پێشکەش کردووە، تۆ بە پێودانگێکی گوترەیی یەک بە یەک چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکەیت. دوای هەر چاوپێکەوتنێک، دەبێت بڕیارێک بدەیت: ئایا من دەبێت ئەم بەربژێرە بە کری بگرم یاخود ڕەتیبکەمەوە؟ بۆ ئەوەی تا هەموو بەربژێرەکان دەبینیت نە پەشیمان ببیتەوە نە دەستی دەستیشیان پێبکەیت. ئەو بڕیارەی ڕاستەوخۆ دوای چاوپێکەوتنێک دەیدەیت ناتوانیت ڕەتیبکەیتەوە. چۆن بەردەوام دەبیت؟

ئایا تۆ یەکەم بەربژێر کە کاریگەرییەکی لێوەشاوەیی خۆیت لەسەر بەجێدەهێڵێت بە سکرتێر وەردەگریت؟ ئەگەر بەو شێوەیە بێت، ئەوا تۆ ئەو زەرەرە دەکەیت کە باشترین بەربژێر لە دەست بدەیت، چونکە تۆ ڕەنگە تەنها چاوپێکەوتنت لەگەڵ ئەوانەدا کردبێت کە تەنها باشن، یان لە باشترین حاڵەتدا باشترین نەک باشترین. یان

چاوپێکەوتن لەگەڵ سەدا نەوەد و پێنجیان دەکەیت بۆ ئەوەی ئەو هەستەت لا گەلاڵە ببێت تا بزانیت ئاخۆ کامیان بۆ شوێنەکە گونجاو و لەبارن، دواتریش یەکێک لەو پێنج لە سەدایەی ماوە هەڵدەبژێریت کە لە هەموویان زیاتر لە باشترینیان دەچێت کە تا ئێستا بینیبێتت؟ ئەی ئەگەر ئەو پێنج لە سەدایەی کۆتاییش هەموویان نائومێدکەربن چی؟

ئەم پرسیارە لە ناو بیرکارەکاندا بە نیشاندانی نادروستی سیاسی ناسراوە: کێشەی سکرتێر. ئەوەی جێگەی سەرسامییە تەنها یەک چارەسەری باشترین هەیە. دەبێت چاوپێکەوتن لەگەڵ لە سەدا سی و حەوتی سەرەتادا بکەیت و هەمووشیان ڕەت بکەیتەوە، لە هەمان کاتیشدا دەبێت چاودێری چۆنێتی و کوالیتییان بکەیت. دواتر لە چاوپێکەوتنی ئەوانی دیکە بەردەوام دەبیت تا کەسێک دەدۆزیتەوە کە باشترە لە باشترینی نێو سەدا سی و حەوت داواکارەکەی پێشوو. ئەویان بە کرێ بگرە. ئەوا ئەو کات بڕیارێکی نایاب دەدەیت. لەوانەیە ئەویش زۆر باشترینی نێو هەر سەد کەسەکەیان نەبێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەڵبژاردنەکەت هەڵبژاردنێکی پتەو و جێگیر دەبێت. هەموو پەیڕەوەکانی دیکە ئەوەیان پیشانداوە کە بە پێی ئامارەکان دەرەنجامێکی خراپتر بەرهەم دەهێنێت.

ئەم ژمارە سەدا سی و حەوتە واتای چی؟ سی و حەوت ژمارە سەدە کە بەسەر ڕێژەیەکی نەگۆڕدا دابەش دەکرێت ئەویش (٢,٧١٨)یە. ئەگەر پەنجا بەربژێرت هەبووایە ئەوا دەبوو هەژدە کەسی سەرەتا ڕەت بکەیتەوە، ئینجا دواتر دەبوو ئەو کەسە لای

خۆت دابمەزرێنیت کە لە باشترینی هەژدە کەسەکەی پێشوو باشتر بوو.

لەبنەڕەتدا کێشەی سکرتێر بە کێشەی هاوسەرگیریش ناسراوە. پرسیارەکەش ئەمە بوو: دەبێت پێش ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکدا بکەم، دەبێت پێشتر چەند کەس "تاقی بکەم"ەوە؟ بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارەی تەواوی ئەو کەسانەی ڕەنگە لە ژیانتدا هاوسەرگیریان لەگەڵ بکەیت لە پێشەوە نازانرێت، ئەوا ئەو پەیڕەوەی لە سەرەوە باسکرا شتێکی نمونەیی نییە بەکارنایەت. هەر لەبەر ئەوەیە بیرکارەکان ئەم کێشەیەیان ناوناوەتەوە.

ئێستا ژیانێکی باش پرسیاری دروستی و ڕێکی بیرکاری نییە. هەر وەک وارن بەفێت دەڵێت" وا باشترە بە نزیکەیی ڕاست بێت، وەک لەوەی بە تەواوی هەڵە بێت." وارن بەفێت هەر بەم شێوەیە بڕیارەکانی لە بواری وەبەرهێناندا دەردەکات. تۆش دەبێت لە ژیانی کەسێتی خۆتدا هەمان تەکنیک بگریتە بەر. ئەی کەواتە بۆچی کێشەی سکرتێر هەر بابەتێکی پەیوەستە؟ لەبەر ئەوەی هێڵێکیان بۆ دەکێشێت و پێمان دەڵێت کە دەبێت پێش دوایین بڕیار لە بارەی بابەتە گرنگەکانەوە ماوەی چەند کات بە تاقیکردنەوەیانەوە بەسەر ببەین. ئەو تاقیکردنەوانەی لە بارەی -کێشەی سکرتێر- دوە کراون ئەوەیان خستۆتە ڕوو کە زۆرینەی خەڵکی زۆر زوو بڕیار لە بەربژێرێک دەدەن. هەوڵبدە لە بەرامبەر ئەم پاڵنەرەدا خۆت بگریت. هەر کاتێک دێتە سەر هەڵبژاردنی پیشەیەک، کارێک، پیشەسازییەک، هاوبەشێک، شوێنێک بۆ ژیان، نوسەرێکی دڵخوازت،

ئامێرێکی مۆسیقی، وەرزشێکی پەسەند لات، یاخود شوێنێک بۆ پشوویەکی نمونەیی، حەقی خۆیەتی هەر لە سەرەتاوە پێش ئەوەی بڕیاری کۆتایی و یەکلاکەرەوەت بدەیت، بە خێرایی چەندین بژارە تاقیبکەیتەوە- بژاردەی لەوەش زیاتر کە حەزت لێیانە-. پێش ئەوەی هەستێکی بەهێزت هەبێت لەبارەی ئەوەی کە هەیە بیرۆکەیەکی پڕوپوچە، هەڵبژێرە.

بۆچی ئێمە مەیلی ئەوەمان هەیە بڕیاری زوو بدەین؟ ئەم بێ سەبرییەمان لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ نموونە وەرگرتنێکی لە گۆترە کاتی زۆری دەوێت. کە ئێمە بە پێنج چاوپێکەوتن تەواو بین بۆچی سەد دانە بکەین؟ بۆچی پێش ئەوەی شوێنێک هەڵبژێرین تا ئیشی لێبکەین بە دە پڕۆسەی کار پێشکەشکردنی جیاوازدا بڕۆین؟ ئەوە هەوڵ و ماندووبونێکی زۆری دەوێت- زۆر زیاتر لەوەی حەزی لێدەکەین. لەگەڵ ئەوەشدا نموونە وەرگرتن وەک کەتیرە وایە لێت نابێتەوە. ئاسانە خۆت لە ناو دونیای پیشەسازیدا بچەقێنیت، چونکە کاتێک گەنج بوویت سوکوسۆڵ لە بوارەکەدا کەمێک بۆی گەڕاویت. بەدڵنیاییەوە، ڕەنگە شوێنپێی خۆشت تێدا قایم کردبێت، بەڵام بێ هیچ دوودڵی و گومانێکیش هەمان سەرکەوتنت لە شوێنێکی دیکە بەدەست دەهێنا یان ڕەنگە سەرکەوتنی زیاتر و خۆشی زیاتریشت بەدەست بهێنایە- ئەگەر تەنها کەمێک ویستت بۆ ئەزموونەکە هەبووایە. سێیەم هۆکار کە ئێمە دەمانەوێت زۆر بەخێرایی شتەکان هەڵبژێرین ئەوەیە کە ئێمە بەردەوام حەز دەکەین خەیاڵمان ئاسوودە بێت. ئێمە حەز دەکەین سەحێک لە کۆمەڵەکەی

بەردەستمان بدەین و خێرا بچینە سەر لیستێکی دیکە. ئەوە بۆ بڕیارە بێبایەخەکان ئاساییە، بەڵام بۆ بڕیارە گرنگەکان زیانبەخشە.

دایەنەکەمان- کە تەمەنی بیست ساڵ بوو- چەند مانگێکی کەم لەمەو پێش لە دەرگای دا، بەڵام وا دەهاتە پێشچاو هیچ هیوایەکی بەژیان نەمابێت. یەکەمین و تەنهاترین کوڕەیاری (خۆشەویستی کوڕ)ی بەجێهێشتبوو. چاوەکانی لە فرمێسکدا دەدرەوشانەوە و نمیان کردبوو. ئێمە هەوڵماندا لەسەرخۆ و ئەقڵانی بین" تۆ هێشتا زۆر گەنجیت، کاتێکی زۆر و زەوەندەت لەبەردەستدا ماوە! دە بۆ بیست پیاو تاقیبکەرەوە. ئینجا دەزانیت کێی باش و کێی خراپ هەیە. ئینجا بۆت دەردەکەوێت کە بۆ ماوەیەکی درێژ کێ بۆ تۆ گونجاوە و تۆ بۆ کێ گونجاویت." زەردەخەنەیەکی لاواز لەسەر ئەو ڕووخسارە دڵتەنگەی دەرکەوت. پێموانییە توانیبێتمان قەناعەتی پێبکەین، نەک ئەو کات بگرە هیچ کات.

بەداخەوە ئێمە زۆربەی زۆر جار وەک دایەنەکەم مامەڵە دەکەین. قەبارەی نموونەکەمان زۆر بچووکە، بڕیارەکانمان بەپەلە پەلن، یان بە زمانی کەسانی بواری ئامار، نوێنەرایەتی هەمووان ناکات. ئێمە پشت بە وێنەیەکی هەڵەی واقیع دەبەستین، لەو باوەڕەداین کە بە چەند خاڵێکی کەمی لە گۆترەی لە تاقیکردنەوەکەماندا دەتوانین ژن یاخود پیاوی خەونەکانمان، پیشەیەکی نمونەیی، باشترین شوێن بۆ ژیانکردن بدۆزینەوە. بەدڵنیاییەوە ڕەنگە ئەوە بە کەڵک بێت- ئەگەر وابوو، ئەوا من زۆر دڵخۆشم بۆت- بەڵام ئەگەر واشبوو، ئەوا تەنها بەهۆی دەست پەپشتداهێنانێکی چارەنوسێکی باشەوە بووە، نابێت

هیچ کەسێکیش بەهۆی ئەوەوە سەرزەنشتی هیواکانی بکات.

دونیا زۆر لەوە گەورەتر، دەوڵەمەندتر، هەمەچەشنترە کە ئێمە وێنای دەکەین، کەواتە تا گەنجیت هەوڵبدە چەند بۆت دەکرێت نمونە تاقیبکەرەوە. ساڵەکانی سەرەتای گەنجیت پەیوەندی بە پەیداکردنی پارە و بونیادنانی پیشەیەکەوە نییە. بەڵکو پەیوەندییان بە ئاشنابوون بە دونیای ئەگەرەکانەوە هەیە. تا ئەوپەڕی وەرگربە. ئەوەی چارەنوس لە قاپێکدا دەیخاتە بەردەستت تامی بکە. بەشێوەیەکی بەرفراوان بخوێنەرەوە، چونکە ڕۆمان و کورتەچیرۆکەکان نموونەیەکی نایابی هاوتای ژیانن. تەنها کاتێک تەمەنت هەڵدەکشێت دەبێت شێوازی تایبەتی خۆت لە ژیاندا بخەیتە گەڕ و بەشێوەیەکی باڵا لە هەڵبژاردندا وردبیت. ئەو کات دەزانیت حەزت لە چییە و حەزت لە چی نییە.

٤٩

# ڕێکخستنی پێشبینییەکان

## تا پێشبینی کەمتر بکەیت، خۆشحاڵتر دەبیت.

ئێوارەی ساڵی نوێ بوو، ساڵی ١٩٨٧. یەکەمین کچەیاری تا ئێستام شەش مانگ پێشتر بەجێیهێشتبووم و منیش لەوە بەدوا وەک دێوودرنجێکی تەنیا بەسەر زەویدا دەگەڕام. منیش هەر لە ژوورە شڕشێتە پیس و پۆخڵی خوێندکارییەکەمدا مرقم کردبوو(تەنها یەک ژووری بچووک بوو، لە قاتی یەکەمیش لە خوارەوە تەوالێتێکی گشتی لێبوو) یان لە کتێبخانە خۆم دەشاردەوە. نەمدەتوانی بەو شێوەیە بەردەوام بم! پێویستم بە کچەیارێکی نوێ بوو! ڕاگەیاندنێک لەسەرو دەروازەی چوونە ژوورەوەی ڕوڵتی –ڕیستۆرانتێک بوو لە لوسێرن- ئاهەنگێکی بە بۆنەی ئێوارەی ساڵی نوێوە ڕاگەیاند. پێشبینییەکانم زۆر بەرزبوون، جێڵم لە قژمدا بەرزترم لە پێشبینییەکانم کردەوە، بلیتی خۆمم کڕی. ئەمشەو شەوی خۆم بوو.

کاتێک لە جوڵەی سەماکانی ناو دیسکۆکاندا هەر دەهاتم و دەچووم، هەوڵمدەدا نایاب دەرکەوم، وەلێ لەوانەیە زۆر نەشارەزا

بووبم، چاوەکانم بەنائارامی لەمبەر بۆ ئەوبەری ئەو ژوورە پڕ لە چەقەدوکەڵە دەگێڕا. هەموو کچە جوانەکان لەوێ لەگەڵ خۆشەویستەکانیان بوون، زۆر بە دەگمەن جار جار بۆ چەند چرکەیەکی کەم نیوەکەی خۆیانیان بەجێدەهێشت، منیش بزەیەکم تێدەگرتن، ئەوانیش بەشێوەیەک مامەڵەیان دەکرد وەک ئەوەی من هەر لەوێ نەبم. کاتێک خولەکەکان چک چک بەرەو نیوەشەو دەڕۆیشتن، زیاتر و زیاتر هەستم دەکرد کەسێک بەهێواشی چەقۆیەک لە دڵم دەچەقێنێت و هەڵیدەسوڕێنێت. تەنها یەک تۆز پێش نیوەشەو ڕیستۆرانتەکەم بەجێهێشت. ئێوارەکە شێوا. بیست فرانکیش لە پێشتر هەژارتر بووم- کەچی هێشتاش کچێکم بە یار نەگرتبوو.

مێشک بە بێ پێشبینی کار ناکات. هەر لە بنەڕەتدا بیکەم و زیاد مەکینەیەکی پێشبینیکردنە. ئێمە کاتێک زەخت لە دەسکی دەرگایەک دەکەین، پێشبینی ئەوە دەکەین بکرێتەوە. کاتێک بەلوعەیەک دەکەینەوە، چاوەڕێ دەکەین ئاوی لێبێتە دەرەوە. کاتێک سواری فڕۆکەیەک دەبین، پێشبینی ئەوە دەکەین یاساکانی هەوا لە ئاسماندا کاری خۆیان بکەن. پێشبینی ئەوە دەکەین خۆر لە بەیانیاندا هەڵبێت و ئێواران ئاوا ببێت. هەموو پێشبینییەکان لە ناخودئاگاماندان. یاساکانی ژیان ئەوەندە قوڵ لە مێشکماندا هەڵکۆڵراون بە ڕادەیەک پێویست ناکات بەشێوەی چالاک بیریان لێبکەینەوە.

بەداخەوە کاتێک دێتە سەر بابەتە ئاساییەکانیش مێشکمان هەر پێشبینی دەکات، هەر وەک لە ئاهەنگی ئێوارەی ساڵی تازەدا هاتەوە

ماڵەوە بۆ لام. ئەگەر کاتم بە خۆم بدایە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی خودئاگایانە لە پێشبینییەکانم بڕوانم، بەشێوەیەکی واقیعی بیانخەملێنم، ئەوا دەمتوانی خۆم لەو نائومێدییە ڕزگار بکەم.

لێکۆڵینەوەکان ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە پێشبینییەکان کاریگەرییەکی قوڵیان لەسەر بەختەوەری هەیە، پێشبینییە ناواقیعییەکانیش لە نێوان کاریگەرترین هۆکارە شادیکوژەکاندان. یەک نموونە: داهاتێکی بەرزتر حاڵی باش تەنها بۆ نزیکەی ٧٥٠٠٠$ لە ساڵێکدا بەرزدەکاتەوە، لەوە بەدوا پارە هیچ ڕۆڵێکی دیکە لە خۆشبەختیدا ناگێڕێت (سەیری بەشی ١٣ بکە.) تەنانەت لە خوار ئەو ئاستەوە، حاڵی باش دەکرێت بەشێوەیەک دەکرێت نەمێنێت کە وەک پارادۆکس دەردەکەوێت- هەر وەک پاوڵ دۆلان بنەڕەتەکەی دارشتووە، بۆ نموونە ئەگەر پێشبینییەکانم لە بارەی داهاتەوە زۆر خێراتر لە خودی داهاتەکەم بەرز ببنەوە.

کەواتە چۆن بە باشترین شێوە دەست بە پێشبینییەکانەوە بگرین؟ پێشبینی ئەوەت بۆ دەکەم وەک پزیشکێکی فریاکەوتن لە کاتی بڕیاردان لە بارودۆخی نەخۆشێک بیرکردنەوەکانت ڕێک بخەیت. هەمیشە جیاوازی بکە لە نێوان "دەبێت هەمبێت" لەگەڵ "دەمەوێت هەمبێت" و "پێشبینی دەکەم هەمبێت". یەکەم گریێ پێویستبوون دەخاتە ڕوو، دووەم حەز (پەسەندی، ئامانج) سێیەم دانەش پێشبینی. با یەک بە یەک باسیان بکەین.

زۆرجار گوێت لە خەڵکی دەبێت شتی لەم چەشنە دەڵێن" من سەد لە سەد دەبێت ببم بە بەڕێوەبەری نوسینگەی جێبەجێکردن."

یان "دەبێت ئەم ڕۆمانە بنوسم." یان "دەبێت منداڵم هەبێت." نا، پێویست ناکات. لە دوای هەناسەدان، خواردن و خواردنەوە پێوست ناکات هیچ شتێکی دیکە بکەیت. هەندێک حەز و غەریزە هەر لە پێداویستییە بنەڕەتییەکانمانن و تێماندا چەسپیون. لە جیاتی ئەوەی بڵێ "دەمەوێت ببم بە بەڕێوەبەری نوسینگەی جێبەجێکردن." یان "حەز دەکەم ڕۆمانێک بنوسم." یان "ئامانجی من ئەوەیە منداڵم هەبێت." بینینی حەزەکان وەک ئەرک و پێویستی تەنها دەتکات بە کەسێکی دەم بە بۆڵە و قێزەون لەو ناوە. گرنگیش نییە چەند ڕۆشنبیریت، واتلێدەکات وەک گەمژەیەک مامەڵە بکەیت. تا زووتر بتوانیت ئەو شتانەی لەسەر خۆتت کردوون بە پێویستی لە سنوری تواناکانی خۆتی دەربکەیت، باشترە.

ئێستا با بچینە سەر حەزەکان. ژیانێکی بێ ئامانج ژیانێکی بەفیڕۆچووە. بەڵام نابێت ئەڵقە لەگوێ و کەلەپچەی دەستیشیان بین. ئاگاداری ئەوەبە کە هەموو حەز خولیاکانت بەدی نایەن، چونکە زۆر شت هەن لە دەرەوەی کۆنترۆڵی تۆوەن. تەنها ئەنجوومەنی بەڕێوەبەران نین کە بڕیار دەدەن ئاخۆ تۆ ببیت بە بەڕێوەبەری نوسینگەی جێبەجێکردن یاخود نا، بەڵکو ئەوە پێشبڕکێیە، پشکەکانی بازاڕە، ڕۆژنامە و ڕاگەیاندنە، خێزانەکەتە- هیچیان ناتوانیت بە تەواوەتی کۆنترۆڵیان بکەیت. هەمان شت بۆ نوسینی ڕۆمان و هەبوونی منداڵ ڕاستە. فەیلەسوفە یۆنانییەکان دەربڕینێکی نایابیان بۆ ئەو شتانە هەبوو کە ئێمە دەمانەوێن: پەسەندییەکان سەرنج ڕاناکێشن (سەرنجڕاناکێشن لێرەدا بە واتای بێبایەخ دێت). بۆیە

ڕەنگە من شتێکی پەسەندم هەبێت (من ئۆتۆمۆبێلی -پۆرش-م بەلاوە پەسەندە وەک لە ڤی دەبلیو گۆڵف)، بەڵام لە کۆتاییدا هیچ بایەخێکی بۆ بەختەوەرییەکەی من نییە.

ئێستا دێینە سەر سێیەم بەشی دیاریکردنی نەخۆشییەکەمان: پێشبینییەکان. هەندێک لە ناخۆشترین چرکەساتەکانمان هێواش هێواش دەچێتە خوارەوە بۆ سەر بەڕێوەبردنی پێشبینییەکانمان- بەتایبەتی پێشبینیمان بۆ کەسانی دیکە. ئێمە چەند دەتوانین پشتڕاستی پێشبینییەکانی کەشوهەوا بکەین ڕاست دەردەچن، هەر ئەوەندەش دەتوانیش پشتڕاستی پێشبینی لە کەسانی دیکە بکەینەوە.

پێشبینییەکانمان هێزێکی دەرەکی زۆر بچووک بەجێدەهێڵن، بەڵام هێزێکی گەورەی ناوەکی لە خۆ دەگرن. لەبەر ئەوەی ئێمە لە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا زۆر کەمتەرخەمین، بۆیە ڕێگە بە ئەوانی دیکە دەدەین کاریگەری بەدەستبهێنن. بۆ نموونە ڕیکلامکردن جگە لە بزواندنی پێشبینییەکان هیچ شتێکی دیکە نییە، فرۆشتنیش هەر بە هەمان شێوەیە. کاتێک کارمەندێکی بانک بەرهەمێکی داراییت پێدەفرۆشێت، وێنەیەکی ئاڵۆزی وات لەگەڵیدا بۆ دەخاتە ڕوو کە لە داهاتوودا بە لێشاو پارەت دەستدەکەوێت، ئەوە سووکوسۆڵ بزواندنی پێشبینییە. بابەتەکە تەنها ئەوە نییە کە ئێمە پێشبینییەکانمان لەسەر تڕەکەڵەک بونیاد دەنێین، بەڵکو سەرقاپی مەنهۆڵەکانیشمان بە کراوەیی دەکەینەوە، ڕێگە دەدەین لە چوار دەورەوە کەسانی دیکە بنکۆڵی بکەن. وا مەکە.

کەواتە لە جیاتی ئەوە چۆن پێشبینییە واقیعییەکانت لە خۆ دەگریت؟ هەنگاوی یەکەم: پێش هەموو یەکتربینینێک، جێژوانێک، پرۆژەیەک، ئاهەنگێک، گەشتەپشوویەک، کتێبێک، بەرپرسیارێتییەک هێڵێکی برندەی جیاکەرەوە لە نێوان پێداویستی، حەز، پێشبینیدا بکێشە. هەنگاوی دووەم: ئاستی پێشبینییەکەت لەسەر هێڵێک کە لە (٠) بۆ (١٠)یە، دیاری بکە. ئایا پێشبینی (٠ کارەسات) دەکەیت، یاخود بەدەستهێنانی خەونی ژیانت (١٠)؟ دوو ژمارە لە پێودانگەکەت دابڕە و دواتر مێشکت بە پێی ئەو ژمارانە ڕێکبخە. تەواوی ڕاهێنانەکە ئەوپەڕی دە چرکە دەبات. پێوانی پێشبینییەکانت ئەوە پرۆسە ئۆتۆماتیکییە لێکدەداتەوە کە تۆ لەپڕ و بێ بیرکردنەوە دەریدەپەڕێنیت، هەروەها جۆرێک لە شۆکی دەرونیشت لە کۆڵ دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی ئێستا پێشبینییەکانت هەر وا بە ئاسانی مامناوەند نین، لە ڕاستیدا بەش بەشیش بۆ ژێر بەها لەبارەکەی خۆیان بەهایان دابەزێنراوە. من ڕۆژی جارێک بە خێرایی بەم سێ هەنگاوەدا دەڕۆم- کە دەبنە هۆی دەرەنجامێک بۆ هەستکردن بە باشیم خەڵکی ئێرەییم پێیبەن.

کەواتە دەبێت چی لە هەموو ئەمەوە وەربگریت؟ دەبێت ئەوە وەربگریت کە ئێمە وەک میزڵدانێکی پڕ لە گازی هیلیۆم مامەڵە لەگەڵ پێشبینییەکانماندا دەکەین، لێیاندەگەڕێین بەرزتر و بەرزتر هەڵبگەڕێن تا لە کۆتاییدا دەتەقن و بە پارچەی بچووک بچووکی لوولکراوەوە لە ئاسمانەوە بەر دەبنەوە. واز لە لوولکردنی پێداویستی و ئامانج و پێشبینییەکان پێکەوە بهێنە. بەردەوام بەوردی جیایان بکەرەوە. توانای بەڕێوەبردنی پێشبینییەکانت بەشێکە لە ژیانێکی باش.

٥٠
## یاسایستێرگن

سەختە نوسەری بابەتی خەیاڵی زانستی بیت. بەتایبەتی ئەگەر بۆ بەشێکی زۆری بازار بنوسیت. ڕەخنەگرە ئەدەبییەکان وەک شتێکی پۆخڵ مامەڵەت لەگەڵ دەکەن و بێ چەند و چوونیش زۆربەی زۆری دەرهاویشتەکانی خەیاڵە زانستییەکان لە ڕاستیدا لە ئاستی سێیەمدا پێوانە دەکرێن، کە هەموویان قورستر دەکات بۆ چۆنێتی کارە نوێیەکان تا لەسەر پێوەستانی ئەو ژانرایە لە بازاڕدا بەهێنێتەوە.

تێد ستێرگن یەکێک بوو لە پڕبەرهەمترین نوسەری بواری خەیاڵی زانستی لە ساڵەکانی پەنجا و شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا. لەگەڵ سەرکەوتنەکانیدا ئیرەیی و ڕژدی هات، دەبوو بەرەنگاری هەموو ئەو ڕەخنە دڵرەقانەی ڕەخنەگرەکان ببێتەوە کە ڕایانگەیاندبوو نەوەد لە سەدی هەموو کارەکانی بواری خەیاڵی زانستی قسەی پڕوپوچن. وەڵامی -ستێرگن-یش ئەمەبوو: بەڵێ، ئەوە ڕاستە، بەڵام بێ گوێدانە ژانراکەی سەدا نەوەدی هەموو ئەو

شتانەی بڵاودەکرێنەوە قسەی پڕوپوچن. وەڵامەکەی لە مێژوویدا بە یاسای ستێرگن بڵاوبووەوە.

لە یەکەم خوێندنەوەدا، خەمڵاندنەکەی ستێرگن کەمێک ڕەق دەردەکەوێت، بەڵام تەنها لە یەکەم خوێندنەوەدا. بیر لەو چەند کتێبە کەمە بکەرەوە کە هەموویان تا کۆتایی چێژیان لێوەردەگریت و بیر لە ژمارەی ئەو کتێبانەش بکەرەوە کە تەنها دوای خوێندنەوەی چەند لاپەڕەیەک بە نائومێدییەوە فڕێیدەدەیتە لاوە. یان بیر لە ژمارەی کەمی ئەو فیلمانە بکەرەوە کە تا کۆتایی سەیریان دەکەیت و بیر لەو هەمووەش بکەرەوە کە هێندە نابات کەناڵەکە دەگۆڕیت. ڕەنگە تێکڕاکە لەگەڵ -یاساکەی ستێرگن-دا وەک یەک بێت.

بەگوێرەی دانیاڵ دینێت، یاسای ستێرگن نەک تەنها بۆ کتێب و فیلمەکان دەبێت، بەڵکو "لە سەدا نەوەدی هەموو شتێک قسەی قۆڕە. ئەوە ڕاستە جا کاتێک باسی فیزیا، کیمیا، دەروونناسی پەرەسەندن، کۆمەڵناسی، پزیشکی- هەر بە ناو هێنان ناویان دەنێیت- مۆسیقای ڕۆک، وڵاتە ڕۆژئاواییەکان دەکەیت هەمووی قسەی قۆڕە." جا ئەگەر بە دروستی لە سەدا نەوەد بێت، یان کەمتر سەدا هەشتا و پێنج یان سەدا نەوەد و پێنج بێت ئەمە قسەی لەسەرە، بەڵام شایستەی مشتومڕ نییە و گرنگیش نییە. لە پێناوی سادەییدا، با خۆمان بە سەدا نەوەدەکەوە پەیوەست بکەین.

لەو کاتەوەی بۆ یەکەمجار -یاسای ستێرگن-م بیستووە، بووە بە بوژانەوەیەکی گەورە بۆم. من بەو شێوەیە گۆشبووبووم و باوەڕم وابوو زۆربەی ئەوەی خەڵکی بەرهەمی دەهێنێت گرنگ

و بە بایەخ و جێگەی هەڵوێستە لەسەرکردنە، بۆیە هەمیشە ئەوەم دەخەملاند کاتێک شتێک وا دەردەکەوت بەلامەوە ناتەواو بێت بە دڵنیاییەوە دەبێت هەڵەکە من بم. ئەمڕۆ دەزانم ئەگەر پێموابێت بەرهەمێکی ئۆپێرا سەرکەوتوو نییە، ئەوە بەهۆی کەمی کارامەیی منەوە نییە. ئەگەر پلانێکی بازرگانی کاریگەرییەکی پەرپوتی هەبێت ئەوە بەهۆی لاوازی تێگەیشتنمەوە لە بازرگانی نییە. ئەگەر نەوەد لە سەدی خەڵکی لەئاهەنگێکی نانی ئێوارەدا بێزارم بکەن، ئەوە بەهۆی هەژاری لە میهرەبانی هەستی مرۆڤایەتیمدا نییە. نا ئەوە من نیم، ئەوە دونیایە. شایەنی دوپاتکردنەوەیە: لە سەدا نەوەدی بەرهەمەکان لەنگەن. لە سەدا نەوەدی ڕیکلامەکان تەنها هەراو زەنایەک هیچی دیکە نین. لە سەدا نەوەدی ئیمەیڵەکان تەنها سکچوونی زارەکین. لە سەدا نەوەدی تویتەکانی تۆڕی کۆمەلایەتی تویتەر قسەی حەلەق و مەلەقن. لە سەدا نەوەدی یەکتربینینەکان تەنها کات بەفیڕۆدانن. لەسەدا نەوەدی هەموو ئەو شتانەی لەو یەکتربینانەدا دەگووترێن تەنها هەوای گەرمن. لە سەدا نەوەدی داوەتنامەکان داون بۆ ئەوەی بە باشترین شێوە بەسەرتدا سەربکەون. بە کورتی و بە پوختی لە سەدا نەوەدی هەموو ئەو شتانەی لە دونیای مادده و دونیای ڕۆشنبیریدا دەخرێنە دونیاو قسەی قۆڕن.

باش لە گوێگرتنی –یاساکەی ستێرگن- گەشە بە ژیانت دەدات. ئامێرێکی مێشکی نایابە، چونکە "ڕێگە"ت بۆ خۆش دەکات، بێ هەستکردن بە تاوان باز بەسەر زۆربەی ئەو شتانەی دەیانبینیت، دەیانخوێنیتەوە، دەیانبیستیت بدەیت. دونیا پڕە لە وشەی خاڵی،

بەڵام تۆ پێویست ناکات گوێیان بۆ بگریت.

وەک دەگووترێت، هەوڵمەدە دونیا لەو شتە بێمانایانە پاک بکەیتەوە، چونکە سەرکەوتوو نابیت. دونیا لەو ماوەیەی تۆ دەتوانیت بە ژیری بمێنیتەوە، ئەو دەتوانێت بە بێئەقڵی بمێنێتەوە. کەواتە تەرکیز لەسەر وردبینیت و بژاردەیت بکەرەوە، لە نێوان ئەو بڕەکەمە شتە بەنرخانەی هەن، هەموو شتەکانی دیکەش بخەرە لاوە.

وەبەرهێنەکان چەندین دەیە پێش تێد ستێرگن لەمە تێگەیشتبوون. بێنجامین گراهام لە کتێبە کلاسیکییەکەیدا بە ناوی —وەبەرهێنی ڕۆشنبیر- کە لە ساڵی ١٩٤٩ دا بڵاوی کردبووەوە وەسفی بازاڕی پشکەکان بە کەسێکی بێهۆش و ناژیر دەکات و ناوی دەنێت کاکی بازاڕ. کاکی بازاڕ کە شەریکی بازرگانی -گراهام-ەو، خاوەن کەسایەتییەکی (خەمۆکی دوو جەمسەرە- Manic depressive[٥٥]) هەموو ڕۆژێک هاواری نرخی پشکەکانی دەکرد، پێشنیاری کڕین یاخود فرۆشتنی پشکەکانی دەکرد. هەندێک جار بەوپەڕی دڵخۆشییەوە گەشبین بوو، هەندێک جاریش ڕەشبین و زۆر نیگەران دەبوو. باری دەروونی وەک ئیسپرینگ هەڵبەز و دابەزی دەکرد. هەواڵە خۆشەکە ئەوەیە وەک وەبەرهێنێک پێویست ناکات ئەوەی کاکی بازاڕ دەیخاتە ڕوو قبوڵی بکەیت. دەتوانیت سوکوسۆڵ چاوەڕێ بکەیت و لێبگەڕێیت تا غەڵبەغەڵبی بازاڕەکە بە

---

٥٥- (خەمۆکی دوو جەمسەرە- Manic depressive): نەخۆشییەکی زیهنییە وا لە کەسی توشبوو دەکات لەوپەڕی خەمۆکییەوە لە ناکاودای بگۆڕێت بۆ ئەوپەڕی دڵخۆشی.

لاندا تێدەپەڕێت تا ئەو کاتەی کاکی بازاڕ پێشنیارێکی هێندە باشت بۆ دەکات شتێکی گەمژانە دەبێت گەر ڕەتیبکەیتەوە. ئەگەر ئەو کوالیتی پشکێکت بۆ پێشنیار بکات کە لە نرخێکی زۆر نزمدا بێت- بۆ نموونە لە کاتی هەڵا و غەوغای بازاڕدا. نەوەد لە سەد، تەنانەت نەوەد و نۆ لەسەدی ئەوەی کاکی بازاڕ هاواری بۆ دەکات دەتوانرێت بە سەلامەتی پشتگوێ بخرێت. بەداخەوە زۆربەی وەبەرهێنەکان بازاڕی وەبەرهێنان وەک فرۆشیارێکی دەستگیری نائەقڵانی و خاوەن (خەمۆکی دوو جەمسەرە- Manic depressive) نابینن، بەڵکو وەک ڕەنگدانەوەی واقیع دەیبینن، ئەوان نرخ و بەهاکان تێکەڵ دەکەن- تا پارەکەیان چۆڕبڕ دەبێت هەر خەریکی قەبڵاندنن.

بەدڵنیاییەوە ئەمە تەنها لە بازاڕی ئاڵوگۆڕی پشکەکاندا نابینیت. بازاڕەکانی دیکەش ڕۆژ بە ڕۆژ بەرهەم، فیلم، یاری، شێوازی ژیان، کەلوپەلی نوێ، لێوەشاوەیی کەسی، چالاکی بۆ خۆشی و ڕابواردن، ناوچەی گەشتیاری بۆ پشووەکان، ڕێستۆرانت، پێشبڕکێ، ئەستێرەکانی تەلەفزیۆن، ڤیدیۆ پێکەنینەکانی یوتیوب، بیروڕای سیاسی، هەلی کار، ئامێری کارەبایی دەخەنە ڕوو. هەر وەک چۆن بە لای سێوێکی ڕزیو لە دوکانێکی میوەفرۆشتندا دەڕۆیت، پێویستە بە هەمان چەشن بە لای زۆربەیاندا تێبپەڕیت. نەوەد لە سەدیان شتی پڕوپوچ و ئاستی سێیەم و تەنها شتی زۆر ئاست نزمن. کاتێک هاتوهاواری بازاڕەکە زۆر بەرز دەبێت، تەنها گوێکانت بگرە و لە ڕۆیشتن بەردەوام بە. بازاڕ ڕێنیشاندەرێکی پەیوەست بە کوالێتی و بەهای خەرجییەوە نییە.

ئەمە بە گووتن ئاسانە و کردنی گرانە. هۆکارەکەی، کە بەشێوەیەکی زۆر بەم شێوەیەیە، لە ڕابردووماندایە. وێنای خۆت لە نێوان بکە کە سی هەزار ساڵ باووباپیرانماندا بکە. تۆش تەنها کۆکەرەوە و ڕاوچییەک بوویت لە نێوان کۆمەڵەیەکی بچووک دا کە ڕەنگە بە نزیکەیی پەنجا کەس بووبن. زۆربەی ئەوانەی ڕووبەڕوویان دەبوویتەوە تا ئاستێکی بەرز پەیوەست بوون، ڕووەکەکان یان دەخوران یاخود یان ژەهراوی بوون، ئەو ئاژەڵانەی ڕاوتدەکردن یاخود ڕاودەکران، ئەندامانی خێڵەکەت کە ژیان ڕزگار دەکردن یاخود دەتخستە مەترسییەوە. لەو ڕۆژگارەدا، پێچەوانەی -یاسای ستێرگن- ڕاست بوو، چونکە سەدا نەوەدی شتەکان پەیوەست بوو. ئەو لە سەدا دەیەی بنەخڵتەکەی کە دەمێنێتەوە لە بنەڕەتەوە پێکدێت لەو چیرۆکانەی لە دەوری ئاگردانە دەگێڕدرێنەوە، ئەو وێنەکێشانە خراپەی ئەو ئاژەڵانەن کە لە سەر دیواری ئەشکەوتەکان کێشراون، یان هەندێک جۆری ڕاهێنانی ڕۆحی و چارەسەری دەروونی بوون کە وەک کەسێکی ڕۆشنبیری ناو خێڵەکەت، خۆت لێ بە دوور دەگرت. سەدا نەوەدی شتی پەیوەست بوون، تەنها سەدا دە شتی پڕوپووچ بوون.

ئێمە بەلامانەوە سەختە لە ڕێگەی چاوە توندڕەوەکانی -دان دینێت-ەوە لە دونیا بڕوانین. شەق هەڵدان و خۆڕزگارکردن لە هەموو شتە قەڵب و قۆڕەکان مامەڵەیەکی سروشتی نییە. پشکنەرێکی قەڵب و قۆڕ خۆڕسک نییە. دەبێت بە مەبەست ڕاهێنان بە کەسێک بکەین.

با لێرەدا بێشەرمانە ڕاستگۆ بین: -یاسای ستێرگن- تەنها لە دونیای دەرەوەدا ڕاست نییە، بەڵکو بۆ خۆشمان ڕاستە. من تەنها دەتوانم لە بارەی خۆمەوە قسە بکەم، لە سەدا نەوەدی بیرۆکەکانم بەکارنایەن. سەدا نەوەدی هەستەکانم نادۆزرێنەوە. سەدا نەوەدی حەزەکانم پڕوپوچن. چونکە ئاگاداری ئەوەم، زۆر زیاتر وریای ئەوەم کە کام لە "بەرهەمە ناوەکییەکانم" بە جیددی وەربگرم و کامەیان بە بزەیەکەوە تێبپەڕێنم.

بۆیە هەر شتێکی پڕوپوچ کە پێشکەشت دەکرێت وەری مەگرە. تەسلیمی هەموو پاڵنەرێک مەبە، تەنها لەبەر ئەوەی وا ڕێدەکەوێت هەست دەکەیت حەزت لە کردنی هەیە. هەموو ئامێر و کەلوپەلێک تەنها لەبەر ئەوەی هەیە و لەبەردەستتدایە تاقیمەکەرەوە. بڕێکی زۆر کەم شتی بەنرخ، بە بەها، پۆلێنی یەکەم، بنەڕەتی هەن و جیاجیکردنی -یاساکەی ستێرگن- کات و تووڕەییەکی زۆرت بۆ دەگێڕێتەوە. جیاوازی نێوان بیرۆکە و بیرۆکەی باش، بەرهەم و بەرهەمی باش، وەبەرهێنان و وەبەرهێنانی باش بناسەرەوە. شتی پڕوپوچ لەبەر هۆکارەکەی بناسەرەوە. ئەها، یەک یاسای تر، کە لە ئەزموونی مندا سەلماوە کە بناغەیەکی باشی هەیە: ئەگەر دڵنیانیت کە شتێک پڕوپوچە، ئەوا پڕوپوچە.

٥١

# لە ستایشی خاکیبووندا

# تا کەمتر گرنگبیت، ژیانت باشتر دەبێت.

بۆلیڤارد هاوسمان، ئاڤین فۆک، ڕوی دو د. لانسیرێکس، ئاڤین پاڵ دۆمەر، ڕوی تیۆدیول ڕیبۆت، ئاڤین کلێبەر، بۆلیڤار ڕاسپەیل- هەموو ئەو ناوە گەورانەی لە شەقامی -پارتیزان- دا هەن. بەڵام ئەمڕی کێ دەزانێت ئەو شەقامانە بە ناوی کێوە ناونراون؟ هەولبدە مەزەندەی ئەوە بکەیت ئەو کەسانە کێ بوون؟

هەموو کەسایەتییە دیارەکانی سەردەمەکانی خۆیان بوون، هیچ گومانی تێدا نییە- نەخشەدانەری شارەکان، جەنەڕاڵ و زاناکان بوون. بۆ نموونە داوەتنامەیەکی نانی ئێوار لە لایەن -جۆرج یوگین هاوسمان-ەوە خەڵکانی سەردەمی خۆی خۆشحاڵ کردووە.

ئەی ئەمڕۆ چی؟ ئەمڕۆ تۆ لە باڵەخانەی -گەلەریس لافایەت- دێیتە دەرەوە بێ ئەوەی یەک چرکە بیر بکەیتەوە هەر دوو قۆڵت پڕە لەو شتە نا پێویستانەی کڕیوتن و هەر ئەمبەر و ئەوبەریانە خۆت دەکەیت بە -بولیڤارد هاوسمان-دا. هاوینە

و هەوا وەک شووشەیەکی شل بەسەر درەختەکانی ئەو شەقامە پانوپۆڕەدا دەدرەوشێتەوە، ئاسکریمەکەشت بەسەر تیشێرت و شۆرتە -بەرمۆدا-کەت دا چکە دەکات و بەر دەبێتەوە. پەنجەکانت بەیەکەوە نوساون، وەلێ هەرچەندە خۆشت گەشتیاریت کەچی لە ئاپۆرەی گەشتیاران بێزاریت. بەشێکی زۆری لەبەر گیڤە و فڕکان فڕکانی هاتوچۆیە کە لە کەللەت دەدات، بەسەر بەردە قیرکراوەکانی ئەو نەخشەرێژە شکستانەی شاردا تێدەتەقێنن، کە ناوەکانیان هیچ نین بەلاتەوە. -هاوسمان-کێیە؟ لە مێژە مار و مێرووی مێژوو سڕیویەتییەوە.

ئەگەر بەرواری بەسەرچوونی ئەو کەسایەتییە گرنگانەی وەک هاوسمان، فۆک، ڕاسپایڵ بۆ نەوەیەک یاخود کەمتر یان زیاتر درێژ ببێتەوە، ئەوا ناوە زەبەلاحەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لە ماوەیەکی زۆر کورتتردا لە ناو دەچن و نامێنن. لە سەد ساڵ یاخود ئەوپەڕی دوو سەد ساڵی داهاتوودا بە دەگمەن کەسێک دەبێت، بیڵ گەیتس، یاخود دۆناڵد ترەمپ، یاخود ئەنجێلا مێرکل، بناسێت. بۆ ئەم دووانەشمان- من و تۆی خوێنەری ئازیز- چەند دەیەیەکی کەم دوای ئەوەی دەمرین هیچ کەس لە کاتی خۆی ناگرێت بۆ ئەوەی چرکەیەک بیرمان لێبکاتەوە.

وێنای دوو جۆر کەسی خەیاڵی بکە: أ و ب. جۆری أ ئەو جۆرە کەسانەن کە خاوەنی ڕێزێکی خودی بێسنورن. لە سەرێکی دیکەوە، کەسانی جۆری ب بڕێکی زۆر کەم ڕێزی خودین. کاتێک کەسێک خواردنەکەیان دەدزێت، یان تەنگیان پێهەڵدەچنن لە شوێن و لانەیان

دەریان دەکەن، یان خۆشەویستەکانیان لەگەڵ دۆستەکانیاندا هەڵدێن، کەسانی جۆری ب بەشێوەیەکی سست کاردانەوەیان دەبێت. دەڵێن ئەوە ژیانە، خواردنی زیاتر دەدۆزمەوە، شوێنێکی تر دەدۆزمەوە، دۆستێکی جیاواز پەیدا دەکەم. کەسانی جۆری أ بەشێوەیەکی تەواو جیاواز کاردانەوەیان دەبێت، دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکەن و بەتوندی بەرگری لە کەلوپەلەکانی خۆیان دەکەن. کام جۆرە کەسەیان دەرفەتی زیاترە تا بگات بە نەوەی داهاتوو؟ بەدڵنیاییەوە أ. مەحاڵە بە بێ ئاستێکی دیاریکراو خودپەسەندی بتوانیت بژیت. هەوڵبدە تەنها یەک تاقە ڕۆژ بە بێ بەکارهێنانی "من"یاخود "هی من" بەڕێبکەیت. هەوڵمدا، بەداخەوە شکستم هێنا. بە سوکوسۆڵی بکەینەوە ئێمە لە کەسانی جۆری -أ-ین.

کێشەکە لێرەدا ئەوەیە کە ئەو هەستە لە ڕێزی خودییەی لە باوباپیرانی جۆری -أ-مانەوە بۆمان ماوەتەوە، ئەوەندە هەستیارە کە شتەکانمان بۆ تێک و مەکان دەدات. ئێمە لە بەرامبەر بچووکترین بەربەست کە دێتە ڕێمان وەک فیشەکە شێتە دەردەپەڕین، تەنانەت ئەگەر ئەو شتانە بە بەراورد بە هەڕەشەکانی چاخی بەردین زۆریش بچووکبن- ئێمە بە تەواوی شایستەی ستایشکردن نین، هەوڵەکانی ئێمە بۆ کاریگەری دانان لەسەر کەسانی بەرامبەر وەڵامێکی شایستەی لێناکەوێتەوە، ئێمە داوەتی شتێک ناکرێین. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا وا دەکەوێتەوە کە کەسانی دیکە لەسەر حەق بن: ئێمە ئەوەندە گرنگ نین کە بیری لێدەکەینەوە.

من پێشنیاری ئەوە دەکەم کە لە چاویلکەی سەدەی داهاتووەوە

سەیری گرنگی خۆت بکەیت- لە خاڵێکەوە کە ناوە باشەکەت کەمبووەتەوە بۆ ئاستی ژمارە سفر، گرنگ نییە کە لەوانەیە ئەمڕۆ چەند ناوازە بیت. بەشێکی بنچینەیی لە ژیانێکی باش ئەوە نییە کە پڕ بیت لە خۆت. لە ڕاستیدا، هاوپەیوەندییەکی پێچەوانە هەیە: تا کەمتر پێداگری لە خۆپەرستییەکەت بکەیت، ژیانت باشتر دەبێت. بۆ؟ لەبەر سێ هۆکار.

یەکەم: خود گرنگی پێویستی بە وزە هەیە. ئەگەر بەشێوەیەکی باڵا و بەرز بیر لە خۆت دەکەیتەوە، ئەوا تۆ پێویستە هۆکارێکی بڵاوکردنەوە و ڕادارێک لە هەمان کاتدا بخەیتە گەڕ. لە سەرێکەوە، تۆ وێنەی خودی خۆت بۆ دونیای دەرەوە پەخش دەکەیت. لە سەرێکی دیکەوە، تۆ بەشێوەیەکی هەمیشەیی کاردانەوەی ژینگەکەت تۆمار دەکەیت. ئەوا خۆت لە کۆڵ ئەو ماندووبوونە دەکەیتەوە. ڕادار و گەیەنەرەکەت بکوژێنەرەوە و تەرکیز بخەرە سەر کارکردنەکەت. بە دەربڕینێکی بێ گرێ و گۆڵ، ئەمە واتا لە خۆبایی مەبە، بۆ خۆ هەڵفشاندن ناوی قەبە قەبە مەهێنە، لە بارەی سەرکەوتنە مەزنەکانتەوە سنگ دەرمەپەڕێنە. من لام گرنگ نییە کە ئەگەر هەر ئێستا چاوپێکەوتنێکی تایبەتیت لەگەڵ پاپا دا هەبووبێت- دڵخۆش بە بەوە، بەڵام وێنەکانتان بە دیواری باڵاخانەکەتدا هەڵمەواسە. ئەگەر ملیۆنێریت، پارە مەبەخشە بۆ ئەوەی بتوانیت باڵەخانە، پێگەیەکی زانکۆ، یاریگایەکی تۆ بە ناوی تۆوە ناوبنرێت. ئەمە کاریگەری هەیە. کاتێک خۆت زیندوویت، بۆچی ڕیکلامی تەلەفزیۆنی نەکەیت بۆ ئەوەی هەرا بنێیتەوە لە بارەی ئەوەی چەند نایابیت؟ لانیکەم

هاوسمان و هاوڕێکانی ناولێنانی شەقامەکانیان بە ناوی ئەوەوە بە بەلاش چنگ کەوت.

دووەم: تا زیاتر خۆت بە گرنگ بزانیت، زیاتر دەکەویت بە لایەنی خۆ خزمەتکردندا. دەست بە کردنی هەندێک شت دەکەیت نەک تەنها بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی دیاریکراو، بەڵکو بۆ ئەوەی وا لە خۆت بکەیت باش دەربکەویت. زۆرجار لایەنی خۆ خزمەتکردن لە نێو وەبەرهێنەکاندا دەبینیت. پشک لە هۆتێلە نایاب و کۆمپانیا تەکنەلۆجییە سەرنجڕاکێشەکان دەکڕن- نەک لەبەر ئەوەی ئەوە وەبەرهێنانێکی پتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی دەیانەوێت وێنەی خۆیان زیاتر تۆخ بکەنەوە. لە بەشی سەری سەرەوەی ئەمەدا، ئەو کەسانەی بەشێوەیەکی باڵا بیر لە خۆیان دەکەنەوە مەیلی ئەوەیان هەیە بە شێوەیەکی بەرنامەڕێژ زیادەڕەوی لە خەملاندنی توانا و زانیارییەکانی خۆیاندا بکەن (ئەمە کراوە بە زاراوەی متمانە بەخۆبوونی زیاد)، کە دەتگەیەنێت بە هەڵەی کوشندە لە بڕیارداندا.

سێیەم: دوژمن بۆ خۆت پەیدا دەکەیت. ئەگەر بەهۆی گرنگیتەوە فشار لە خۆت بکەیت، ئەوا لە وێرانکردن و زیانگەیاندن بە کەسانی دیکەشدا هەمان کار دەکەیت. چونکە ئەگەر وا نەبێت پێگەی پەیوەستی خۆت بێبەها دەکەیت. هەر ئەوەندەی یەک جار سەرکەوتوو بوویت -ئەگەر پێشتر سەرکەوتوو نەبوبێت- خەڵکانی دیکەش کە بە هەمان ئاستی تۆ تەژین لە خۆیان هەر زوو لێت پەست دەبن. ئەوە ژیانێکی باش نییە.

هەر وەک دەیبینیت، خودپەرستییەکەت لە هاوڕێ زیاتر

دوژمنته. بەدڵنیاییەوە ئەمە بەدەگمەن جێگای سەرنجە. لە ڕاستیدا ئەمە بۆ ماوەی ٢٥٠٠ ساڵ لەمەوپێشەوە تێڕوانینێکی شکستخواردووە. بۆ نموونە -ستۆیکس-ەکان، هەمیشە لە بارەی لوتبەرزی ڕێزی خودییانەوە وریای خۆیان بوون. نموونەیەکی کلاسیکی کە -مارکۆس ئۆریلییەس-ە، کە بۆی دەرکەوت بوون بە ئیمپراتوری ڕۆما شتێکی ناخۆشە. لە ڕێگەی بەردەوام نوسینی یاداشتنامەیەکەوە (خەڵوەتەکانی) زۆری لە خۆی کرد بۆ ئەوەی بە خاکییەتی بمێنێتەوە، کاتێک بەهێزترین کەسی سەر ڕووی زەویت ئەمە هیچ هونەرێکی تێدا نییە. هەروەها ئایینیش ئامێرێکی ڕۆشنبیری دابینکردووە بۆ ئەوەی زوو زوو خودپەسەندییەکەت بپشکنیت: لە زۆربەی ئایینەکاندا، ڕێزی خودی لە ڕاستیدا وەک خۆنومایانکردنی شەیتان سەیر دەکرێت. سەرەڕای ئەوەی لە ماوەی دوو سەد ساڵ زیاتری ڕابردووماندا کلتوری ئێمە چەند ڕێگرێکی لەبەردەم خودپەسەندیدا خستۆتە ڕوو، کەچی ئەمڕۆ هەمووان وا دەردەکەون وەک ئەوەی بەڕێوەبەری کۆمپانیا بچووکەکەی خۆیان بن.

بیر لەمە بکەرەوە: هەر یەکێک لە ئێمە لەنێوان ملیاران کەس دا یەک تاقە کەسین. ئێمە هەمووومان لەناو مەدایەک کاتی زیوینی زۆر بچووکدا دەژین کە دەستپێک و کۆتاییەکی لە گۆترەی هەیە. ئێمەش هەموومان (بە نوسەریشەوە) پێشتر چەندین شتی گەمژانەمان لە خولە بچووک و کورتەی زەمەن خنیوە. کەواتە خۆشحاڵ بە کە هیچ شەقامێک بە ناوی تووە ناونەنراوە- تەنها دەبێتە هۆی فشار دروستکردن بۆت. خاکییانە بمێنەرەوە. بە چەندین شێوازی نایاب

برەو بە ژیانت دەدەیت. ڕێز لە خۆگرتن یاخود ڕێزی خودی شتێکی ئاسانە و هەموو کەسێک دەتوانێت هەیبێت، لە سەرێکی ترەوە، خاکیبوون شتێکی ڕەنگە سەخت بێت، بەڵام لانیکەم لەگەڵ واقیعدا گونجاوترە. شەپۆلەکانی دەریای سۆزداریشت هێور دەکەنەوە.

خودگرنگی گەشەی کردووە و بووە بە جۆرێک نەخۆشی لە شارستانییەتەکاندا. چۆن سەگێک ددانی لە پێڵاوێکی کۆن گیر کردووە، ئێمەش بەو شێوەیە ددانمان لە خودپەسەندیمان گیر کردووە. پێڵاوەکە بەر بدە با بڕوات. هیچ بەهایەکی خۆراکی نییە و هەر زوو بۆگەن دەکات.

٥٢

## سەرکەوتنی ناوەکی
## ناواخنت لە ڕووکاری دەرەوەت گرنگترە.

هەر وڵاتێک شێوازێکی خۆی لەو لیستەدا هەیە. لە سویسرا پێیدەگووترێت (لیستی ٣٠٠ی بیلانز) و ٣٠٠ دەوڵەمەندترین کەسانی سویسرا دەناسێنێت. لە ئەڵمانیا، مەنەیجەر مەگەزین ساڵانە لیستی ٥٠٠ ساماندارترین کەسانی ئەڵمانیا بڵاودەکاتەوە. -سەندەی تایمز- لیستی دەوڵەمەندانی بەریتانیا ڕادەگەیەنێت، -چالێنجس- یش، لە فەڕەنسا شتێکی هاوشێوە ڕادەگەیەنێت. فۆربێس هەموو ساڵێک لیستێک بۆ هەموو ملیاردێرەکانی دونیا پێکەوە دەنێت. ئەو کاریگەری و سەرنجڕاکێشانەی ئەوان دەیانەوێت بیگەیەنن ئەوەیە: ئەمانە سەرکەوتووترین کەسانی دونیان، هەموویان کەسانی بازرگانین (یاخود ئەوانەن بەکرێیان دەگرن).

هەمان پلەبەندی بۆ بەهێزترین بەڕێوەبەری نوسینگەی جیبەجیکردن، ئەو دامەزراوە ئەکادیمییەی لە زۆرترین سەرچاوەدا ناوی هاتووە، پڕخوێنەرترین نوسەر، ئەو هونەرمەندەی خاوەنی

بەرزترین ئاستی موچەیە، سەرکەوتووترین مۆسیقاژەن، گرانترین ئەستێرەی وەرزشی، هەروەها ئەو ئەکتەرەی بەرزترین ڕێژەی پارە پەیدا دەکات بوونی هەیە. هەموو پیشەسازییەک شێوازی خۆی هەیە. ئەی کەواتە ئەم چیرۆکانە لە ڕاستیدا چەند سەرکەوتوون؟ ئەوە بەڕادەیەکی زۆر پشت دەبەستێت بەوەی کە تۆ چۆن پێناسەی سەرکەوتن دەکەیت.

کۆمەڵگا دەتوانێت ئەو ڕێگایە کۆنترۆڵ بکات کە تاکەکان لە ڕێگەیەوە کاتەکانی خۆیانی تێدا بەسەر دەبەن، ئەوە سەرکەوتن و شکۆ بەخشین دەپێوێت. پرۆفیسۆرێکی بواری دەروونناسی ئەمریکی کە ناوی –ڕۆی باومیستەر–ە، دەنوسێت" ئەمە هیچ ڕێکەوت نییە کە لە کۆمەڵگا بچووکەکاندا هەوڵ بۆ مانەوە و شکۆ لەگەڵ هێنانی بڕێکی زۆر پڕۆتین (ڕاوکردن) دا دێت، یاخود بەزاندنی مەترسیدارترین دوژمنەکان کە ئەویش (شەڕکردنە). هەر لەبەر هەمان هۆکار، شکۆی دایکایەتی ڕەنگە بە گوێرەی پێداویستی کۆمەڵگا بۆ زیادبوونی دانیشتووان بەرز و نزم ببێتەوە، شکۆی ڕابواردن و کەیفخۆشیش بە گوێرەی ئەو کات و پارەیەی دانیشتوان دەتوانن بۆ چالاکییە خۆشییەکانیان بەکاری بهێنن بەرز و نزم دەکات." کۆمەڵگا مۆدێرنەکان لیستەکانی -فێربێس-، (کە لە ئێستا بەدواوە بەشێوەیەکی کۆکراوە ئەم لیستە پلەبەندانە بەم ناوەوە ناو دەنێم) وەک ئاڵای درەوشاوە ڕادەوەشێنن و دەڵێن: ئەمە ڕێگاکەیە!

بۆچی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان هەوڵدەدەن ژیانیان بەرەو سەرکەوتنی ماددی ئاراستە بکەن نەوەک بەرەو سەرکەوتنی کاتێکی

خۆش ڕابواردنی زیادە؟ بۆچی لیستی دەوڵەمەندترینەکان هەیە، بەلام لیستی ئاسوودەترینەکان نییە؟ زۆر بە سانایی لەبەر ئەوەی گەشەی ئابووری بەردەوام کۆمەڵگاکان پێکەوە دەبەستێتەوە. پێش ئەوەی هێنری والیک بەرپرسی پێشووی بەشی ئابووری لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڵێت" بۆ ماوەیەکی درێژ چەند گەشەکردن هەبێت ئەوەندەش هیوا هەیە، ئەمەش دەبێت هۆی لێخۆشبوونیکی گەورە لە جیاوازی ئاستی داهاتدا." بانکەوانی پێشوو ساتیات داس دەنوسێت" تێڕوانینی پەرەپێدان لە بواری ستانداردەکانی ژیاندا، هەرچەندە دوورە، بەلام فشارەکانی دووبارە دابەشکردنەوەی سامان سنوردار دەکات."

ئەگەر لیستەکانی -فۆربێس-مان ناوێت، بۆ ئەوەی شێتمان نەکەن، دوو شت هەن دەبێت لێیان تێبگەین. یەکەم، پێناسەکانی سەرکەوتن بەرهەمی سەردەمەکانی خۆیانن. هەزار ساڵ لەمەو پێش لیستەکانی -فۆربێس- وێنانەکراون، هەزار ساڵی داهاتووش بە هەمان یەکسانی هەر بە هەمان شێوە دەبێت. وارن بەفێت کە بە هاوشانی بیل گەیتس بۆ ماوەی چەندین ساڵ بەشی سەرەوەی ئەو لیستەی گرتبوو، دان بەوەدا دەنێت کە نەیدەتوانی ئەو هەمان شت لە سەردەمی چاخی بەردیندا بکات"من ئەگەر هەزار ساڵ بەر لە ئێستا لەدایکبوومایە، ئەوا دەبووم بە ژەمی ئاژەڵێک، چونکە من ناتوانم خێرا ڕابکەم و بەسەر درەختەکاندا هەڵبگەڕێم." بە گوێرەی ئەو سەدەیەی تێیدا لەدایکبوویت، کۆمەڵگا هەندێک جۆر سەرکەوتنت بۆ ستایش دەکات- بەلام هەمیشە ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دەدەن تا

قەناعەتت بەو پێناسە دیاریکراوەی خۆیان پێبکەن. هەر کوێرانە دوای ئالاکان مەکەوە. بە هەر شوێنێکت بگەیەنن، بە دڵنیاییەوە ژیانێکی باش نادۆزیتەوە.

سەرکەوتنی ماددیش سەد دەر سەد پەیوەندی بە بەختەوە هەیە. ئێمە وەک ڕوونکردنەوە و خولیامان بە بەختەوە نەگرتووە، بەڵکو ئەوە تەنها حەقیقەتێکە. جینەکانت، کۆدە جێگە و ناونیشانت، ڕۆشنبیریت، هێزی ئیرادەت- لە بنەڕەتدا ئەمان شتانێکن ناتوانیت هیچ شتێکیان لە بارەوە بکەیت، هەر وەک لە بەشی ٧ دا بینیمان. بە ڕوون و ئاشکرا دیارە کە بازرگانە سەرکەوتووەکان زۆر خۆیان ماندوو کردووە و بڕیاری زیرەکانەیان داوە. کەچی خودی ئەم هۆکارانە خۆیان دەرەنجامی جین، ڕەچەڵەک و دەرفەتە ژینگەییەکەیانن. هەر لەبەر ئەمەیە دەبێت لیستەکانی –فۆربێس- لە بنەڕەتەوە بە شتێکی گۆترەیی سەیر بکەیت و لە بە نموونەی باڵا سەیرکردنیان دەست هەڵبگریت.

لەم دواییانەدا هاوڕێیەکم بە شانازییەوە ئەوەی پێڕاگەیاندم کە بانگهێشتی ژەمێک نانخواردن لەگەڵ فلان و فیسار ملیۆنێر کراوە. منیش شانێکم هەڵتەکاند. بۆچی دەبێت شانازی بکەین؟ بۆچی هێندە بە پەرۆش بین بۆ بینینی ملیۆنێرێک؟ ئەگەری ئەوەی بڕێک پارەی بداتێ سفرە. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە گفتوگۆی نێوان ئەم دوو کەسە سەرنجڕاکێشە یاخود نا- ئەگینا سامانەکەی هیچ پەیوەست نییە بە بابەتەکەوە.

بهێڵە پێناسەیەکی تەواو جیاوازی سەرکەوتنت بۆ بکەم، پێناسەیەک کە لانیکەم دوو هەزار ساڵ تەمەنییەتی. بە گوێرەی ئەم پێناسەیە

سەرکەوتن نە پەیوەستە بەوەی کۆمەڵگا چۆن شکۆ دەبەخشێتەوە نە چەند لەگەڵ پلەبەندی چەپەڵەکاندا دەتگونجێنێت. سەرکەوتن ئەمەیە: سەرکەوتنی ڕاستەقینە سەرکەوتنی ناوەکییە. ڤۆلیا

ئەمە هیچ پەیوەندی بە خۆ ئالوودەکردن بە بغورد و بە تەنیا دانیشتن بیرکردنەوە و یۆگاوە نییە. هەوڵدان لە پێناو سەرکەوتنی ناوەکیدا یەکێکە لە هەستیارترین پەیڕەوەکانە و یەکێکە لە بنەڕەتەکانی فکری ڕۆژئاوا. هەر وەک لە بەشی ٨ دا بینیمان، فەیلەسوفە یۆنانی و ڕۆمانییەکان بەم جۆرە لە سەرکەوتنیان دەگووت ئەتاراکسیا. هەر ئەوەندەی - ئەتاراکسیا واتە ئارامی ڕۆح -ت، بەدەستهێنا ئەوا سەرەڕای تیر و مەنجەنیقەکانی چارەنووس دەتوانیت درێژە بە هێمنی و ئارامی خۆت بدەیت. با بەشێوەیەکی دیکە دەربببڕین، بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بیت بێ گوێدان بەوەی لە کەشکەشانی فەلەکدا دەفڕیت یاخود لەسەر زەوی چنگەکڕێتە دەبێت بەسەبر بیت.

چۆن دەتوانین سەرکەوتنی ناوەکی بەدەستبهێنین؟ بە تەرکیز خستنە سەر بە تایبەت ئەو شتانەی دەتوانین کۆنترۆڵمان بەسەریاندا هەبێت و بەشێوەیەکی یەکلاییکەرەوەش هەموو شتەکانی دیکە لە خۆمان دوور بخەینەوە. لە ناوەوە، نەک لە دەرەوە. دەتوانین کۆنترۆڵی ناوەوەمان بکەین، بەڵام دەرەوەمان نا، چونکە بەخت بەردەوام کەوچکی خۆی تێوەردەدات.

پارە، دەسەلات، ناوبانگ، شتگەلێکن ئێمە کۆنترۆڵێکی سنوردارمان بەسەریانەوە هەیە. ئەگەر سەرنجت لەسەر ئەوانە بێت ئەوا بە لە دەستدانیان دونیات لە لا ژێراوژوور دەبێت. ئەگەر ڕاهێنانت لەگەڵ

خۆتدا کردبێت بۆ ئەوەی هێمن، بەسەبر -ئاتاراکسی واتە خاوەن ئارامی ڕۆحی-بیت، ئەوا بەڕادەیەکی زۆر دڵخۆش دەبیت، گرنگیش نییە چارەنوس چی فڕێدەداتە سەر ڕێت. با بێ گرێ و گۆڵ بڵێین سەرکەوتنی ناوەکی جێگیرترە وەک لە سەرکەوتنی دەرەکی.

جۆن ودن سەرکەوتووترین ڕاهێنەری یاری باسکە بوو لە مێژووی ئەمریکادا. ودن پێداگری لەوە دەکرد یاریزانەکانی بەشێوەیەک پێناسەی سەرکەوتن دەکەن کە تەواو پێناسەیەکی جیاوازە" سەرکەوتن ئارامی زیهنە، کە دەرەنجامێکی ڕاستەوخۆی لە خۆڕازیبوونە لە زانینی ئەمەدا تۆ ئەوپەڕی هەوڵی خۆتت دا بۆ ئەوەی ببیت بە باشترینی ئەوەی توانات هەیە ببیت." بەم دەربڕینە سەرکەوتن بە مانای بەدەستهێنانی نازناو و کۆکردنەوەی مەدالیا و گەیاندنت بە بڕێکی زۆر پارەی کۆکراوە نایات. ئەمە هەڵوێستێکە. بەشێوەیەکی تەوسەوە، سەرۆک جۆرج دەبلیو بۆش خەڵاتی مەدالیای ئازادی پێبەخشی، کە پڕشکۆترین خەڵاتە- کە بۆش زیاتر هاندان و پاڵنانی وەک لە جۆن ودن لەم خەڵاتە دەبینییەوە.

با ڕاستگۆ بین: هیچ کەسێک سەد لە سەد ملی خۆی بۆ سەرکەوتنی ناوەکی ناشکێنێت و هیچ گرنگییەکیش بەوە نەدات کە لە دونیای دەرەوەدا هەیە. کەچی لە ڕێگەی ڕاهێنانە ڕۆژانەکانمانەوە دەتوانین خۆمان لە لێواری -ئەتاراکسا- نزیکتر بکەینەوە. هەموو شەوێک، خشتەیەک بهێنە: ئەمڕۆ کەی شکستت هێنا؟ کەی ڕێگەت دا ڕۆژەکەت بە هەستی ژەهراوی ژەهراوی ببێت؟ ڕێگەت بە کام لەو شتانەی لە دەرەوەی کۆنترۆڵی خۆتن دا بێزارت بکەن؟ کام کەرەستەی زیهنیش

بۆ بەرەوپێشبردنی خود گرنگە؟ پێویست ناکات لە مەراسیمەکەدا دەوڵەمەندترین کەس بیت- لە جیاتی ئەوە لە ئاستی ناوەوەتدا لێرە و لە ئێستادا سەرکەوتووترین کەس بە. ئەوەی جۆن ودن لە مێشکی یاریزانەکانی خزاندبوو" هەموو ڕۆژێک بکە بە باشترین ڕۆژت." ئامۆژگارییەکەی وەربگرە. سەرکەوتنی ناوەکی هەرگیز بە تەواوەتی بەدەستنایات، دەبێت بە درێژایی ژیانت ڕاهێنانی لەسەر بکەیت. هیچ کەسێک بە نیاز نییە ئەوەت بۆ بخاتە کار.

هەموو ئەوانەی بە دوای سەرکەوتنی دەرەکیدا وێڵن- سامان، بوون بە بەڕێوەبەری نوسینگەی جێبەجێکردن، بردنەوەی مەدالیای زێڕ، شەرەف- لە ڕاستیدا ئەوانیش پەلەقاژەی ئەوەیانە سەرکەوتنی ناوەکی بەدەستبهێنن، بەڵام تەنها ئەوەیە کە درکی پێناکەن. ڕەنگە بەڕێوەبەرێکی نوسینگەی جێبەجێکردن ٢٠٠,٠٠٠ یۆرۆکەی بۆ کڕینی کاتژمێرێکی (Complication IWC Grande) تەرخان بکات، ڕەنگە لەبەر ئەوەی حەزی لەوەیە کە لەسەر مەچەکی جوان دەردەکەوێت، بەڵام ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە ئیرەیی پێببەن. هەر کامیان بێت، ئەو کاتژمێرە (IWC Grande Complication)ەی، دەوێت چونکە هەستێکی باشی پێدەبەخشێت. ئەگینا نایکڕێت.

تۆ لە هەر ڕوانگەیەکیانەوە سەیری بکەیت، ڕاستییەکە ئەوەیە کە خەڵکی ئارەزووی بەدەستهێنانی دەرەکی دەکەن، چونکە دەستکەوتە ناوەکییەکانیان دەپارێزێن. ئەو پرسیارەی خۆی پێشنیار دەکات و ڕوونە: بۆچی ڕێگایەکی دوور و درێژ بگرینە بەر؟ تەنها ڕێگا ڕاستەوخۆکە بگرە.

هەر لە سەردەمی کۆنەوە- بە دەربڕینێکی تر، لانیکەم ٢٥٠٠ ساڵ، بەڵام لەوانەیە زیاتریش بێت- خەڵکی لە خۆیان پرسیوە کە ژیانێکی باش، ژیان واتای چی، دەبێت چۆن بژیم؟ چ شتێک ژیانێکی باش دروست دەکات؟ ڕۆڵی چارەنووس چییە؟ ڕۆڵی پارە چییە؟ ئایا بەڕێوەبردنی ژیانێکی باش پرسیاری بیروباوەڕە، یان دەستکردنە بە هەڵوێستێکی نوێ، یان سەبارەت بە گەیشتنە بە چەند ئامانجێکی چەسپاو لە ژیاندا؟ ئایا وا باشترە چوست و چالاکانە بە دوای بەختەوەریدا بگەڕێین یان خۆمان لە بەدبەختی بپارێزین؟

هەر نەوەیەک ئەم پرسیارانە بە فۆڕمێکی نوێ دەکات، بە جۆرێک لە جۆرەکانیش هەمیشە وەڵامەکان بەشێوەیەکی بنچینەیی نائومێدکەرن. بۆچی؟ چونکە ئێمە بەردەوام بۆ یەک پرەنسیپ، یەک باوەڕ، یەک یاسا دەگەڕێین. کەچی هێشتا ئەم قاپە پیرۆزەی ژیانێکی باش بوونی نییە.

GOLDEN BOOK